


ڤلادیمیر نابۆکۆڤ

توانا حەمەنووری کردوویە بە کوردی




لە زنجیرە بلاوکراوەکانی

ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بلاوکردنەوە

زنجیرەی کتێب **٢٢**


# لۆلیتا

ڕۆمان

ڤلادیمێر نابۆکۆڤ

**توانا حەمەنووری** کردوویە بە کوردی


- بەرگ: ناوەندی غەزەلنووس
- چاپ: یەکەم- ٢٠١٤
- چاپخانە: تاران
- نرخ: ٦٠٠٠ دینار
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- بلاوکار: ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بلاوکردنەوە


**سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە:**

روایة لولیتا

فلادیمیر نابوکوف

ترجمة الى العربیة: خلیل حنا تدرس


لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ٢٢٤٤ی ساڵی ٢٠١٣ی پێ دراوە.

# ١

**لۆلیتا...** ڕووناکاییی ژینم، ئاگری سینەم، تاوانەکەم، ڕۆحەکەم! ئاگرێک لە خوێنمدا هەڵگیرساوە، ڕۆحم لەگەڵ ناوەکەتدا سەما دەکات: «لۆ... لی... تا.» نووکی زمانم لە گەشتی زارمدا کە بە ڕێ دەکەوێت، سێ هەنگاو دەنێت و سێ جاران بەر ددانەکانی سەرەوەم دەکەوێت: لۆ... لی... تا.

لە بەیانیاندا بەو جەستە لاوازەیەوە، کە لەسەر جێیەکەی دادەپەڕێت و ڕادەوەستێت «لۆلۆ»یە. بە کراسە کورتەکەیەوە «لۆلا»یە. لە خوێندنگە «دۆلی»یە. لە تۆماری باری کەسێتی «دۆلۆریس»ە، بەڵام ئەو کاتانەی لە نێوان باسکەکانمدایە، تەنیا «**لۆلیتا**»یە.

ئایا لە ئەزەلەوە نەفرەت لەسەر **لۆلیتای** دوازدەبەهار نووسراوە؟

لە ڕاستیدا بە نەفرەتکراوی لە دایک بووە. **لۆلیتا** بۆ ئەوە خولق نەکراوە بێتە ژیانەوە ئەگەر لە ئێوارانێکدا من خۆشم نەوێت، ئێوارانێک لە ویژدانی ئەزەل، پەرییەکی ڕەسەن، لە میرنشینێکی سەر کەناری زەریایەکی ئەفسووناویی غەریب.

بەڵام ئەوە لە کوێ بوو؟ لە کاتێکدا بوو بەر لەوەی **لۆلیتا** لە دایک بێت، لەو هاوینەدا بوو، بە ساڵ لەگەڵ تەمەنی مندا یەکسان بوو.

خوێنەر لەوانەیە سەری ڕابوەشێنێت و بە درۆزنم بزانێت و بڵێت شێوازی خەیاڵی لە خەسڵەتی تاوانباران و پیاوکوژانە. **جەنابی**

دادوەران! ئەم دانپێدانانەم کە ئاراستەتانی دەکەم، بۆ ئەوە نییە لەسەر بنەماکانی دادگەییم بکەن، بەڵکوو بۆ ئەوەیە پێش هەموو شتێک یارییەکانی قەدەر بخەمە روو، کە لەگەڵ مندا کردوونی. لەم رووەوە لە چیرۆکەکەم بروانن.

## ٢

لە ساڵی ١٩١٠دا لە پاریس لە دایک بووم، منداڵیک بووم خوێنی چەند نەتەوەیەک لە دەمارەکانمدا ڕێی دەکرد. باوکم بەش بە حاڵی خۆی باری دارایی باش بوو، خاوەن هۆتێلێکی گەورە بوو لە ڕیڤێرا، بە ڕەگەز سویسری بوو، لە باوکێکی فەرەنسی و دایکێکی نەمسایی.
بەڵام دایکم ئینگلیز بوو، بە هۆی هەورەتریشقەیەکەوە لە تەمەنی سێساڵیمدا گیانی لە دەست دا. هیچ شتێکی ئەوتۆی دایکم بیر نایەت، جگە لە بیری ویژدان و گەرمی و سۆز، کە هێندێک جار نوقمی دەکردم.
ئەوەی جێی دایکمی گرتەوە، وەکوو سەرپەرشتیارێکی ناوماڵی بێکری بوو، سیبیل، خوشکە گەورەکەی دایکم بوو، هاوسەری ئامۆزایەکی باوکیشم بوو و دواتر فەرامۆشی کردبوو. ڕۆژێکیان کەسێک ئەوەی بۆ باس کردم، کە باوکمی خۆش دەویست، باوکیشم ئەو هەلەی قۆستەوە و لە ڕۆژێکی بارانایویدا کاتێکی خۆشی لەگەڵ بردە سەر و دواتر لە بیری کرد.
لە ڕاستیدا دایکە تازەکەمم خۆش ویست، هەرچەندە هەندێک پێگەی قورسی بۆ ژیانی خۆی و ژیانی منیش دانابوو، پێ دەچێت بۆ ئەوە بێت لە کەسێکی بێکەسەوە بمگەڕێنێتەوە بۆ ژیان.

پوورم دوو چاوی شین و ڕووخسارێکی زەردهەڵگەڕاوی وەکوو ڕەنگی ئاگری مۆمی هەبوو، هەمیشە قژەکەی دەبڕی، خاوەن مەزاجێکی شاعیرانەی ڕەشبین بوو، بەردەوام دەیگوت لە دوای تەمەنی شازدەساڵیمەوە گیان لە دەست دەدات.
لە دوای شازدەیەمین ساڵوەگەڕی لەدایکبوونمەوە ئەویش گیانی لە دەست دا، هاوسەرەکەیشی زۆربەی کاتەکانی لە **ئەمەریکا** بەسەر برد و کۆمپانیایەکی بۆنی دامەزراند و لە ڕێی داهاتەکەیەوە کۆمەڵێک زەویوزاری کڕین.
من وەکوو منداڵێک، تەندروست و بەختەوەر، لە جیهانێکی ڕووناک لە کتێب و وێنە و کەنارزەریای پاک و باخچەی لیمۆ و سەگی ماڵی و ڕووخساری دەمبەبزە بە خێو کرام.
جیهانی من لەنێو هۆتێلی **میرانا** بوو. گەشتیارە پیرە ئەمەریکییەکان وەکوو بوونەوەرێکی نامۆ سەیریان دەکردم.
لە ڕاستیدا لە لایەن هەموانەوە من منداڵێکی بەناز بووم، بۆ نموونە شازادەی ڕووسیای مایەپووچ شیرینیی گرانبەهای بۆ دەکڕیم، کەچی خۆی نەیدەتوانی پارەکەی باوکم بداتەوە.
باوکیشم، باوکی ئازیز و بچووکم، هەمیشە بۆ گەشتی زەریایی بە یەخت دەیبردم و لاپەڕەکانی **دۆن کیشۆت** و **بینەوایان**ی بۆ دەخوێندمەوە، زۆرم خۆش دەویست و زۆر چاک ڕێزم لێی دەگرت.
هەستم بە شادی دەکرد، کە گوێم لە کارگوزارەکانی هۆتێلەکە دەبوو، باسی چیرۆکی عاشقانەی هاوڕێیەکانی باوکمیان دەکرد، زۆربەیان کچی جوان بوون... هەمیشە بە خۆشەویستی و عاتیفەوە لێیان دەڕوانیم و فرمێسکیان بۆ بێدایکیم دەڕشت.

لە خوێندنیشدا سەرکەوتوو بووم، دەمتوانی سرنجی هاوڕێ و مامۆستاکانم بە خۆشەویستی ڕابکێشم، لە تەمەنی پێش سێزدەساڵیمدا و بەر لە بینینی **ئەنابێل** هیچ ئەزموونێکی سێکسیی ڕوونم بە بیردا نایەت، جگە لە هێندێک گفتوگۆی جددی لەگەڵ هاوڕێیەکی ئەمەریکیم، کە باسی لە سەرەڕۆیی خۆشەویستی دەکرد لەنێو باخچەی گوڵەکاندا، یاخود کە تەماشای وێنەی ڕووتم دەکرد، هەستم بە هێندێک وروژانی سێکسیی ئەندامەکانم دەکرد.
باوکم جارێکیان بە زمانێکی خۆش و بە چێژەوە باسی سێکسی بۆ کردم، هێندەی بەشی تەمەنی هەرزەکاریی دەکردم، ئەوەیش لەو سەردەمەدا بوو، کە هێشتا ڕەوانەی کۆلێژی ناوەندیی **لیۆن**ی نەکردبووم.
بە داخەوە، لە هاوینی ئەو ساڵەدا لەگەڵ خانمێکی قەشەنگ و کچەکەیدا، گەشتی بەرەو **ئیتاڵیا** کرد و بە تەنیا بەجێی هێشتم، کەسی بۆ نەهێشتمەوە سکاڵای لا بکەم، یاخود پرسی پێ بکەم.

## ٣

**ئەنابێل**یش هاوشێوەی من لە چەند خوێنێکی تێکەڵ بوو، لە باوکێکی ئینگلیز و دایکێکی هۆڵەندی، هەرچەندە ئێستا ڕووخساریم بەو ڕوونییە- وەکوو ئەو ڕوونییەی بەر لە ناسینی **لۆلیتا**- نایەتەوە یاد. خۆی لە خۆیدا دوو جۆر هزری بینراو هەیە، لە ڕێیانەوە دەتوانیت بە چاوی کراوەوە وەکوو بوونەوەرێک ببینیت، وەکوو ئەو کاتەی لە هزری خۆمدا سەیری **ئەنابێل**م دەکرد، بەو ڕووخسارە هەنگوینی و

دوو باسکی لاواز و پرچی قاوەیی و برژانگی دریژ و دەمێکی گەورەوە دەهاتە پێش چاوم.
بەڵام جۆرەکەی دی بە چاوی داخراوەوە وێنەی خەڵکی پێ دەگێڕدرێتەوە، واتا تۆ بە بینایی نێوخۆوە وێنەیەکی ویژدانیی ئەو کەسە دەبینیت، کە دێتە یادت... وەکوو شەبەنگێکی کز و ڕەنگێکی سروشتی؛ تەنیا بەم شێوەیە لۆلیتام دێتەوە یاد.
ئەنابێل بە چەند مانگێک لە من بچووکتر بوو، لەگەڵ دایکوباوکیدا لە ڤیلایەکی نیزیک هۆتێلەکەمان ژیانی بەسەر دەبرد. نایەتە یادم چەندم ڕق لە دایکوباوکی بوو، دایکی توندوتیژ و باوکی کەسێکی کەچەڵ و ناسراو بوو، هەردووکیان هاوڕێی پوورەکەم بوون.
بەڵام ئەنابێل لە ڕووی هەستکردن بە یاخیبوونی ئاژەڵییانە و بەئاگابوونی جەستەیی، هاوشێوەی من و ئەو کەسانە بوو، کە لە سەرەتای هەرزەکاریدا بوون، لە ڕووی ئارەزووی درامییشەوە، ئەنابێل پێی خۆش بوو لە یەک لە وڵاتەکانی ئاسیا ببێتە پەرەستار، کە ڕووبەڕووی سەختیی برسێتی بوونەتەوە، بەڵام من ئارەزووی ئەوەم هەبوو ببمە سیخوڕێکی باڵا و ناسراو، هەستی ئاژەڵییانە لە گیانی هەردووکماندا بوو، جۆرە هەڵچوونێک بوو، هیچ گوزارشتێکی بۆ خۆی نەدەدۆزییەوە و ئازار و تینوویەتیی پێ دەبەخشین.
کەوتینە داوی خۆشەویستیی یەکەوە، خۆشەویستییەکی پەلکێش و بێهوودە، بێشەرم و ئابڕووچوون، بۆیە دەڵێم بێهوودە، چونکە لەژێر چاودێرییەکی توندوتۆڵدا بووین، ڕێمان پێ نەدەدرا لە بەر چاووگوێی خانەوادەکانمان دوور بکەوینەوە، هەمیشە بە شەوان و بە دزییەوە لە باخچەی ماڵی ئەواندا تەنیا دەماینەوە، لە کاتێکدا منداڵانی سەر

شەقامەکان سەدان هەلیان بۆ تێرکردنی ویست و بەیەکگەیشتنیان بۆ دەڕەخسا.
کاتێک لەگەڵ خانەوادەکانماندا دەچووینە کەنارزەریا، تا سنووریکی دیاریکراو ڕێمان پێ دەدرا دوور بکەوینەوە، هەموو هەلێکی پیرۆزمان دەقۆستەوە بۆ ئەوەی بگەین بە یەک و دەستی گەرممان بە یەک بگات و ورووژێنەرانە یەکترمان لەمس دەکرد.
هێندێک جار دەستی دەخستە ژێر لمەکەوە و بەرەو من دەیخشاند، تا پەنجەکانی دەگەیشتنە دەست و قاچم، هێندێک جاریش قاچەکانی گەشتێکی بە ئاگا و خاویان دەکرد، بۆ ئەوەی بەر لاقم بکەون. چەند دڵخۆش دەبووین، کە منداڵەکان بە ڕێکەوت دەکەوتنە نێوان ئێمە و کەسوکارمان و لمەکەیان بەرز دەکردەوە، ئەوکات چاوی کەسوکارمان پەردەپۆش دەبوو، هەلمان بۆ دەڕەخسا و ماچی یەکدیمان دەکرد.
ئەو دەستلێدانە پچڕپچڕانە، ماندوویی و ورووژانێکی زۆری بە جەستەمان دەگەیاند، تەنانەت هەموو ئاوی شینی زەریایش نەیدەتوانی ئەو خەم و ناسۆرەمان بۆ هێور بکاتەوە و تینوویەتیی بەردەوامی جەستەمان تێر بکات.
بە داخ نیم بۆ ئەو گەنجینە بیرەوەرییانەی ونم کردوون، هێندەی داخی لەدەستدانی ئەو وێنەیەی لە قاوەخانەیەکی نێزیک کەناری زەریاکە گرتمان، هەردووکمان لە نێوان خانەوادەکانماندا وەستابووین، بەر لە چەند ساتێک لە هەوڵە کۆتاییەکانی ئەو زۆرانبازییەی لەگەڵ قەدەردا، لە دوارۆژی ئەو هاوینە شوومەدا، کردمان.

چیرۆکەکەیش ئەوە بوو، توانیمان بیانوویەک بدۆزینەوە بۆ ئەوەی بۆ شوێنێکی چۆل برۆین و لە قاوەخانەکە هەلبێین بۆ کەنارزەریا. دوور لە چاوی خەلک بین. شوێنێکی لێ بوو وەکوو ئەشکەوتێکی سروشتی بوو، لەوێ لە سێبەری وەنەوشەیی سوورەبەردەکانی ئەو چواردەورەدا، باوەشێکی کورت و هێندێک دەستبازیی بوێرانەمان کرد، جگە لە چاویلکەیەکی ڕەشی بەر هەتاو، کە پێ دەچێت خاوەنەکەی لەو شوێنەدا بە ڕێکەوت بەجێی هێشتبێت، لە دیدی هیچ کەسێکەوە دیار نەبووین.

هێندەی پێ نەچوو کەوتمە سەر چۆک، لەوەدا بووم خۆشەویستەکەم بگرمە خۆم، لەنێو زەریاکەوە دوو پیاوی ڕیشدرێژ دەرچوون، کە لە مەلەکردن دەهاتنەوە و بەرەو کەنار سەردەکەوتن، بە دەم هاوارەوە دەستیان بە ستایشکردنی گالتەجاڕانە و هاندان کرد.

دوای چوار مانگ لەو ڕووداوە، **ئەنابێل** بە نەخۆشیی **تیفۆس**، لە دوورگەی **کۆرفۆی** یۆنانیدا، گیانی لە دەست دا.

## ٤

بیرەوەرییە خەمناکەکانم بێبەزییانە هەلدەدەمەوە. بە درێژاییی کات ئەو پرسیارە دەکەم، ئایا ژیانی من لەو هاوینە سەختەدا درزی تێ کەوت، یاخود ئارەزووی سەختم بۆ ئەو مندالە، یەکەم ڕێ بوو بۆ تەنیایی و گۆشەگیریی بۆماوەییم.

هەول دەدەم شیکارییەک بۆ هۆکاری ئارەزووی سێکسی و پالنەر و کارەکانم بکەم، چونکە ڕادەستی جۆرێک لە خەیال دەبم بەرەو ڕابردوو دەمبات، خەیالێکە تێرکەری شای گفتوگۆیە بۆ کۆمەلێک

هۆکار و ئەگەر، کە لە ژماردن نایەن، بۆ ئەوەی ئەو مێژووەم بکات بە شتێکی ئاڵۆز و ئارەزووم بورووژێنێت، بەڵام لە کۆتاییدا قایلم دەکات بەوەی مەسەلەکەی من لەگەڵ **لۆلیتا**دا، بە شێوەیەکی ئەفسووناویی شووم، لە **ئەنابێل**ەوە، دەستی پێ کرد.

من ئەوەیش دەزانم، شۆکی ئەو هاوینە پڕ لە گوشار و قەتیس و شوومەی، لە مردنی **ئەنابێل** تووشم بوو، پتر دەروونی پەرشوبڵاو کردمەوە.

ئەو پەرشبوونەیش بووە ڕێگر لە ڕێی هەموو خۆشەویستییەک، کە لە ساڵانی ساردی گەنجێتیمدا تووشم بوو، چونکە بۆ ساڵانێکی دوورودرێژ هەستم دەکرد یادی مردنی **ئەنابێل** دوام کەوتووە و گەمارۆی داوم، لەو ڕێیەوە بیرەوەرییەکان، لێکگونجاندن و هاوشێوەییەکانی نێوانمان، دەچووە ناخمەوە.

لە حوزەیرانی ئەو ساڵەدا [١٩١٩] بەر لە مردنی بە چەند ڕۆژێک، لە فرەنسە، کەنارییەکی وێڵ هاتە ماڵمانەوە، بە هەمان شێوە، بە وێڵی، لە **کۆرفۆ**، چووە ماڵی ئەوانیشەوە!...

لە دواپەیامیدا بەم شێوەیە بۆم دوا

ئای **لۆلیتا** ئاوا منت خۆشت ویست؟!

کۆتاییی چیرۆکی **ئەنابێل**م هێشتەوە و کردم بە هەواڵی چیرۆکی یەکەم وادەی شکستهێنانی نێوانمان. لە یەک لە شەوەکاندا، **ئەنابێل** توانی چاوە بێدارەکانی خێزانەکەی هەڵبخەڵەتێنێت و لەسەر زەوییەکی ژێر دارلیمۆکەدا، کە گەڵاکانی وەکوو خێوەتگە دایدەپۆشین، بە یەک بگەین. لە نێوان چلە تاریکەکانی دارەکانەوە، پەنجەرە ڕووناکەکانی دوژمنەکانمان دەبینین؛ سەرقاڵی یاریی ناپلیۆن بوون.

کاتێک لێواری لێو و نەرمایی گوێچکە گەرمەکانی **ئەنابێل**م ماچ دەکرد، ئەو دەلەرزی. ئاسمان سامال بوو، ئەستێرەکان لە نێوان گەلا فریشتەئاسا تیژەکانی لیمۆکەوە بە کزی بریسکەیان دەهات، توانیم بە ڕوونی ڕووخساری **ئەنابێل**ی درەوشاوە ببینم، چونکە بە ڕووناکییەکی شاراوەوە دەردەکەوت.

درزێکی تەسک لە نێوان قاچە نەرم و جوانەکانیدا بوو، دەستم درێژ کرد و توانیم مەبەستەکەم بدۆزمەوە. لە ڕووخساری **ئەنابێل**دا، ڕوانینێکی ون و خەوناوی نیگاکێش بوو، هەستی چێژ و ئازاری تێدا بە گو دەهات.

**ئەنابێل** لە دانیشتنەکەیدا لە من بەرزتر بوو. کە نوقمی هەست دەبوو، سەری بە بزاوتێکی خاو و نەرمەوە دادەنواند، گڕی دەگرت و ماچی دەکردم، دەستیشم لە نێوان ڕانە گەرمەکانیدا بوو، توند جووتی دەکرد و دەیگوشی و دەتەقییەوە و دەکرایەوە، دەمە لەرزۆک و ناجێگرەکەیشی هەناسەیەکی گەرمی ڕەوانە دەکردم، نیشانەی پەنگخواردوویی و نەخۆشیی تێدا بوو، هەوڵی دەدا ئەو بارەی لە سەریەتی لای بدات و لێوە وشکەکانی دەخشاندە لێوم، دواتر ڕووخساری دوور دەخستەوە و بە ڕاوەشانێکی توندی سەری، پەلکەکانی هەڵدەدایەوە، دووبارە دەهاتەوە، بە نیگایەکی هەورینەوە ڕێی پێ دەدام لە لێوی بنۆشم.

لە نوقمی ئەو گڕوتینەدا، هەستم بە گەرمییەکی زۆر دەکرد، هانی دەدام شتێکی پێ ببەخشم: دڵم، ملم، هەناوم! بە دەستە نەرمەکەیەوە، دڕندەیی تێرنەبووی دەگرتم.

بۆنوبەرامەیم باش بە بیر دێت، بۆنی تێکەڵبوونی ئەو بۆدرەیە بوو، لە یەک لە سەرپەرشتیارە ئیسپانییەکانی دزیبوو، لەگەڵ بۆنی شۆکولاتە،

تیکەڵەیەک بوو لە بۆنی ژن و منداڵیک، ئەو بۆنوبەرامەیەی سەرخۆشی دەکردم و باری دەکردم بۆ ئەوەی هەنگاوی دیکە بنێم.
لێرەدا شتێکی نێزیک لە ئێمە جووڵایەوە و خشەی گیایەکان هات. بە ترسێکی ناکاو و چاوەڕواننەکراوەوە دوور کەوتینەوە. تێرنەبوون لە یەکدیش دیسووتاندین.
کاتێک زانیمان ئەو دەنگەدەنگە پشیلەیەکی بەرەڵڵا بوو لە باخچەکەیاندا، گوێمان لە دەنگی دایکی بوو، بە زمانێکی بەهێز و بەرزەوە بانگی دەکرد، لەژێر خێوەتگەی دارلیمۆکەدا بە خشپە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.
یادگاریی دانیشتنی ژێر خێوەتگەی دارلیمۆکە وەکوو نەفرەتێک دوام کەوتبوو، هەمیشە هەستم بە فریشتەییی ئەو کچە بچووکە دەکرد، بە دەست و قاچە لاواز و زمانە گەرمەکەیەوە پێمەوە نووسابوو، تاکوو بیستوچوار ساڵ نەمتوانی ئەم فاڵە لە خۆمدا هەڵبوەشێنمەوە، کاتێک **ئەنابێل** لە جەستە و کەسایەتیی **لۆلیتادا** بۆ ژیان گەڕایەوە.

## ٥

هەرچەندە بە بیرەوەرییەکاندا بگەڕێمەوە بۆ سەردەمی گەنجێتیم، ئەو ڕۆژانەم وەک وێرانە لەبەر چاوم بڵاو دەبنەوە. لەو ڕۆژانەدا پێوەندیی جەستەییم لەگەڵ ژناندا کردار و لەبەردەست و چالاک بوو.
لە کاتی خوێندنم لە لەندن و پاریسدا بەشی خۆمم لە سێکسفرۆشەکان دەست دەکەوت.
لە سەرەتای خوێندنمدا نیازم وا بوو زانستی دەروونی بخوێنم، وەکوو زۆربەی ئەو کەسانەی کە هیچ بەهرەیەکیان نییە، بەڵام بینیم

من لەوانە زۆرتر لە پیشەوەم، ڕووم کردە ئەدەبی ئینگلیزی، لەو بوارەیشدا کەسەکان زۆربەیان دوارۆژیان دەبێتە شاعیری هەستێکشکاو، وەکوو ئەو مامۆستایانەی پایپ دەکێشن و جلوبەرگی ئەستوور لەبەر دەکەن.
پاریس بۆ من شیاو بوو، کاتەکانم بە گفتوگۆکردن لە بارەی فیلمەکانی سۆڤێت و ڕووسیای سپییەوە بەسەر دەبرد، کە ڕەگەزنامەیان نییە، لەگەڵ کەسانی ئاژاوەچی و فەلەکناسدا لە (قاوەخانەی لی دۆ ماگۆ) دادەنیشتم.
لە پاریس توێژینەوەیەکی ڕەکیکم لە گۆڤار و ڕۆژنامە ئەمومژاوییەکاندا بلاو کردەوە و کتێبێکم بە ناوی (مێژووی کورتکراوە بۆ شیعری ئینگلیزی) بلاو کردەوە، دواتر سەرچاوەی ئەدەبی فەرەنسیم بۆ خوێندکارە بەریتانییەکان دەهێنایەوە، بەوەیش ساڵەکانی تەمەنم بەسەر برد، تاکوو گەیشتمە تەمەنی چلساڵی، کاتێک دەستگیر کرام، بەشی کۆتاییی ئەو سەرچاوەیە بۆ چاپکردن ئامادە کرابوو.
لە کارێکی قەڵەمییەوە بۆ کارێکی تر دەگوازرامەوە و هاوڕێی پسپۆڕ و کۆمەڵایەتی و دەروونشیکارەکانم وەبەرهێن دەکردن و بەشداریی ماتەمینی و وانەی چاکسازییانم دەکرد، لەوێدا ڕووخساری کچە زەردهەڵگەراو و بڕژانگدرێژەکانم دەبینین، وێنەیان ئەو کەسەیان بە بیر دەهێنامەوە، کە لە خەونەکانمدایە.
لێرەدا دەمەوێت ئەو بیرۆکەیە ڕوون بکەمەوە، کە لە ناسینی جیهانی کچە پارچەلە و هەرزەکارەکانەوە پێی گەیشتم:
هێندێک کچ هەن تەمەنیان لە نێوان (٩ بۆ ١٤)ساڵیدایە، لە چاوی هێندێک پیاوی دڕندەدا گەورەتر دیارن، ئەو جۆرە پیاوانە سروشتی

ڕاستەقینەی گرۆتینی شەهوەتی ئەو کچانەیان بۆ ئاشکرا دەبێت، نەک سروشتی مرۆڤانەیان، بەڵکوو سروشتی حەزی سێکسیی هار، سروشتێکی دۆزەخی و شەیتانی، بۆیە ئەو جۆرە کچانەم ناو ناوە: **پەرییە هارە تێرنەبووەکان.**

لەوانەیە خوێنەر تێبینیی ئەوەی کردبێت کە من سنوورێکی زەمەنیم بۆ ئەو جۆرە بوونەوەرانە داناوە و دەمەوێت خوێنەر سەیری درێژاییی سالانی ژیانی کچ بکات، لە تەمەنی نۆساڵییەوە تا چواردەساڵان، وەکوو توخمێک کە سنوور بۆ دوورگەیەکی ئەفسووناوی دیاری دەکات، کە ئەو (پەرییە هارانە) دیمەنی حەزی سێکسی و وروژێنەریانم بۆ ئاشکرا دەکەن.

خوێنەر لەوانەیە پرسیاری ئەوە بکات... ئایا هەموو کچانی تەمەن نێوان (٩ بۆ ١٤)ساڵان لە جۆری پەرییە هارەکانن؟ بێگومان نەخێر، دەنا من و ئەوانەی هاوشێوەی منن ئەگەر لە یەک خانەوادەدا بژین و وروژانی ئەو کچانەمان بۆ ئاشکرا ببا، شێت دەبووین.

شتێکی نەبینراو لە نێوان پەرییە هارەکان و کچانی تردا هەیە، لێکیان جیا دەکاتەوە، شتێکە تەنیا پسپۆڕی ئەفسانەی سێکس، شتە شاراوەکانی ئەو کچانە لە نێوان هەموو برادەرەکانیدا دەیانناسێتەوە، لە ڕاستیدا (پەرییە هارەکان) لەنێو کچاندا زۆر کەمن، پێویستە تۆ هونەرمەند یاخود شێت، یاخود لە ناخی دڵەوە نێچیرێکی ئالوودە بی، یاخود پیاوێک ئاگری سێکس لە خوێنیدا هەبێت، بۆ ئەوەی بتوانێت پەرییە هارەکان یەکڕاست لەنێو هاوتەمەنەکانیدا بناسێتەوە، بە تایبەتی ئەوانەی کە لە ڕووی دڵ و شێوەوە لە کچی ئاسایی دەچن و وەکوو کەسێکی ئاسایی خۆیان دەردەخەن.

بۆیە ئەوان شەیتانێکن لە کراسی کچێکی فریشتەدا، تێکەڵی برادەرەکانیان دەبن و ئەوانیش هەست بە جیاوازییەکانیان ناکەن، خۆیشی هەست بەو کاریگەرییە هەژێن و وێرانکەرەی ناکات. بەڵام سنووری کات ڕۆڵێکی ئەفسووناوی دەبینێت لەم کارەدا، بۆیە پێویستە خوێنەر پێی سەیر بێت کە جیاوازیی تەمەنی نێزیکەی (٣٠) ساڵ یاخود (٤٠) ساڵ و هێندێک جاریش (٩٠) ساڵ بێت و لەگەڵ پەرییە هارەکاندا بێت، کاتێک پیاو دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەفسانەی پەرییە هارەکانەوە، مەسەلەکە مەسەلەی گونجاندنە لەگەڵ چاوگ و مەسەلەی پانتاییەکی دیاریکراو، چێژ بە قووڵاییی چاوی ناوەوە دەبەخشێت و دەیبەزێنێت و تێی دەچێت، لە کۆتاییدا مەسەلەکە هاودژییەکی دیاریکراوە و زەین هەستی پێ دەکات و هەستەوەرەکانی ناوەوە تێبینیی دەکەن و هەست بە شادی و خۆشییەکی زۆر دەکات.

کاتێک من منداڵ بووم ئەنابێلی ئازیزیش منداڵ بوو، ئەو خۆشەویستە، لە دیدی مندا (پەریی هار) نەبوو، بە بۆچوونی خۆم وامدەزانی هاوشێوەی ئەوم، لەسەر ئەو دوورگە زەمەنییە ئەفسوناوییەدا. بەڵام ئەمڕۆ کە ساڵی ١٩٥٢ە و دوای تێپەڕبوونی بیستونۆ ساڵ بەسەر ئەو ماوەیەدا، پێم وایە توانای ئەوەم هەیە یەکەم جنۆکە بناسمەوە کە خۆی هەڵقورتاندە نێو ژیانمەوە.

یەکدیمان لە ناکاو و پێشوەخت و زۆر بە سەختی خۆش ویست، ئەو جۆرە خۆشەویستییەیش هەمیشە ژیانی هەرزەکاران وێران دەکات هێز و وزەی خۆم وای کرد ژیانی خۆم لە وێرانبوون ڕزگار بکەم چونکە ژەهر گەیشتە ئەو برینەی کە خۆشەویستی لە بوونی مند

دروستی کرد، ئەو برینەیش هەمیشە بە کراوەیی ماوەیەوە و بۆ هەتاهەتایە بۆگەنی کرد.
بەو برینەوە پێگەیشتم و لەنێو ژیارێکدا بوومە کەسێکی ٢٥سال، ڕێی ئەوەم پێ دەدرێت سۆزداری لەگەڵ کچێکی ١٦ساڵاندا بکەم، بەڵام ڕێی ئەوەم پێ نادرێت سۆزداری لەگەڵ کچێکی ١٢ساڵاندا بکەم.
بەم حاڵەوە ژیانم لە ئەورووپادا سەیر نییە، دووڕوو بوو، دوو بوون و دوو جیهانی جیاواز، بە ڕووکەش پێوەندیی ئاسایی و سروشتیم لەگەڵ ژمارەیەک ژندا هەبوو، ئەوانیش کاتێکی خۆشیان بەسەر دەبرد، بەڵام لە ناوەوە، هەستم بە بڵێسەی ئاگری دۆزەخ دەکرد، بە هۆی حەزی سێکسی و تێرنەبوونم لە ئاست ئەو پەرییە هارانەی، لە تەنیشتمەوە تێدەپەڕین، بەبێ ئەوەی بتوانم دەستیان بۆ درێژ بکەم، چونکە هاوولاتییەک بووم، ڕێزم لە یاسا دەگرت.
بەم شێوەیە ئەو مەخلووقە مێیینانە ئەوە نەبوون کە ڕێ بە خۆم بدەم لەگەڵیاندا راببوێرم، بەڵکوو ئەوانە تەنیا ئامرازێک بوون بۆ هێورکردنەوەم. دەمتوانی پێم وا بێت ئەو هەست و وروووژانە سێکسییانەی کە لە ڕێی خراپەکارییەوە بە دەستم دەهێنا وەکوو هەستی کەسانی پێگەیشتوو وایە، بە شێوەیەک سێکسکردن لەگەڵ ژنە پێگەیشتووەکاندا لەسەر ئیقاعێکی ڕێکخراو و گونجاودا جیهانی دەبەزاند و ژیان تێیدا نوێ دەبووەوە، جیاوازیی نێوان من و ئەو بەڕێزانە ئەوەیە کە ئەوان ئەو چێژەیان نەبینیوە وەکوو ئەوەی من بینیم، خۆشییەکی تیژتری هەڵگیرساو بوو لە هەڵچوونی وروووژان، لەو هەڵچوونە زیاتر بوو کە نێرومێیەکی هاوتەمەن پێی دەگەن؛ خەونەکانم بەم شێوەیە بوون.

بەم شێوەیەی زۆربەی خەونە دەسپەرییەکانم ئیلهامی جوانیان دەبەخشییە مێشکم بۆ داهێنانی خراپەکاری و کاری نەشیاو، بە جۆرێک، تەنیا نووسەرە لێهاتووەکان دەتوانن بینووسنەوە. جیهانی من دوو کەسایەتی بوو، هەستم دەکرد کە دوو جۆر ڕەگەزی ژن هەیە، هەستیشم دەکرد کە لە هەردووکییەوە دوورم: یەکیان لەگەڵیدا ناگونجێم، ئەوەی دیکەیشیان دابونەریت و ڕەوشتی ژیاری و کۆمەلایەتی ڕێم پێ نادات چێژی لێ وەربگرم.

ئێستا ئەو ڕاستییەم بۆ ڕوون بووەتەوە، بەڵام ئەو سەردەمەی لە تەمەنی سییەکاندا و لە سەرەتای چلەکاندا بووم، نەمتوانی بە ڕوونی لە کێشەکەم تێ بگەم، بەڵام جەستەم دەیزانی بیری کێ دەکات، عەقڵیشم پاڕانەوەی جەستەمی ڕەت دەکردەوە و ئامادە نەبوو بە خۆبەخش لەو کێشەیە ڕزگارم بکات. هەمیشە ترس و شەرم زۆر دڕندە بوون بۆ گیانم، هێندێک جاریش ڕەفتارەکانم بە شێوەیەکی سەرەڕۆیانە گەشبین دەبوون، شتە قەدەغەکراوەکانی دیکەی کۆمەڵگەیش دەیانخنکاندم و ماندوویان دەکردم.

ڕاوێژم بە چەندین دەروونشیکار کرد، هەمیشە بەڵێنی ئارامبوونەوەیان پێ دەدام. بەڵێنی ئەوەیان پێ دام کە ڕەها دەبم لەو حاڵەتەی تووشم هاتووە و دەیانگوت ئەوە حەزێکی سێکسیی درۆزنانەیە. بەڵام من هیچ شوێن و ئامرازێکم بەدی نەدەکرد بۆ کوژاندنەوەی هەستە تێرنەبووەکانم، جگە لە هاوشێوەکانی ئەنابێل، لە ڕووی تەمەن و شێوە و لێکچوونەوە، وێنەی ئەو هاوشێوانە وەکوو نەزرێک بوو بۆ ئەگەری شێتبوونم لە کاتی زیندەخەونەکانمدا.

لێرەدا بە یارمەتیی خوێنەر دەمەوێت باسی یاسای پارچەڵە و گەنجانی ساڵی ١٩٣٣ی بەریتانیا بکەم، کە چۆن (پارچەڵە)ی شی

کردووەتەوە: پارچەلە منداڵێکی تەمەن سەرووی هەشت ساڵە و چواردە ساڵی تێنەپەڕاندبوو، بەڵام لە ویلایەتی ماساشۆسێتسی ئەمەریکیدا، یاسای پارچەلە لە نێوان حەوت بۆ حەڤدە ساڵدا دیاری کرابوو، ئەوەیش بۆ ئەو ڕووداوانەی کە کچان لەژێر دەستی کەسانی خراپ و دڕندەدا تووشی دەبوون.
بیرم دێت **هێڤ برافتۆن** کە نووسەرێکی باش و بەرچاو بوو، بە بەڵگەوە سەلماندی **ڕاحاب** کاتێک تەمەنی ١٠ساڵان بوو لەشفرۆشێکی لێهاتوو بوو.
من دەتوانم کۆمەڵێک شایەتیی مێژوویی بێنمەوە لەسەر هەڵگیرسانی سێکس لە ژیانی هێندێک لە کچە پارچەلەکاندا، کە چۆن وەکوو ژنی پێگەیشتوو ڕەفتاریان کردووە. لە ڕۆژهەڵاتدا چەندەها هاوسەرگیری کراوە لە نێوان پیاوێکی هەشتاساڵە و کچانێک کە تەمەنیان ١٠ ساڵی تێنەپەڕاندووە. دواتر **دانتێ** شاعیری لێهاتووی ئیتالیات نەبیستووە؟ کە بیاتریسی تەمەن نۆساڵانی خۆش ویست، بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٢٨٤دا، بانگهێشت کرابوو بۆ ئاهەنگێک لە فلۆرەنسا و بیاتریسیش خۆی جوان کردبوو و بۆنی لە خۆی دابوو، ئەویش شەیدای بوو. ئەی **سترارک**، کە بە شێوەیەکی زۆر شێتانە **لورین**ی ١٢ساڵی خۆش ویست کە فریشتەیەکی دیار و ورووژێنەر و تیژنەبوو بوو، کە هێشتا لەسەر شاخی فۆکلۆز یاری دەکرد و هەڵدەبەزییەوە.
بەڵام چ کارمان بە مێژووە!
هەوڵم دا مرۆڤێکی باش بم، دەتوانم بە خۆم بڵێم هەمبەرت بەڕاستی هەوڵی دەدا کەسێکی باش بێت و ڕێزێکی زۆر قووڵی لەو کچە بچووکانە دەگرت، هەرچەندە هەڵی بۆ ڕەخسایە، هەرگیز دەستی لە پاکی و پاکیزەیییان نەدەدا، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دڵی تینووی

دەجوولا کاتێک چاوی بە پۆلێک کچی بچووک و پاکیزە دەکەوت، لە نێوانیاندا چاوی کچێکی دۆزەخی و ورووژێنەری دەبینی، بە دوو چاوی گەش و لێوی سێکسیی تەلیسماوی و ورووژێنەری ناوەوەی... کچێکی بچووکە... یاسا سزای ١٠ ساڵ زیندانیت بەسەردا دەسەپێنێت، ئەگەر بیسەلمێنێت کە تۆ بە چاوێکی خراپەوە سەیرت کردووە.

بەم شێوەیە ژیانم بەردەوام بوو، هەمیشە دەمتوانی بکەم بەو ژنانەی هاوتەمەنم بوون، بەڵام ئارەزووم لە کچۆڵەیەکی سێکسی بوو، کە هەمیشە ئارەزووم دەکرد و حەزم پێ بوو.

دەچووم بۆ پارکە گشتییەکان کە کچانی بچووک تێیدا یارییان دەکرد، هەمیشە پەرییەکی هارم دەبینییەوە و مەست دەبووم پێی، بە دزییەوە لە پشتی کتێبێکەوە دەڵەرزیم و سەیری خڕی و کەوانەکانی جەستەی و گۆشتە نەرمەکەی لاقیم دەکرد، کاتێک هەڵدەبەزییەوە و دەسووڕایەوە و لە جیهانی خۆیدا یاریی دەکرد، بێ ئاگا لەو گڕە دۆزەخییەی دڕندانە مێشک و دەمارەکانی دەسووتاندم، بەم شێوەیە چاودێریی ئارەزووەکانم دەکرد.

جارێکیان پیرەژنێکی نابووت لە تەنیشتم دانیشتبوو، هەستی بەوە کرد ڕەنگی ڕووخسارم دەگۆڕێت، پرسیاری ئەوەی لێ کردم ئایا گەدەم دێشێت؟ هەی کونەپەپووی ناشیرین لاچۆ لەبەر چاوم. بەڵام ئەو پارچەلە جوانانەی بە شێوەیەکی سێکسی خۆیان دەردەخەن، با تا هەتا لە دەورم یاری بکەن.

چەند خۆش بوو ئەو ساتانە، ساتێک بوون لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە دەمڕوانی، یەک لەو کچە بچووکانەم دەبینی، لە بەردەم ئاوێنەکەدا خۆی ڕووت کردووەتەوە و سەیری جەستەی خۆی دەکات، یاخود ئەو ساتانەی کە لەنێو پاسەکاندا ڕێکەوتی

قەرەباڵغییەکم بۆ دەڕەخسا و یەک لە پەرییە هارەکان کە هێشتا مەمکی خڕ نەبووبوو لە تەنیشتم دەوەستا و گەرمییەکم لە لەشییەوە بۆ دەهات، تووشی پەتای چێژی دەکردم.

## ٦

زۆر جار پرسیاری ئەوەم دەکرد: ئەو جنوکە هارانە لە دواییدا چییان بەسەر دێت، کە ئەو هەستە شاراوانەی ناوەوەیانم دەدزی، ئایا کاریگەریی بۆ سەر ئایندەیان نەبوو، لەم جیهانەدا کە بە دەرد و هۆیەکان کاریگەرە؟

دوای هەر ئەزموونێک لەگەڵ یەک لەو کچانەدا پرسیاری ئەوەم بۆ دەهات: گریمان دەستم بەسەر یەک لەو کچانەدا گرت، بێ ئەوەی بە هیچ شێوەیەک لەو کردارە تێ بگات، ئایا دوایی بە کەس ناڵێت؟ ئایا نامبینێت بەشداریی دارشتنەوەی قەدەرەکانی دەکەم و هەڵیدەقورتێنمە نێو حەزە شیتانەکانمەوە، یاخود... ئاهـ.. ئەم پرسیارانە، تا ئێستا سەرچاوەی ترسێکی زۆرن بۆم. گریمان شتێکم زانی لە بارەی ئەو کچانەوە کە گەورە بوون چییان بەسەر دێت، وەکوو ئەوەی کە شێوەیان چۆن دەگۆڕێت.

لە ڕۆژێکی گەرمەی بەهاردا بوو، لە شەقامێکی لاوەکیی نزیک شەقامی (مادلین)ی پاریس ڕێم دەکرد، کچێکی باریکەلەی گورج و بە هەنگاوی شیک و خێراوە، لە تەنیشتمەوە تێپەڕی، کە ئاوڕم دایەوە ئەویش بە هەمان شێوە ئاوڕی دایەوە.

باڵای ئەو نەدەگەیشتە شانی من، دەموچاوێکی هێلکەیی جوان و درەوشاوەی هەبوو هاوشێوەی کچە فەرەنسییە پێگەیشتووەکان، لێی

نیزیک بوومەوە، برژانگی دریژ و لەشولار و جەستەیم پی جوان بوو، بە جلیکی تەسک جەستەی دەرخستبوو، هەستم کرد هیشتا ڕەنگدانەوەی هەرزەکاریی تیدا مابوو، موچرکیکی زۆر خۆشم پیدا هات، خوینی نیو دەمارەکانم تیک چوو، کاتیک سەیری شیوە هیلکەییەکەی جەستەیم دەکرد، دیار بوو ئەزموونەکانی هیشتا ئەو هیلانەی جەستەی لەناو نەبردبوو، ڕووخساری منداڵئاسای پیوە مابوو.

کاتیک پرسیاری نرخەکەیم کرد، بە دەنگیکی کز وەکوو زەنگی زیو، گوتی:

- (١٠٠) فرەنک.

ویستم سازش بکەم، بەڵام ئەو لە برژانگەکانیدا هەستی بە ئارەزووە زۆرەکەی من کرد، چاوی پرووکاند و شانی هەڵتەکاند و گوتی (تو ئازادی!) وا ڕەفتاری کرد کە بە نیازە بڕوات. بیرم کەوتەوە کە سی ساڵ بەر لە ئیستا ئەو کچەم دەبینی لە قوتابخانە دەهاتەوە بۆ ماڵ... ئەو یادگارییە کاریگەرییەکی خیرای هەبوو، لەگەڵیدا ڕۆیشتم بۆ ژوورەکەی، وەکوو هەمیشە داوای دیارییەکەی کرد و منیش ١٠٠ فرەنکەکەیشم پی دا و پرسیاری ناو و تەمەنیم کرد، گوتی ناوی (مۆنیک)ە و تەمەنی ١٨ ساڵە.

من پسپۆڕ بووم لە کچانی سەر شەقام، ناتوانن هەڵم بخەڵەتینن، هەموویان بۆ تەمەنیان بە زمانیکی یەکلاییکەرەوە ڕۆژانە دەیان جار بە ١٨ ساڵ وەڵامی ئەو کەسانەی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن، دەدایەوە. مۆنیک لانیکەم بە درۆ، دوو یاخود سی ساڵی زیادی خستە سەر تەمەنی ڕاستەقینەی، ئەوەیشم بە وردەکارییەکانی جەستە لاوازەکەی بۆ دەرکەوت، کە هیشتا بە تەواوەتی پینەگەیشتبوو.

مۆنیک زۆر بە خێرایی جلەکانی داکەند، بە پەردەکە بەشێکی لە لەشی خۆی پۆشی و گوێی لە موسیقای (ئەرگن) گرت، کە ژەنیارێکی گەڕۆک دەیژەنی، بە هەستێکی منداڵانەوە گوێی دەگرت، دەستەکانیم پشکنی، ئاگەدارم کردەوە پیسی لەژێر نینۆکەکانیدا کۆ بووەتەوە، بە ڕۆحسووکییەکەوە گوتی: "بەڵێ ئەوە کارێکی نەخوازراوە." ویستی بەرەو دەستشۆرکە بڕوات، بەڵام ڕێگریم لێی کرد و پێم گوت گرینگ نییە. قژێکی قاوەیی نیمچەلوول و دوو چاوی هەنگوینیی بریقەداری هەبوو و ڕووخسارە زەردەهەڵگەڕاوەکەیشی بەش بە حاڵی خۆی زۆر جوان بوو، قەبارەی قوونی لە قەبارەی هەرزەکارەکان گەورەتر نەبوو.

لێرەدا دەمەوێت بڵێم مۆنیک یەکێک بوو لە نێوان ئەو (٨٠) کچە لەشفرۆشانەی کە لە ژیانمدا ناسیویانم، بەڵام تاکە کچ بوو چێژی ڕەسەن و ڕاستەقینەی پێ بەخشیم، بیرم دێت کاتێک بە خێرایی جلەکانی لەبەر دەکرد، گوتی: "ئەوەی ئەم یارییەی داهێناوە شەیتانێکی نەفرەتلێکراو بووە."

بەر لەوەی برۆم داوام لێ کرد لە ئێوارەی هەمان ڕۆژدا پێوەندییەکی دیکەی درێژتر بگرین، گوتی کاتژمێر نۆی شەو لە پێچی قاوەخانەی مادلیندا چاوم پێی دەکەوێت، سوێندیشی خوارد بە هیچ پیاوێک هەڵنەخەڵەتێنرێت. لە وادەکەدا گەڕاینەوە بۆ ژوورەکە. جگە لەوەی بە ئاشکرا باس لە جوانییەکەی بکەم هیچی ترم پێ ناکرێت. تێبینیم کرد لە ئاوێنەکەدا، وێنەی جیهانە بچووکە بەختەوەرەکەمانی لەسەر سیسەمەکە پێچ دەکردەوە، لە ڕووخساری خۆمدا تێبینی نەرمونیانییەکم دەکرد، لە پشتییەوە ددانە دڕندەکانمی دەشاردەوە، بە

وەلامێکی پیشەییانەوە پرسیاری لێ کردم: ئەگەر ماچم دەکەی، سووراوەکەم بسڕم؟
بێگومان بە نیازی ماچکردنی بووم، بە هەست و هەڵچوونێکی زۆر زیادەوە، خۆمم بەردا بۆی، بە شێوەیەک پێشتر لەگەڵ هیچ کچۆلەیەکدا ئەو کارەم نەکردبوو، یادگاریی ئەو شەوەم لەگەڵ مۆنیکدا- پەریی هار و برژانگدرێژ- بە خۆشییەوە بردە سەر. هەرگیز لە ژیانی سۆزداریی نهێنیمدا چێژی وام نەچەشتبوو.
زۆر کەیفساز بوو کە ٥٠ فرەنکی زیادەم پێ دا. لەو شەوی بەهارەدا چووینە دەرەوە و لەسەر شۆستەکان ڕێمان دەکرد. ئەو شەوە وازم لێ نەهێنا تا وادەیەکی دیکەم لەگەڵیدا ڕێک خست؛ بۆ سبەینێ دوای نیوەڕۆ لە باڵەخانەکەی خۆمدا، بەڵام پێوەندییەکەمان هێندە سەرکەوتوو نەبوو وەکوو جاری پێشوو، وامدەزانی ئەو- کە لە نێوان شەووڕۆژێکدا خەوتووە- بووە بە ژنێکی لێهاتوو، زیاتر لەوەی منداڵێک بێت.
ئەو تووشی هەڵامەت بوو، منیش بە هۆی ئەوەوە تووشی بووم، بۆیە وادەی چوارەمم لەگەڵیدا هەڵوەشاندەوە، هەرچەندە هەستم بە داخێکی زۆر نەکرد کە زنجیرەیەک پێوەندیی گەرمم پچڕاند، کە خەریک بوو هەڕەشەی شکستهێنانی هیوایەکی تاڵی لێ دەکردم.
پێم باش بوو مۆنیکی ناسک و باریک بەم شێوەیە بمێنێتەوە، لە ناخمدا وەکوو پەرییەکی برسی لە سێکسی منداڵی بدرەوشێتەوە چەشنی کەسایەتیی لەشفرۆشێکی لێهاتوو.
ناسینی مۆنیک بۆ من بووە هۆی ئەوەی بە دوای پێوەندیی لەگەڵ کچانی هاوشێوەیدا بگەڕێم، بۆیە ڕیکلامێکی تەمومژاوی لە یەک لە گۆڤارە ڕووتەکاندا، ئاراستەی نووسینگەی (مێدمۆزێل ئەدیس)ی

کردم، ئەویش کۆمەڵێک وێنەی پیشان دام بۆ ئەوەی دانەیەکیان هەڵبژێرم، کاتێک کۆمەڵەوێنەکەم لا کردەوە، توانیم ئارەزووی تاوانکاری و شێتانەکەی خۆمی پێ ڕابگەیەنم، هەستم کرد خەریک بوو دەرمبکاتە دەرەوە، بەڵام بە دوودڵییەکەوە پرسیاری کرد، دەتوانی چەند پارە بدەیت، کاتێک بینی پارەیەکی باش دەدەم، ڕازی بوو بەوەی پەیوەندیی بە کەسێکەوە بکەم (کەسێک کە شتێکم بۆ ڕێک بخات.)

لە ڕۆژی دواتردا چاوم بە پیرەژنێک کەوت، بە بۆیە ڕووخساری خۆی شێواندبوو، لێواری پەنجەکانیم سووکەڵەیەک ماچ کرد، تاکوو شتێکی باشم پێ بدات، دواتر بۆ ماڵێکی پەڕپووتی بردم، لە هۆڵەکەدا پەردەیەکی لا برد و لە پشتییەوە منداڵێکی قەڵەوی ڕۆحسووک دەرکەوت، تەمەنی لە خوار پازدەساڵەوە بوو، پەلکە ڕەشەکانی بە شریتی سوور بەستبوو، بێتاقەتانە باوەشی لە بووکەشووشەیەک دابوو.

کاتێک بە هێمای ڕەتکردنەوە سەرم لەقاند و هەوڵم دا لەو تەڵەیە دەربچم، پیرەژنەکە جلی کچەکەی کردەوە بۆ ئەوەی جوانیی لەشی پەرییەکم نیشان بدات، بەڵام ئەو تەنیا قسەی خۆی بە هەدەر دەدا، کاتێک زانی سوورم لەسەر ڕۆیشتن، گرتمی و داوای پارەی کرد، لەو کاتەدا دوو پیاوی گەورە هاتنە ژوورەوە و سەرقاڵی گفتوگۆیەکی قووڵ بوون، یەکیان چاویلکەیەکی ڕەشی لە چاو کردبوو، پیرەژنەکە گوتی: "ئەو پیاوە ئەفسەر بوو لە **پۆلیسی ڕەوشت**، بۆیە باشتر وایە ئەوەی پێویستە، بیدەی پێم." ڕووم کردە کچە بچووکەکە، کە بەرەو چێشتخانەکە ڕۆیشتبوو، بۆ ئەوەی خوانی ئێوارەی تەواو بکات، چونکە بە هۆی هاتنی منەوە خواردنەکەیان لێ بڕیبوو، تاکوو

بووکەشووشەیەک بگرێت بە دەستییەوە، بە بەزیییەوە پارەکەم کردە نێو دەستی منداڵەکە و دیارییەکەی لێ وەرگرتم و ڕاستەوخۆ پارەکەی بە پۆلیسەکە دا، پیرەژنەکە و هاوڕێکەی بە پەلە پەلکێشی دەرەوەیان کردم.

## ٧

نازانم، ئەو ئەزموونەی لە نووسینگەی مێدمۆزێل ئەدیسدا (بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییەکی باشی سێکسی) بینیم ئایا زنجیرەیەکی تر بوو لە زنجیرەکانی قەدەرە تەمومژاوییەکانم؟! بەلام لە دوای ئەو ڕووداوەوە بڕیارم دا هاوسەری پێک بهێنم، چونکە بۆ من باشتر بوو، بیرۆکەی ئەوەم بۆ هات کە کەشی ژیانی هاوسەری هاوکاریم دەکات، تەنانەت ئەگەر نەشتوانێت دەروونم لەم حەزە سێکسییە ناشیرین و پیسەیش ڕزگار بکات ئەوا لەژێر چاودێرییەکی دروستدا دەبم.

پێم وا بوو کەشی ماڵەوە هاوکاریم دەکات لە ڕێکخستنی ژیانی ڕۆژانەم، لە خواردنی ماڵەوە و چاودێریی چالاکیی هاوسەری، لەوانەیە کەشێکی گونجاو لە ڕەوشتی ڕۆحی دروست ببێت و ئارەزووە نارەواکانم قەرەبوو بکاتەوە.

دەستم بە گەڕان کرد بە دوای هاوسەرێکی گونجاودا و دوای بیرکردنەویەکی زۆر، کچی دوکتۆر (بۆلۆنی)م دەستنیشان کرد. هێندێک جار کە باری تەندروستیم تێک دەچوو و تووشی سەرەگێژە و تێکەڵبوونی گەدە دەبووم، ئەو چارەسەری دەکرم، زۆر جار یاریی شەترەنجم دەکرد و ئەویش بە دزییەوە سەیری دەکردم. لێرەدا

پێویستە ئەوە بڵێم کە هەرچەندە تووشی ئەو نەهامەتییانە بوو
بەڵام هێشتا پیاوێکی سەرنجڕاکێش و جوان و باڵابەرز و قژزەردم
دیمەنێکی جوانی تایبەتم هەیە.
ئەوەیشم دەزانی کە تەنیا بە یەک هێمایەکی پەنجەم دەمتوانی
ئارەزووم لە هەر ژنێک بێت بە دەستی بهێنم، بەڵام هەمیشە زۆر
ئاگا نەبووم لەو ژنانە و گرینگیم پێیان نەدەدا و دوایان نەدەکەوت
ئەوان خۆیان دەهاویشتە باوەشە ساردەکەمەوە.
ئەگەر فەرەنسییەکی چین ناوەندی ئاسایی بام، دەمتوانی یەک لە
ژنە لەشپڕانە بە دەست بهێنم، کە زۆر لە **ڤالێریا** وروژێنەرتر بوون
بەڵام من ئەوم بە ناچاری هەڵبژارد، چونکە گەیشتم بە چارەسەرێک
ناوەند لە نێوان بەزەیی بە **ڤالێریا** و نامۆیی سێکسی خۆم بۆ ئەوەی
تووشی کارێکی نەخوازراو نەبم، ئیتر بۆیە هەڵمبژارد.
هەرچەندە بەرەو پێش دەڕۆیشتم، بەڵگەکان ئاستی گێلیی **هەمبرت**
**هەمبرت**ی (کە منم) لە بواری سێکسدا بۆ دەسەلماندم.

**٨**

هەرچەندە من دەمگوت کەشی خێزانی ئاسایی دەتوانێت هەست
سێکسییە نامۆکانم هێور بکاتەوە، بەڵام ئەوەی لە **ڤالێریا** سرنجی
ڕاکێشام، ئەوە بوو دەیتوانی دیمەنی خۆی وەکوو منداڵێکی هەرزەکار
پیشان بدات. ئەو بە مەبەستەوە شێوەی خۆی وەکوو هەرزەکارەکان
لێ دەکرد، چونکە هەستی بە ئارەزووەکانم دەکرد، لەسەر ئەو
شێوازە کەوتمە داوی **ڤالێریا**.

ڤالێریا تەمەنی بیست ساڵ بوو، بە تەواوەتی نەمدەزانی تەمەنی
چەندە، لە دۆخێکی نەزانراودا پەردەی کچێنیی لە دەستدا بوو، هەرگیز
لەو دۆخە تێنەگەیشتم، چونکە هەرجارێک کە باسی ئەو دۆخە
بکردایە چیرۆکەکەی بە پێی میزاجی خۆی بە شێوەی جیاواز باس
دەکرد.

لە ڕاستیدا تا بڵێی لەگەڵیدا گێل بووم تا ئەوپەڕی سنوور، چون
توانای ئەو بۆ خۆدەرخستنی خۆی وەکوو کچۆڵەیەک کوێر
کردبووم، وەکوو کچۆڵەیەک هەمیشە جلێکی دەپۆشی کە بەشێ
زۆری قاچە نەرمۆڵە و سپییەکانی دەردەخست، لە ڕێی لەبەرکرد
جلی ڕەشەوە دەیزانی سپێتیی پێستی دەربخات، وەکوو منداڵێ
هەرزەکار کە ژیان لە سینەیدا هەڵگیرساوە، دەیزانی چۆن ناز دەک
و چۆن نازاوی دەربکەوێت و دەست بە قژە زەردەکەیدا بهێنێت.

لە دوای ئاهەنگێکی مەدەنییانەی گواستنەوە، بردم بۆ ماڵە تازەک
خۆم، گرتمە باوەشمەوە و بەر لەوەی هیچی لەگەڵدا بکەم کراس
کچۆڵەیەکم کردە بەری، کە پێشتر لە شوێنێکدا دزیبووم.

لە شەوی هاوسەرێتیدا یاریی زۆر خۆشم کرد، شەو کۆتایی هات
ڕۆژ هەڵهات، بووکە گەمژە تازەکەیش لە حاڵەتی هستیریادایە.

کاتەکان زۆری پێ نەچوو، ژنەکەم گەڕایەوە بۆ ژنێتیی ڕەسەن
نیشانەی کچێتی لە ڕووخساریدا ون بوو، زۆر بە خێرایی
دەرکەوت کە لە بری ئەو کچە لاواز و ڕووخسار زەردهەڵگەڕاو
کە هەمیشە خەیاڵم بۆی دەڕۆیشت ژنێکی گەمژەی قاچکور
مەمکزلی بێمێشکم خواستووە.

ماوەی هاوسەرێتیم لەگەڵ ڤالێریادا لە ساڵی ١٩٣٥ەوە تا ٣٩
بەردەوام بوو، گومان لەوەیش نییە کە ئەویش بۆچوونەکانی لە ئا

مندا شکستی هێنا، بەڵام ئەو بە کاری ناوماڵەوە خۆی دەرباز کرد و
کەم جار شەوان لەگەڵمدا بێدار دەبوو و ڕۆژنامەی (باڕی سوار)ی
دەخوێندەوە و منیش بە یەک لە ئارەزووەکانمەوە سەرقاڵ دەبووم، ت
بارێکی زۆر پێویست نەبوایە، هەرگیز ڕووم لە جەستەی نەدەکرد. ل
هەمان کاتیشدا شتێک هەبوو تا سنووری شێتی دەیورووژاندم، ئ
دوکانەی بەرانبەر ماڵمان خاوەنەکەی کچۆڵەیەکی هەبوو هەمیش
گڕی بۆ جەستەم دەهێنا، ئەگەر ڤالێریای هاوسەرم نەبوای
نەمدەتوانی شێوەیەکی ڕێپێدراوم دەست بکەوێت بۆ ئەوەی هەڵچوو
سەختەکانم هێور ببنەوە.
هێندەی پێ نەچوو داوام لە ڤالێریا کرد چیتر خواردن دروست نەکا
ڕوومان دەکردە چێشتخانەیەکی قەرەباڵغ لە شەقامی پۆناپەر
سفرەی سەر مێزەکانی هەمیشە پەڵەی شەراب و چەوری پێوە بو
تا ڕادەیەک ژیان بە ئارامی بە ڕێوە چوو، تا ئەو کاتەی قۆناغ
تەقینەوەکان دەستی پێ کرد- لە هاوینی ساڵی ١٩٣٩ بوو، کات
مامم لە ئەمەریکا گیانی لە دەست دا و چەند هەزار دۆلارێکی
بەجێ هێشتم، بەو مەرجەی ڕوو بکەمە ئەمەریکا و لەوێ بژیم
ئاگاداری کەمپانیای بۆنەکەی ببم کە دایمەزراندبوو.
پێشوازیم لەم گۆڕانکارییە کرد، ژیانم پێویستی بە هەژانێک هەبو
چونکە کەڕوو بەرەو ژیانی هاوسەرێتیم دزەی دەکرد، لە ماوە
چەند حەفتەی ڕابردوودا تێبینی ئەوەم دەکرد ڤالێریا بە شێوەیەک
نامۆ ناجێگر بووە، زۆر جاریش تووشی هەڵچوون دەبوو، جیاواز
کەسایەتیی ئەو کە هەمیشە ژنێکی ئارام و گەمژە بوو، کاتێک پ
گوت کە بەم نزیکانە ڕوو دەکەینە نیو یۆرک تووشی سەرسوورم
بوو و دۆخی تێک چوو، لەو ڕۆژەوە وەکوو بڵێی ون بووبوو! مات

خەمگین، خەیاڵی دەڕۆیشت، ئەو وەسفانەی لە بارەی ژیانی ئەمەریکاوە بۆیم کرد، سوودیان نەبوو.
دەستم بە ئامادەکارییەکانی گەشتکردن کرد. ڕۆژێکیان لە بەشی پۆلیس هێندێک مامەڵەی گەشتەکەم تەواو کرد و دەرچووین. **ڤالێریا** تووشی گیانلەرزینێکی زۆر سەخت بوو، یەک وشەم لە دەم دەرنەچوو و بێدەنگ بووم، دواتر پرسیارم لێی کرد ئایا تەندروستیت باشە؟ هیچ کوێت ئازاری نییە؟ بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوو، دواتر بە زمانێکی فەرەنسی، کە عەقڵی ڕووکەشی دواکەوتووەکان دایپۆشیبوو، گوتی: "پیاوێکی دیکە لە ژیانمدا هەیە." بێگومان وەکوو هاوسەرێک ئەوەی بیستم شتێکی زۆر ناشیرین بوو، بەڵام نەمتوانی لەسەر شەقامەکەدا وەکوو پیاوێکی دواکەوتوو، کە خۆی بە شەریف دەزانێت، لێی بدەم. هەڵچوونی خۆمم ڕاگرت، چونکە ئازارە نهێنییەکان بە درێژایی ئەو ساڵانە، فێریان کردم چۆن خۆڕاگر بم بەرانبەر بەو کارەی کە هیچ مرۆڤێک ناتوانێت خۆی بگرێت لە بەری، بەڵام هەستم کرد تووڕەبوونێکی گڕدار دامدەپۆشێت، نەک لەبەر خۆشەویستیی مەدام **هەربرت**ی سووک، بەڵکوو لەبەر ئەوەی من پێم وا بوو تەنیا من بڕیار لەسەر ژیانی هاوسەریتی دەدەم لە ڕووی پێوەندیی ڕێپێدراو و ناڕێپێدراو و قەدەغەکراوەوە، تووشی شۆک بووم کە ئەم گەمژەیە ڕۆڵێک دەبینێت لە قەدەر و ژیانی مندا.
کە بینی تیا ماوم، تاکسییەکم بینی کە ماوەیەک بوو لە لێواری جادەکەوە شانبەشانی هەنگاوەکانمان ڕێی دەکرد، ڕامگرت و سەرکەوتین، لەنێو تاکسییەکەدا پرسیارم لێی کرد، دۆستەکەت کێیە، وەڵامی نەدایەوە، بەڵکوو دەستی کرد بە وردەگلەیی و باسی سەختی ژیانی لەگەڵمدا کرد، ئارامم لێ بڕا و بە دەنگێکی بەرزەوە هاوارم کرد

دۆستەکەت کێیە، ناوی چییە، بەڵام ئەو بەردەوام بوو لە زۆربڵێیی و گوتی ڕێوشوێنەکانی تەڵاقم ئامادە کردووە بۆ ئەوەی هەر ئێستا تەڵاقم بدەیت. خۆمم بۆ نەگیرا و بە مشتێک لە ئەژنۆیم دا و گوتم دۆستەکەت کێیە؟ بەبێ ئەوەی یەک وشە لە زاریەوە دەربچێت، یاخود پێڵوویەکی بلەرزێت، سەیرێکی دەموچاوی کردم و وەکوو ئەوەی بڵێت وەڵامەکەی پێویستی بە وشە نییە و شانەکانی هەڵتەکاند و بە پەنجەی ئاماژەی بۆ شۆفێری تاکسییەکە کرد.

ئا ئەم ملئەستوورە دۆستەکەیەتی!

شۆفێرەکە، ئۆتۆمبێلەکەی لە بەردەم قاوەخانەیەکی بچووکدا ڕاگرت و هەرسێکمان دابەزین و پاشان خۆی پێ ناساندم و ناوێکی درێژ و حەنەکئامێزی ئاشکرا کرد و نازناوی کۆلۆنێلی پێشووی سووپای ڕووسیای پێوە لکاند، یەک لەو هەزار ڕووسە سپیانە بوو کە لە پاریس دەژیان و خۆیان بە میراتگری ڕووسیای قەیسەری دەزانی.

لەسەر مێزەکەدا ژنەکەم دەستی کرد بە هاویشتنی قسەی بەفرمێسک و باسی فەرامۆشیی منی دەکرد لە ژیانی هاوسەرێتیدا، گوایە ڕێزم لە کەسایەتیی ئەو نەگرتووە. دۆخەکە زۆر ناخۆش بوو، بە تایبەتی کە شۆفێرەکە **کۆلۆنێل** بە فەرمانێکی بە دەم بزەوە هاوسەرەکەمی بێدەنگ کرد و دەستی کرد بە قسەکردن گوایە بە نیازە بچێتە ژیانییەوە و خۆشی دەوێت. **ڤالێریایش** وەکوو کەسێکی خوار هەژدە ساڵ، لە کاتی پرۆسەی گۆڕینەوەی سەرپەرشتیارێکی کۆن و سەرپەرشتیارێکی نوێدا، سەیری من و ئەوی دەکرد.

هەرچەندە زۆر تووڕە بووبووم تەنانەت نەمدەزانی باسی چیم بۆ دەکات، بەڵام سوێند دەخۆم کە ئەو شۆفێرە پرسیاری هەموو وردەکارییەکی **ڤالێریای** لێ کردم، لە چۆنێتیی خواردنی و تەنانەت

پرسیاری سووری مانگانەکەیشی لێ کردم و ئەو کتێبانەیش کە ئارەزوویان دەکات.

سنوورێکم بۆ ژیانی ئەم هاوسەرێتییە دانا، داوام کرد **ڤالێریا** لە ماڵەکەی مندا نەمێنێت و کەلوپەل و کەرەستەکانیشی ببات. کۆلۆنێلی ناوبراو، پیاوانە بڕیاری دا شتەکانی بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی بگوازێتەوە.

پێکەوە چووین بەرەو ماڵەوە و بە درێژاییی ڕێیەکە **ڤالێریا** بۆڵەی هات، منیش تیا مابووم و پرسیاری ئەوەم لە خۆم دەکرد ئایا بیکوژم یان دۆستەکەی بکوژم، یانیش هەردووکیان پێکەوە بکوژم، یاخود وەکوو دوو گیانەوەر لە توێی پەڕەکانی ژیاندا بەجێیان بهێڵم.

لێرەدا قۆناغی گەنجێتیم بیر کەوتەوە، کاتێک دەمویست بە دەمانچەیەک برادەرێکی خۆم بکوژم بۆ ئەوەی لەگەڵ خوشکەکەیدا ڕاببوێرم، چونکە خوشکەکەی لە جۆری پەرییەکان بوو. شەیتانی لە جەستەمدا ورووژاندبوو، بەڵام دوای ئەوەی ئەو یادگارییەم بۆ خۆم نمایش کرد، بڕیارم دا کە **ڤالێریا** شایەنی ئەوە نییە نە بە گوللە و نە بە خنکاندنیش بیکوژم. لە ماڵەوەیش کاتێک شتەکانی **ڤالێریایان** کۆ دەکردەوە، وەکوو تەماشاکەرێکی گەمژە لە شانۆگەرییەکدا بووم. نواندنێکی باڵای نمایش دەکرد.

کاتێک لە ماڵەکەم دەرچوون زۆر تووڕە بووم، چونکە بە شێوەیەک ڕەفتاری دەکرد کە هیچ شتێک ڕووی نەداوە و من کەسێکی گرینگ نیم بۆ ئەو، بیرم لەوە کردەوە دوای بکەوم و بیکوژم. سەیرێکی دەوروبەری خۆمم کرد و بە دوای چەکێکدا گەڕام و ڕووم کردە موبەقەکە، بۆ ئەوەی چەکێکی باشتر بدۆزمەوە، بەڵام گسک و چەقۆکانم بە دڵ نەبوون، بەبێ چەک ڕووم کردە شەقامەکە و بڕیارم

دا به دەستی بەتاڵەوە هێرش بکەمە سەری، هەرچەندە وەکوو پێکهاتە لە من بەهێزتر و گەورەتر بوو، بەڵام لە شەقامە چۆڵەکەدا کەسم نەبینی و شوێنەواری ئەو کەسەیشم نەدۆزییەوە کە هاوسەرەکەمی برد، تەنیا قوپچەیەکی **ڤالێریام** بینی لەنێو قوڕەکەدا، کە ماوەی سێ ساڵ لەنێو قوتوویەکی شکاودا هەڵیگرتبوو.

دواتر هیچ شتێکم لە بارەیانەوە نەزانی، جگە لەوەی کە چووبوون بۆ کالیفۆرنیا و زانایەکی ئەمەریکیی پسپۆڕ لە بواری (ڕەگەزەکانی مرۆڤ)دا بەکرێیانی گرتبوو، بۆ ئەوەی تاقیکردنەوەی کاردانەوەی سێکسییان لە ئاست خۆراکی مۆز و خورمادا لەسەر بکات، ئەوەیش بە مەرجێک مرۆڤ دەبێت بە درێژاییی کات لەژێر تاقیکردنەوەدا بێت: بە پێوە، یاخود لەسەر هەر چوارپەلی.

لێکۆڵەرەوەکەم کە دوکتۆرێک بوو، سوێندی بۆ خواردم **ڤالێری** و پیاوە پیرە کۆلۆنێلەکەی و چەند کەسێکی داماوی دیکەی بینیون، وەکوو ئاژەڵ لەسەر قاچ و دەستیان ڕێیان کردووە بۆ ئەو زانایەی کە بە کرێی گرتبوون.

زۆر هەوڵم دا دەرئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەیەم لە گۆڤاری (ئینتەرپۆلۆجی)دا دەست بکەوێت، بەڵام بێسوود بوو، پێ دەچێت دەرئەنجامی توێژینەوەکە پێویستی بە کاتێکی زیاتر بووبێت.

# ٩

ڕێوشوێنەکانی جیابوونەوەم لە **ڤالێریا** گەشتەکەی ئەمەریکای دوا خست و نەمتوانی پێی بگەم و ناچار بووم زستانی ئەو ساڵە لە پورتوگال بەسەر بەرم.

لە نیو یۆرک کارێکی ئاسانم گرتە بەر، کە بریتی بوو لە بڵاوکردنەوەی ڕیکلام بۆ بۆنی کۆمپانیاکەی مامم. لە هەمان کاتدا یەک لە زانکۆکانی نیو یۆرک داوایان لێ کردم (نووسینەکەم لە بارەی مێژووی ئەدەبی فەرەنسی)یەوە تەواو بکەم، کە کاری بەشی یەکەمی بۆ ماوەی دوو ساڵ چەندان کاتژمێری درێژی خایاند. ئەگەر بە بیرەوەرییەکانمدا بگەڕێمەوە بۆ ئەو سەردەمە، وای دەبینم کە بووە بە دوو بەشەوە، کاتژمێرەکانی ڕووناکیی فرە و کاتژمێرەکانی تاریکیی سەخت، کاتژمێرە ڕووناکەکان ئەو کاتانە بوو کە لە کتێبخانە گشتییەکاندا کارم بۆ لێکۆڵینەوەکان دەکرد، کاتژمێرە تاریکەکانیش نیشانەی ئارەزووە گڕگرتووەکانم بوو کە ماندووبوونێکی زۆری لەگەڵدا بوو.

پێ دەچێت خوێنەر ئێستا باشم بناسێت و بە ئاسانی دەزانێت چۆن دەسووتام، کاتێک هەوڵم دەدا سەیری جەستەی هەرزەکارە هارەکان بکە لە باخچە گشتییەکاندا. بە داخەوە دوور لە من یارییان دەکرد، لە بەرانبەر باش دەزانێت چەند بێزم لە کچە پێگەیشتوو و لێهاتووەکان دەهاتەوە، کاتێک لەگەڵ کەسێکی نابووتدا یارییان دەکرد.

بۆ ئەوەی نموونەیەک بێنمەوە، بۆیە بە خوێنەر دەڵێم ئەو حاڵەتە تووش هەرسهێنانی تووڕەیی دەکردم، ڕەوانەی نەخۆشخانەی دەروونی کرام نیزیکەی ساڵێک زیاترم لەوێ بەسەر برد، کاتێک کە گەڕامەوە بۆ ئەوە کارەکەم تەواو بکەم، هێندەم بێ نەچوو دیسانەوە گەڕامەوە بۆ نەخۆشخا لێرەدا پزیشکەکانم پێیان وا بوو ژیان لە هەوایەکی پاکدا لەوانە چارەسەرێکم بۆ بکات، لە نێوان پزیشکەکانیشدا گەنجێکی قسەخۆ و نوکتەچی و قسەلەڕوو هەبوو، بە ڕیشێکی سوورەوە، زۆر گرینگ

پێ دەدام و لەگەڵ نێردەیەکدا بە سەرۆکایەتیی براکەی بۆ ناوچەی جەمسەری کەنەدای ناردم، بۆ ئەوەی هەڵچوون و کاردانەوە دەروونییەکانی ژیان لەو جەمسەرەدا تۆمار بکەم.
لەگەڵ نێردەکەدا ڕۆیشتم و لەگەڵ دوو گەنجی زانای ڕووەک و دارتاشێکی پیردا بووم بە هاوڕێ، دوکتۆر **ئەنیتا** زۆر دڵخۆشی دەکردین، پسپۆڕی خۆراک بوو لە نێردەکەدا، خۆشحاڵم بەوەی هێندەی پێ نەچوو گەڕایەوە بۆ ئەمەریکا.
هەرچەندە من لەگەڵ نێردەکەدا کارم دەکرد، بەڵام هیچ بیرۆکەیەکی تەواوم لە بارەی ئامانج و هۆکاری کارکردنییانەوە نەبوو، کارەکانی تەمومژاوی دەهاتنە بەر چاوم، بە تایبەتی کە گرووپێک لە نێردەکە بە هاوبەشی لەگەڵ کەنەدییەکان کاریان لە وێستگەیەکی کەشوهەوادا دەکرد، گرووپێکی دیکەیشیان ماسییان کۆ دەکردەوە، گرووپی سێیەمیشیان توێژینەوەیان لە ڕەوشی نەخۆشیی سیل دەکرد لە بیابانی (توندرا)ی بەفریندا.
لە کاتی مانەوەمان لەو ناوچە جەمسەرییەدا، لەنێو چەند ماڵێکدا بووین لە دار دروست کرابوو، بێدەنگییەکی زۆر سەختی هەبوو، سەرەڕای ئەو تەنیایی و بێتاقەتییە، تەندروستیم بە شێوەیەکی سەیر چاک بووەوە، بە شێوەیەکی نامۆ هەستم کرد کە لە خودی خۆم جیا بوومەتەوە، چونکە هیچ شتێک نەبوو لەوێ بمورووژێنێت، کچانی ئەسکیمۆ کە بۆنی ماسییان لێ دەهات و قژی ڕەشیان هەبوو، لە باڵی قەلەڕەش دەچوون، ڕووخساریان بە بەراز دەچوو، تەنانەت لە دوکتۆر **جۆنسون** کەمتر دەیانورووژاندم، پەرییە هارەکان جۆرێکن، لە ناوچەی جەمسەرەدا بوونیان نییە.

هاوڕێیەکانم شیکارییان لەسەر گۆڕانکاری بەستەلەک و ڕووناکییەکانی جەمسەر و ڕووداوە سروشتییەکان دەکرد، لە سەرەتادا بە جددی ویستم کاردانەوەکانی دەروونی تۆمار بکەم لەو جەمسەرەدا، (بە تێبینیوەرگرتن ئەوەم کرد کە خەونەکان لە کاتی خۆری نیوەشەوی جەمسەرەکە زۆر ڕەنگاوڕەنگە)، دەبوایە پرسیارم لە هاوڕێیەکانم بکەم لەسەر هەستەکانیان و ترس لە ئاژەڵە نەناسراوەکان و ئارەزووی خواردن و خەیاڵەکانیان لەسەر دەنگە نەناسراوەکان... هتد، بەڵام هەموویان بێتاقەت بوون لە پرسیارەکانم و بە تەواوەتی وازم هێنا و ڕاپۆرتەکەم نەنووسی، تا ئەو کاتەی ماوەی بیست مانگەکەم تەواو کرد، دواتر بۆم دەرکەوت کە نێردەکە بۆ کارێکی نهێنی ئەو گەشتەیان کردبوو و هیچ پەیوەندیی بە ڕەوشی خۆراک و باری دەروونی و ئەو شتانەی ترەوە نەبوو.

پێ دەچێت خوێنەر بەداخ بێت، ئەگەر بزانێت لە دوای گەڕانەوەم بۆ جیهانی سەردەمیانە و شارستانی، تووشی شەپۆلێکی دیکەی شێتی بووم، ئەمە ئەگەر بگونجێت ناوێکی وا بەرجەستەی لێ بنێم وەکوو (شێتی)، هەستم بە نێچیربوون دەکرد و وامدەزانی سەرکوت کراوم.

بەڵام من قەرزاری چاکبوونەوەی ئەو نەخۆشییەم، بەوەی گەیشتم بە دۆزینەوەی شتێک، کاتێک لەو نەخۆشخانە گرانبەهایەدا بووم، کانییەکی پڕ خۆشیم دۆزییەوە، بەوەی زانایانی دەروونی هەڵبخەڵەتێنم و خۆم بە بێتاوان پیشان بدەم و بەرەو بۆچوونێکی دیکەیان بەرم، تاکوو بگەن بە ئەنجامێک کە هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نەبێت (بەبێ ئەوەی ڕێیان پێ بدەم هەست بەوە بکەن نهێنیی پیشەکەیان دەزانم) هێندێک خەونی خۆمم دادەهێنا لەسەر هێندێک حاڵەت کە هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نەبوو، باسی هێندێک شتم

بۆیان دەکرد کە گوایە لە کاتی زیندەخەوندا دەیانبینم، بەبێ ئەوەی هیچ ڕێیەکیان پێ بدەم لە بارەی ڕاستیی هەستە سێکسییەکانمەوە.
لە ڕێی پێدانی بەرتیلەوە بە پەرستارێک، توانیم بکەم بە ڕاپۆرتی نهێنیی دوکتورەکان، کە لەسەر تیشکی چارەسەرکردنم تۆماریان کردبوو، هەستێکی خۆشم بۆ دەهات کە ببینم هێندێکیان منیان لە ڕیزی ئەو کەسانە پلەبەند کردووە کە لادەری سێکسین، بەڵام هێندێکیان منیان لە ڕیزی کەسانی پاک و بێگەرد پلەبەند کردبوو.
وەرزشکردنەکەم لەگەڵ ئەو دوکتورانەدا کارێکی زۆر باش بوو، بە هۆیەوە توانیم لە دوای چاکبوونەوەم مانگێکی زیاتر بمێنمەوە و خواردنێکی خۆش و خەوێکی ئارامم دەست بکەوێت، دوای مانگەکەیش حەفتەیەکی دیکەیش مامەوە و بە نهێنییەوە بە دوکتورێکی بەناوبانگ پێدەکەنیم، کە بەم دوایانە بۆ ئەو نەخۆشخانەیە گواسترابووەوە.

## ١٠

لەو نەخۆشخانەیە دەرچووم و بە دوای گوندێکی بێدەنگ و ئارام یاخود شارۆچکەیەکی بچووکدا دەگەرام، تاکوو هاوینی تێدا بەسەر بەرم و نووسینە ئەدەبییەکەم تەواو بکەم و لە زەریاچەیەکی نزیکیشدا مەلەوانی بکەم.
کارەکەم سەرلەنوێ باڵی بەسەرمدا پۆشی، سەبارەت بە پشکی من لە بارەی کاری ڕیکلامەوە، بۆ کەرەستەکانی بۆن لە کەمپانییەکەی مامم، کاروبارم بەرەو لاوازی دەچوو.

بۆ وەڵامی پرسیارەکانم یەک لە فەرمانبەرەکانی پێشووی مامم پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم، کە لە ماڵی مستەر **ماک کۆی**- ئامۆزا هەژارەکەیدا، مانگەکانی هاوین بەسەر بەرم. باسی لەوەیش کرد ئامۆزاکەی دوو کچی هەیە، یەکیان کورپەلەیە و ئەوی دیکەیان دوازدەساڵە و باخچەیەکی جوان لە نێزیک ماڵەکەیاندایە و دریاچەیەکی نزکیشیان هەیە، بەم شێوەیە پێشنیارەکەیم بە دڵ بوو.

دوای گۆڕینەوەی چەند نووسینێک، بە ڕێکەوتن گەیشتین. بە شەمەندۆفێر بە ڕێ کەوتم، بەڵام شەوێکم لە شەوەکان بە ڕێ کرد، هەر بیرم لە جوانیی ئەو کچە هەرزەکارە هارە دەکردەوە، کە لە ماڵی ماک کۆیدایە و بە زمانە فەرەنسییەکەم دەستبازیی لەگەڵدا دەکەم و بە شێوازی هەمبەری لێی نێزیک دەبمەوە (کە خوێنەر دەزانێت چ شێوازێکە.)

کەس لە وێستگە بچووکەکەدا پێشوازیی لێ نەکردم. کاتێک لە شەمەندۆفێرەکەوە بە جانتایەکی قورسەوە ڕووم کردە هۆتێلەکە، لە ناکاو پیاوێکی بە دیمەن ئاسایی و بەرچاو- هەموو لەشی تەڕ بووبوو- پێی گوتم ئێستا ماڵەکەی سووتاوە (لەوانەیە بە هۆی ئەو گڕە گەرمانەی خوێنی منەوە بووبێت کە بە درێژاییی شەو دەیسووتاندم) ئەو کەسەیش ماک کۆی خۆی بوو، پێی گوتم ڕووی کردووەتە بیستانێکی تر و برادەرێکی ژنەکەی بە ناوی **مسز هێز** پێشنیاری ئەوەی کردووە پەنایەکت پێ بدات.

بیرم لەوە دەکردەوە بگەڕێمەوە، چونکە ئەو خۆشییەی لە زەینی خۆمدا دامنابوو لە ماڵی ماک کۆدا بە دەستی بهێنم لەناو چوو. هەستم بە تووڕەیی و بێزاری کرد، بەڵام وەکوو کەسێکی ئەورووپی و ڕەوشتجوان نەمتوانی سەردانی ماڵی **مسز هێز** نەکەم. بە

ئۆتۆمبیلێکی ڕەش و شۆفێرێکی ڕەشپێستەوە، کە ماک کۆ لە ماڵێکی دراوسێیانەوە وەری گرتبوو، ڕووم لە ماڵی **مسز هیز** کرد.
لە ڕێ لەگەڵ خۆمدا سوێندم خوارد کە لەم شاری ڕامسدێلە نەمێنم و بۆ سبەینێ بە فڕۆکە ڕوو بکەمە بەرمۆدا یاخود بۆ بەهاما، یاخود هەر شوێنێکی دی بێت، چونکە ئەگەری دۆزینەوەی کەناری زەریای خۆش لە خەیاڵمدا هەبوو، هەرچەندە ئەو فەرمانبەرە لە ڕێی باسکردنی کچێکی دوازدەساڵەوە توانی ئاراستەی شەمەندۆفێری خەیاڵەکانم لە کەنارە خۆش و گەرمەکان بگۆڕێت، بەڵام ئێستا دیسانەوە وێنەی ئەو کەنارانە هاتنەوە خەیاڵم.
لە کاتی گەیشتنمان بە نیزیک ماڵی **مسز هیز** خەریک بوو سەگێک بەژێرەوە بکەین. خانووەکەی **مسز هیز** یەک لە خانووە ناشرینەکان بوو، بە ڕەنگێکی سپی و پیس بۆیە کرابوو، بە خانوویەکی کۆن دەچوو، لە دیمەنەکەیدا دیار بوو کە گەرماوەکەی لە بری ئاوپڕژێن سۆندەی تێدا بێت.
بە پەلە بەخشیشم بە شۆفێرەکە دا، بۆ ئەوەی لەو ناوە نەمێنێت، تاکوو زوو بگەڕێمەوە، بەڵام شۆفێرەکە لە کاتی پێچکردنەوەیدا پیرەژنێک بانگی لێ کرد و وەستا بۆ ئەوەی وەڵامی بداتەوە، منیش ناچار بووم لە زەنگی دەرکە بدەم، خزمەتکارێکی ڕەشپێست دەرکەی کردەوە و لەبەر دەرکە بەجێی هێشتم و بە پەلە ڕووی کردە چێشتخانەکە و فریای سووتانی شتێک کەوت.
کەلوپەلی هۆڵەکە تێکەڵەیەک بوو لە کەرستەی داری مەکسیکیی بازرگانی، نیشانەی ئەوە بوو کە خاوەنماڵەکەی لە چینی ناوەندن و شارەزاییەکی تەواویان لە کەشی ئەو چینە و جەمکەکانیان هەیە. لە

ناکاو گوێم لە دەنگی مسز هیز بوو، لەسەر پەیژەکانەوە سەری خوار کردەوە و گوتی:
- جەنابت مستەر هەمبەرتی؟
پرسیارەکەی لە ئاسمانەوە لەگەڵ سوتووی جگەرەکەی بەر بووەوە، هێشتا وەڵامیم نەدابووەوە، لە پەیژەکانەوە بە سەندەڵێکی سوور و کراسێکی قاوەیی و قەمیسێکی ئاوریشمینی شین و دەموچاوێکی چوارگۆشەوە خۆی خزاندە خوارەوە.
پێم باشە هەر ئێستا وەسفی بکەم بۆ ئەوەی خوێنەریش ڕزگار بکەم لێی:
تەمەنی لە ناوەڕاستی سییەکان بوو، لە پاییزی تەمەنیدا بوو. نێوچەوانێکی گەش و برۆیەکی کەوانەیی هەبوو، دیمەنی سادە بوو، ناشیرین نەبوو، لەو ژنانە بوو کە هەڵبژاردەیەکی ناوەندن، لە نێوان ژنی ئاسایی و ئەو ژنانەی کە لە **مارلین دیتریش** دەچوون.
بۆ ماوەیەکی کورت باسی سووتانی ماڵی ماک کومان کرد و دواتر باسی شتە باشەکانی ژیانمان کرد لە شاری ڕامسدێل. بینیم دوو چاوی سەوزی هەبوو بە شێوەیەکی سەیر دیقەتی دەدا، لە سەرەوە بۆ خوارەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا خۆی لە یەکگرتنی نیگاکان لا دەدا.
لەسەر قەنەفەکە دانیشت و قاچێکی خستە ژێر خۆیەوە و قاچەکەی دیکەیشی بە ئازادی ڕاکشاند، بە ڕوونی لەو ژنانە بوو کە لە قسە لووس و ڕێکوپێکەکەیەوە بۆت ئاشکرا دەبوو، سەر بە یانەیەکی ئەدەبی یان خێرخوازی یاخود ئەو ڕێکخراوە ئاساییە ناخۆشانەیە، کە بە شێوەیەکی کوژەر مرۆڤ وەڕز دەکەن. هەمیشە ڕۆح و دەروونی خۆیان ئاشکرا ناکەن، لە ڕیزبەندی ئەو ژنانە بوو، کە بە شێوەیەکی تەواو بێبەش بوو لە ڕۆحی نوکتە و گوێنەدەر لە دەیان

ئەو بابەتانەی کە لە کوافیرەکاندا بە گەرمی باسی لێوە دەکرێت، بەڵام
ئەم جۆرە لە هەمان کاتدا بە ئاگا بوون لە چۆنێتیی قسەکردن لەگەڵ
پیاواندا، بۆ ئەوەی پیاو نەوروژێنن.
لە یەکەم چرکەوە درکم بەوە کرد، ئەگەر لە ماڵەکەیدا بژیم بەو
شێوەیە ڕەفتارم لەگەڵ دەکات کە پەنای داوم، جارێکی دیکەیش
دەکەومە نێو ئەو جۆرە پێوەندییە خۆشەویستییە ناشیرینانەی کە
پێشتر بینیومە و باش دەیزانم.
بۆیە مەسەلەی مانەوەی من لە ماڵەکەی نەبووە جێی باس، بەڵام من
بەردەوام بووم لە قسەکردن لەگەڵیدا و چووینە سەرەوە بۆ ئەوەی
سەیری ئەو ژوورە بکەم کە بە نیازە بە کرێ بیداتە من، لە ناخی
خۆمدا بە شێوەیەکی ڕەها ڕەتم کردەوە، ژوورەکە بە ژووری
خزمەتکارەکان دەچوو، هێندێک کەرەستەی بێبەهای تێدا بوو، بەڵام
ئەو دەیگوت کە وەکوو نیمچە ستۆدیۆیەکە، لە ناخی خۆمدا وا بڕیارم
دا هەر ئێستا ئەو شوێنە بەجێ بهێڵم.
خۆم وا پیشان دەدا کە بیر لەو کرێ هەرزانە دەکەمەوە کە **مسز هیز**
بۆ ژوور و خواردنەوە دیاری کردووە.
بەڵام وەکوو کەسێک لە جیهانی ئەورووپیی کۆن، پەروەردەکردنەکەم
وای لێ کردم بەردەوام بم لەگەڵیدا- لە سەیرکردنی ئەو بەشەی کە
ژوورەکەی خۆم و ژوورەکەی **لۆلیتای** تێدایە (لەو کاتەدا وامدەزانی
**لۆلیتا** ناوی خزمەتکارەکەیە.)
**مسز هیز** بۆ نەختێک پشوودان دەستی خستە سەر دەستم و گوتی:
- پێم وا بێت شوێنەکەت بەدڵ نەبوو!
وەستانەکەی لەو شێوە وەستانانە بوو کە خۆی بە وروژێنەر لە
قەڵەم دەدا، لەگەڵ کەمێک شەرمدا.

بەردەوام بوو لە قسەکردن:

ـ من دان بەوەدا دەنێم کە ماڵەکە حاڵی باش نییە، بەڵام من دڵنیات دەکەمەوە (لەو کاتەدا سەیری لێوی دەکردم) لای ئێمە ئاسوودە دەبیت، با باخچەکەت پیشان بدەم.

بە دوودڵییەکەوە لە پەیژەکانەوە دابەزیم و بەرەو هۆڵەکە: ژووری خواردنەکەمان تێپەڕاند، لەوێدا دەرکەیەکی کردەوە: یەک پارچە سەوزایی بوو. کاتێک چوومە باخچەکەوە، هەستم بە شەپۆلێکی زەریا کرد لە دیوارەکانی دڵی دەدام و دەپشکایەوە، لەژێر ڕووناکیی خۆرەکەوە و لە نێزیک مەلەوانگەکەوە خۆشەویستەکەی **ڕیڤێرام** بینی؛ لەژێر چاویلکە ڕەشەکەیەوە بە دزییەوە سەیری دەکردم و لەسەر چۆک چەمابووەوە و نیمچەڕووت بوو.

بەڵێ ئەوە **ئەنابێل** بوو، هەرزەکارەکەی **ڕیڤێرای** خۆشەویست، ئەوەی درزی خستە ژیانمەوە، سەرلەنوێ دۆزیمەوە، شانەکانی بە ئەسمەرییەکی کاڵ سواخ درابوون، پشتێکی ڕووت و مەخمەلیی نەرم و پەلکە قاوەییەکانی، دەستەسرێکی ڕەنگین لەسەر سینگی بوو، بووبووە ڕێگر لەوەی مەمکەکانی ببینم، بەڵام ئەوە نەیتوانی ببێتە ڕێگر لە بەردەم نیگای یادگارییە ماندووەکانم، ئەوەتا ئەوە دوو مەمکە یاخییەکەیە، کە لەسەر کەناری **ڕیڤێرا** لە ڕۆژێکی نەمردا دەستم لێیان دا.

لێچوونێکی زۆر سەیر و نامۆ بوو، خۆشی و شادی پڕی کردم، وا خەیاڵم دەکردەوە کە پاڵەوانی ڕۆمانێکی ئەفسانەیی بووم، لەو چیرۆکانەی کە بۆ منداڵان دەخوێندرێتەوە، ئەو شازادەیەی کە جنۆکەکان خۆشەویستەکەی دەڕفێنن، بۆ دواجار لە دوای گەڕانێکی دووروودرێژ لەنێو شرۆشیتاڵی قەرەجەکاندا دۆزیمەوە.

لە پشتی مسز هیزەوە جارێکی تر سەیری سکی ئەو پەرییەم کردەوە کە لەبەر ئەو هەتاوەدا مەلەی دەکرد، ئەو پەرییەی کە هاتەوە، ئەنابێلی خۆشەویستمە، هاتەوە بۆ ژیان، نیگاکانم لەسەر ئەو سکە تەنکە چەقیان بەست، کە لە ڕیڤێرا بۆ پشوویەکی کورت سەرم لەسەری دانابوو، دواتر نیگاکانم چوونە سەر ئەملاولای کەمەری، کە لە کاتی خۆیدا لە لای سێبەری بەردە وەنەوشەییەکانەوە ماچی شوێنەواری پشتوێنەکەیم کرد. لە چەند چرکەیەکدا بیستوپێنج ساڵی تەمەنم بە تەواوەتی سڕایەوە، لە نێوان ڕیڤێرا و ئەم ڕۆژەدا کە لە باخچەکەی ماڵی مسز هیزدام.

زۆرم پێ قورسە، گوزارشت لەو پەستانە بکەم کە لە ناخمدا پەنگی خواردبووەوە، هەڵچوونی ناخ و موچڕک لە لەشمدا ڕێی دەکرد، زۆرم پێ قورسە بتوانم ئەو کاریگەرییە هەستەوەرەی تووشم بوو ڕوونی بکەمەوە. کاتێک سەیری ئەو هەرزەکارەم دەکرد کە لەسەر چۆک دانیشتبوو، هەستم بە بەتاڵییەکی ناخم کرد، هەموو بەشێک لە بەشە جوانە بریقدارەکانی دەمژی و لەگەڵ گریشمەیەک لە گریشمەکانی خۆشەویستە کۆچکردووەکەمدا پێکی دەگرت، هێندەی پێ نەچوو ئەم لۆلیتایە وێنەی ڕەسەنی ئەنابێل‌ی لا کوژاندمەوە.

ئەوەی لێرەدا دەمەوێت دووپاتی بکەمەوە ئەوەیە، ئەوەی من دۆزیمەوە دەرئەنجامێکی گەورە بوو بۆ خەونی دوورگە ئەفسووناوییەکە، کە خۆشەویستە هارەکانی تێدا نیشتەجێ بوون، ئەو خەونەی کە یاوەری ڕۆژانی بەئازاری پێشووم بوون، ئەوەی لە نێوانی ناسینی ئەنابێل و لۆلیتادا ڕووی دابوو، لە ژیانمدا بووە چەند تێکەڵەیەکی هەڕەمەکی لەنێو زەریای ژیاندا، ئەو خۆشییانەی لەو ماوەیەدا دەستم کەوتبوو هەمووی هەستێکی ساختە بوو.

گومانم نییە دادوەرانم قسەکانم وەکوو وڕێنەی پیاوێکی شێت لە قەڵەم دەدەن کە ئارەزووی سەرسامکەرانەی بۆ فەریکەمێوەکان هەیە، لە ڕاستیدا ئەوە گرینگ نییە لای من، ئەوەی دەمزانی تەنیا ئەوە بوو کە لە پشتی مسز هیزەوە ڕێم دەکرد پێیەکانم دەلەرزین، هاوشێوەی ئەو کاتەی کە پێیەکانم لەسەر ئاوێکی ناجێگردا بێت، بەلام لێوەکانم وەکوو لمی بیابانەکان وشک سووتابوون.
مسز هیز گوتی:
- ئەمە لۆلیتای کچمە و ئەمانەیش گوڵی باخچەکەمن.
یەکڕاست وەڵامم دایەوە:
- بەڵێ، زۆر جوانە، زۆر جوانە... جوانە.

## ١١

من لێرەدا ئەو بیرەوەرییانەم وەکوو بیرەوەریی سیخوڕێک دەگوازمەوە کە نامەیەکی نهێنیی هەڵگرتووە و دوای ئەوەی ناوەڕۆکەکەی لەبەر کردووە قووتی داوە، بە شێوەیەک هەر کاتێک بیەوێت بتوانێت دووبارە باسی بکاتەوە.
ئەو بیرەوەرییانەی باسیان دەکەم لە تێنووسێکی جوانی بیرەوەرییەکانی ساڵی ١٩٤٧ دەگوازمەوە، کە هەمیشە لە گیرفانمدا هەڵمدەگرت و هەمیشە بە وشەی نهێنی و بە هێما شتم تێدا تۆمار دەکرد. جگە لە خۆم کەس لێی تێنەدەگەیشت.
- ٣٠ ئایار (مایۆ): لەو هاوینەدا پەتای ئەنفلەوەنزا لە ڕامسدێل بڵاو بووەوە و بووە هۆی داخستنی قوتابخانەکان، دوای چەند ڕۆژێک، شوێنی نیشتەجێبوونم گواستەوە بۆ ماڵی مسز هیز.

ئەم پارچانەی کە باسی دەکەم، سەبارەت بە چەند ڕۆژێکی مانگی (یونیۆ)یە.
**پێنجشەممە:** ڕۆژێکی خۆش بوو، لە پەنجەرەی گەرماوەکەوە توانیم **دۆلۆریس لۆلیتا** ببینم، جلەکانی لەسەر ئەو تەنافە هەڵدەگرت کە لە حەوشی پشتەوە ڕاکێشرابوو بۆ ماڵەوە، دواتر بینیم چووە حەوشەکەی پێشەوە، قەمیسێکی تەنکی شەفاف و بیجامەیەکی پیاوانەی شینی لەبەر بوو، هەر جووڵەیەکی ئەو لە ژێیە هەستیارەکانی ناوەوەی لەشی ڕووتی بە ئاگای دەهێنام، منیش چوومە باخچەکەوە و لەسەر پەیژەکان دانیشتم، هێندەی پێ نەچوو ئەویش لە پەیژەیەکی خوار منەوە دانیشت و بەردەکانی نێوان هەردوو قاچی کۆ دەکردەوە، چەند جوان بوو قاچەکانی، بە من بوایە وەکوو قامیشی شەکر قەپم لە هەردوو قاچی بگرتایە، ئەو پێستە سپییەم وەکوو شیرینی بلستایەوە. چ پێستێکی جوان و پاکی هەبوو، زیبکەی لاوێتی، پاکیی پێستی دەشێواند، ئەو زیپکانە هەرگیز لە پەرییە هارەکاندا دەرنەدەچوو، تەنانەت هەر خواردنێکی ورووژێنەریشیان بخواردایە.
لێرەدا خەونی نێو شەمەندۆفێرەکەم بیر کەوتەوە، کە تەنیا لە دەوروبەری کچەکەی ماک کۆ دەسووڕایەوە، کەچی دواتر کچەکەی ماک کۆم بینی لاواز و نەخۆش بوو، ئیفلیجیی منالی خەریک بوو دەیکوشت، جیاوازی لە نێوان ئەو منداڵە و ئەم پەرییەدا چەند زۆرە، کە ژیان و سەرزیندوویی تێدا دەتەقێتەوە و شەهوەت شێت دەکات.
کاتێک هەستا بۆ ئەوەی جلەکان ببات دەرفەتم بۆ ڕەخسا لەنێو ئەو بیجامە پیاوانە ڕەنگماتەدا، لە دوورەوە بە دڵەوە لە قوونی بڕوانم. لەو دەمانەدا **مسز هیز** دەرکەوت و کامێرایەکی پێ بوو و لە دوای

بگرەوبەردەیەکی زۆر، لەسەر ئەو پەیژەیەی کە دانیشتبووم، بە نیگایەکی تەماوی و ونبووەوە وێنەیەکی گرتم.
**هەینی:** بینیم لەگەڵ کچێکی پێستئەسمەردا بە ناوی **ڕۆز** ڕۆیشت، ئاخۆ بۆچی ئەو ڕێکردنەی بەو شێوەیە دەمورووژێنێت و تووشی هەستێکی ترسناکم دەکات، خۆ ئەو تەنیا منداڵێکە.
زمانە بازاڕی و بەرز و گرەکەی ئاخمی بۆ سنوورێکی نادیار دەجووڵاند.
**شەممە:** من دەزانم کارێکی شێتانەیە کە بیرەوەرییەکانی ڕۆژانەم دەنووسمەوە، بەڵام ئەو کارە موچرکێکی نامۆ و بەچێژم پێ دەبەخشێت.
باشم بیر دێت لەو ڕۆژەدا لە نێزیک مەلەوانگەکە، **لۆلیتا** لەبەر خۆرەکەدا خۆی دەشووشت، بەڵام بە درێژاییی کاتەکە دایکی و هاوڕێیەکەی لە نێزیکی بوون. بێگومان دەمتوانی لەوێ لەسەر کورسییە بزۆکەکەدا دابنیشم و وا خۆم پیشان بدەم کە سەرقاڵی خوێندنەوەم، بەڵام بۆ سەلامەتیی خۆم پێم باش بوو دوور بم، چونکە دەترسام هەستە شێت و لەرزۆکە حەنەکئامێز و فرمێسکاوییەکانم ببنە هۆی ئەوەی نەتوانم بە ئاسایی خۆم پیشان بدەم.
**یەکشەممە:** هێشتا کەشوهەوا گەرمە، بەر لەوەی **لۆلیتا** بێت بۆ خۆشووشتن، ڕێوشوێنی پێویستم بۆ خۆم گرتە بەر و پێگەیەکی ستراتیژیم بۆ خۆم هەڵبژارد، کە مەلەوانگەکەم لێوە دیار بێت و لەسەر کورسییە بزۆکەکەدا دانیشتم، وا خۆم پیشان دا سەرقاڵی خوێندنەوەم، بەڵام داخی گرانم لەگەڵ دایکیدا هات، هەردووکیان جلوبەرگی مەلەوانییان لەبەر کردبوو، بۆ چەند چرکەیەک خۆشەویستەکەم لە نێزیکم وەستا، ڕێک بۆنی خۆشەویستەکەی

بۆنێک بوو گەرمیی ڕیڤێرامی لێ دەهات، بەڵام بۆنی ئەم تیژتر بوو، بەڵام **لۆلیتا** بە پەلە دوور لەگەڵدا بوو، یەکڕاست پیاوەتیی هەستاندم، تابلۆی شانە کەوتەوە و بۆ لای دایکی ڕۆیشت و لەسەر سکی ڕاکشا، ڕووتەکەی و شەپۆلی بڕبڕەی پشتی و خڕیی سمتە داپۆشراوەکەی، بەو جلە ڕەشەی مەلەوانگەوە نمایشی بۆ هەزار چاوی نێو خوێنم دەکرد.

کۆمەڵێک گۆڤاری وێنەداری هەزەلیی دەخوێندەوە، جوانترین پەریی هەرزەکار بوو، نیگاکانم هەر ئەوەندەی مابوو، لەژێر تیشکی خۆرەکەوە بیقاپێنێت، لێوە وشکەکانیشم تامەزرۆی دەکرد. پێم وا بوو هەستەکانم بەس بوو بۆ ئەوەی تینوویەتیی سێکسیم یەکڕاست تێر بکات بە هەر ئاماژەیەکی خۆکارانە، بەڵام من وەکوو ئاژەڵێکی دڕندە پێم باش بوو نێچیرەکەم زیندوو بێت نەک مردوو، بڕیارم دا بگەم بە دەرئەنجامێکی خەمبار بەوەی کاتێک **لۆلیتا** جووڵەیەکی منداڵانە دەکات، وەکوو ئەوەی بۆ خوراندن دەست بۆ پشتی ببات و تووکە نەرمەکانی بن باڵی ببینم. بەڵام **مسز هیز** دایکە قەڵەوەکەی، هەموو شتەکانی تێک دا، زنجیرەی بیرکردنەوە سێکسییەکانی لێ پچڕاندم، داوای لێ کردم جگەرەکەی بۆ داگیرسێنم، دواتر دایەلۆگێکی دەستکردی جددی دروست کرد لە بارەی کتێبێکی پووچی نووسەرێکی میللیی دەجاڵەوە.

**دووشەممە:** ئەمڕۆم جیاواز بوو، تووشی شکستهێنانێکی گەورە بووم (من و **لۆلیتا** و **هیزی** دایکی) ئامادەکاریمان کرد بۆ ئەوەی بڕۆین بۆ زەریاچەکە و مەلە بکەین، کەچی نیوەڕۆکەی کەشوهەوا باوبۆرانێکی زۆری داهێنا.

دەرکەوتووە پێگەیشتنی کچان لە شارەکانی نیو یۆرک و شیکاگودا، لە تەمەنی ١٣ ساڵ و ٩ مانگەدایە، بەڵام ئەم تەمەنە جیاوازیی دەبێت لە هێندێک کەسدا، واتا لە ١٠وە بۆ ١٧ ساڵ.
**ڤرجینیا** تەمەنی چواردە ساڵ نەبوو کاتێک **هاری ئەدگار** گرتییە خۆی و وانەی جەبری پێ دەگوتەوە- وێنای ئەوە بکەن.
بە پێی قسەی توێژەرەکان کە لێکۆڵینەوەیان بۆ پێداویستییە سێکسییەکانی منداڵ ئەنجام داوە، ڕووخساری من هەموو ئەو خاڵانەی تێدایە کە وەڵامی هەستی ورووژانی جەستەی هەرزەکارە بچووکەکان دەداتەوە، چەناگەیەکی جوان و دەنگێکی قووڵ و ماسولکەی دیار و شانێکی پان، جگە لەوەیش دەڵێن من لە گۆرانیبێژێک یاخود ئەکتەرێک دەچم کە **لۆلیتا** لە خەیاڵی هەرزەکارانەیدا زۆری خۆش دەوێت.
**سێشەممە:** باران و باران. دایکی چوو بۆ بازاڕ، دەمزانی **لۆلیتا** لە شوێنێکی ئەو ماڵەدایە، دوای چەند گەڕانێک، لە ژووری خەوتنەکەی دایکیدا دۆزیمەوە، شتێک چووبووە چاوی چەپی و سەرقاڵی دەرهێنانی بوو، زۆر بە ناسکی لێی نیزیک بوومەوە و توند شانیم گرت و بە ناسکییەوە سەریم گرت و ڕوویم کردە لای خۆمەوە، گوتی:
. هەست دەکەم پووشێک لەژێر پێڵوەکانمدا خۆی حەشار داوە.
پێم وت:
- جووتیارە سویسرابییەکان نووکی زمانیان بە کار دەهێنن بۆ دەرهێنانی، دەتەوێت بۆتی بلێسمەوە؟
کاتێک بە ڕەزامەندییەوە وەڵامی دامەوە، لێواری زمانە سووتاوەکەم بە چاویدا هێنا. گوتی:

- چەندە کارێکی باشە؛ پووشەکە نەما.
پێم گوت:
- با چاوەکەی دیکەیش چارەسەر بکەین.
- گەمژە! هیچ لە چاوەکەی دیکەمدا نییە.
قسەکەی تەواو نەکرد و هەستم کرد لێوەکانم لێی نیزیک بوونەوە. بە شێوەیەکی ئاسایی خۆی ڕادەست کردم و باوەشم پێدا کرد و دەستە گەرمەکانی بۆ درێژ کردم، پێلووە کلکراوەکانیم لستەوە، دەستی بە پێکەنین کرد و دەری کردمە دەرەوە، هەستم کرد دڵم لەنێو خۆشیدا مەلە دەکات، خۆشییەک بوو هەموو شوێنەکەی پڕ کردبوو لە شادی، پێشتر ئەو هەستەم هەرگیز بۆ نەهاتبوو، تەنانەت لە کاتی دەستبازیکردنمدا لەگەڵ ئەنابێلی خۆشەویستم لە فەرەنسا.
کاتێک شەوم بەسەردا هات، هەستم بە ئازارێکی زۆر سەخت و بێوێنە کرد، دەمویست ڕووخسار و دەستلێدانەکانی بۆ خۆم وەسف بکەم، بەڵام نەمدەتوانی، چونکە کە لێ نیزیک دەبوومەوە ئارەزووم کوێری دەکردم، ڕانەهاتبووم لە پەرییەکانەوە نیزیک ببم، بەم شێوەیە کە چاوم داخستبایە نەدەهاتە بەر چاوم، بەڵکوو وەکوو وێنەی فۆتۆگرافی هێندێک شێوەی جێگری دەهاتە بەر چاوم، بەشێک لە دیمەنی قاچیم دەهاتە بەر چاو، بەڵام دەنگی دایکی تێکەڵی ئەو وێنەیە دەبوو، کاتێک هاواری دەکرد: "**دۆلۆریس!** قاچت داپۆشە."
لەو کاتانەدا کە مەزاجێکی باشم هەیە دەتوانم ببم بە شاعیر، شیعرێکی غەزەلییشم بۆ برژانگە کوژەر و چاوە قووڵەکانی نووسی، بەڵام دواتر ئەو شیعرەم دڕاند، هێشتا وێنای **لۆلیتام** بە تەواوەتی بۆ خوێنەر وەسف نەکردووە، قژێکی قاوەیی و دوو لێوی سوور، لێوی خوارەوەی کەمێک ئەستوورتر و وروووژێنەر بوون.

ئاه خۆزگە ژنێکی نووسەر بام، بە نیوەشەو ڕووتم دەکردەوە، بەڵام من پیاوم و ڕووخساری پیاوەتیم تێدایە و خاوەن پێکەنینێکی منداڵانەم.

ئەوەی شێتم دەکات سروشتی ئەو جنۆکەیە بوو، ئەو سروشتە دوولقە بوو، ئەو نە منداڵە و نەیش ژنێکی تەواوە، بەڵکوو ئەو تێکەڵەیەک بوو لە بەرائەتی منداڵی و لە جووڵەکانیدا نیشانەی قەحپەیی هەبوو، تێکەڵەیەک بوو لە قوڕ و با.

گرینگ ئەوە بوو **لۆلیتا** توانی ڕۆڵی ئارەزووە کۆنەکەم ببینێت، هیچ شتێک نەما لە خۆی گرینگتر بێت، ئەو پێش هەموو شتێک و لە سەرووی هەموو شتێکەوە خۆشەویستی دڵم بوو.

**چوارشەممە: لۆلیتا** لێم نێزیک بووەوە و بە دەنگێکی کز و لەرزۆکەوە گوتی:

- دایکم قایل بکە تاکوو سبەینێ بۆ زەریاچەکە بڕۆین.

لە کاتێکدا ئەو قسەیەی پێ گوتم خۆر لە ئاوابووندا بوو، لە بەردەم دەرکەدا پێکمان دادا، ئەو پێکدادانەیش تووشی موچڕکی چێژێکی گەرمی کردم، وای لێ کردم وەکوو گەڵای ئەو دارانە بلەرێمەوە؛ کاتێک با بەریان دەکەوێت.

**پێنجشەممە:** لە نێزیک مەلەوانگەکە، من و **لۆلیتا** و دایکی دانیشتین، خۆرئاوا تەواو تاریک؛ بۆ دڵی یاران گەرم بووبوو، بە دووروودرێژی گوێمان لە چیرۆکی ئەو فیلمە گرت کە **مسز هێز** و **لۆلیتا** لە زستانی پێشوودا سەیریان کردبوو. لەسەر کۆسەرینەکاندا دانیشتبووین، **لۆلیتا** لە نێوان من ودایکیدا دانیشتبوو.

منیش دەستم بە گێڕانەوەی گەشتەکەم بۆ جەمسەری باکوور کرد، زۆر بە وردی و بە خەیاڵێکی فراوانەوە قسەم دەکرد تا ئەو کاتەی کە

شەیتان ئیلهامی ئەوەی بۆ هێنام و تفەنگێکی پێ دام و ورچێکی سپیم پێی کوشت، کاتێک سەرقاڵی وەسفکردنی چۆنێتیی کوشتنی ئەو ورچە بووم، هەستم بە نێزیکیی **لۆلیتا** دەکرد، لەگەڵ قسەکردندا دەستم دەجووڵاندەوە بۆ ئەوەی هەلی تاریکی بقۆزمەوە و دەستم بەر هەر شوێنێکی **لۆلیتا** بکەوێت، جاروبار هەستم دەکرد کە دەستم بەر شانی دەکەوێت و جاروباریش بەر دەستی دەکەوت، ئەویش بە بووکەشووشەیەکی خوری یاریی دەکرد و هەر جارناجارێک فڕێی دەدایە باوەشمەوە، بەو دەستبازییە بوێرانەوە خوێنی **لۆلیتام** جووڵاند، لە کاتی پێکەنیندا هەڵەکەم دەقۆستەوە و قاچیم دەخوراند و هەوڵم دەدا بۆنی سەری بکەم و دەموچاوم بەر خڕیی و کەوانەکانی جەستەی بکەوێت.

ئەویش لەو دەستبازییانەمدا وەڵامدانەوەی هەبوو، بەڵام کاتێک نازەکەی سەری کرد، دایکی فەرمانی پێ دا بڕواتە ماڵەوە، **لۆلیتا** بووکەشووشەکەی هەڵدایە ئاسمان، منیش پێکەنیم، لە سەرووی قاچەکانی **لۆلیتاوە** بە دەم قسەکردنەوە ڕووم کردە دایکی، تاکوو دەستم بگاتە ژێر دەرپێیەکەی، بۆ ئەوەی هەست بە پێستە نەرمەکەی بکەم.

ئەوەیشم بیر نەدەچوو کە ئەو هەمووەی کردم هیچ سوودێکی بۆم نەبوو، هەستم کرد سۆز نەخۆشم دەخات و هەستم دەکرد جلەکانم لەبەرم تەسک دەبنەوە، بە شێوەیەک هەر ئەوە نەبوو بمخنکێنێت.

زۆرم پێ خۆش بوو کە دایکی لە تاریکییەکدا گوتی:

- ئێمە هەموومان پێمان وایە کە پێویستە **لۆلیتا** بڕوات بخەوێت.

**لۆلیتاش** لە وەڵامدا گوتی:

- پێم وایە ئێوە وڕێنە دەکەن.

- کەواتە گەشتمان بۆ زەریاچەکە نابێت.
- دایکە ئەمە وڵاتێکە ئازادیی تێدایە، نابێت خۆت لەم بابەتانەدا بسەپێنی.

لۆلیتا بە زمانێکی بازاڕیی یاخییەوە ئەو قسەیەی کرد و ڕووی کردە ماڵەوە، بەڵام من لە شوێنەکەی خۆمدا مامەوە. ئەویش بە حوکمی بەردەوامبوون لەگەڵ دایکیدا کە لەو ئێوارەیەدا دەیەمین جگەرەی داگیرساند و هەمیشە سکاڵای لە ڕەفتارەکانی لۆلیتا دەکرد. گوتیشی لە یەکەم ساڵی تەمەنییەوە هەروا هاروهاج بووە، هەمیشە یارییەکانی فڕێ دەدایە زەوی، بۆ ئەوەی دایکە بەستەزمانەکەی بچەمێتەوە و هەڵیان بگرێتەوە. ئێستایش کە تەمەنی دوازدە ساڵە، بووەتە ئافاتێکی هەمیشەیی، هیچی لە ژیاندا ناوێت جگە لەوەی بە ڕووتوقوتی سەما بکات، لە خوێندنگەیشدا نزمترین نمرە بە دەست دەهێنێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ئێستا باشتر بووە لە چاو دوو ساڵی پێش ئێستای، کە لە شاری بیسکی بووین.

پرسیارم لە دایکی کرد:

- چ شتێک لۆلیتای بێزار دەکرد لەوێ؟
- ئۆوهـ... من هۆکاری ئەو بێزاربوونە دەزانم، پێشتر بەو ئەزموونە تێپەڕیوم، دەردەسەریی زۆرم بینی لە دەست ئەو منداڵانەی لە کچانیان دەدا و پرچیان ڕادەکێشان و دەستیان دەسووڕاندن و دەستیان لە مەمکەکانیان دەدا و تەنوورەکانیان هەڵدەدانەوە. بێگومان بێزاربوون و منگەمنگکردن لەو کردەوەیە لە سروشتی کچانی ئەو تەمەنەیە، بەڵام لۆلیتا لە بێزاربوونەکەی زیادەڕەویی دەکرد.

دەزانی چیم لە تۆ دەوێت بەڕێز! ئەگەر تا پاییزی داهاتوو لەگەڵماندا بمێنیتەوە دەمەوێت هێندێک وانەی پێ بڵێیتەوە بۆ ئەوەی هاوکاریی

خوێندنەکەی بکەیت، پێ دەچێت شت زۆر بزانی، جوگرافیا، حیساب، فەرەنسی.
- بەڵی هەموو شتێک.
- ئەمە مانای ئەوەیە کە تۆ دەمێنیتەوە لەگەڵمان؟
ویستم هاوار بکەم و بڵێم دەمەوێت لێرە بم بۆ هەتاهەتایە- لە نێزیک **لۆلیتا**، بۆ ئەوەی جاروبار دەستبازییەکی لەگەڵدا بکەم، وەڵامی دایکەکەم نەدایەوە، چونکە بێزار بووم لێی و هەستام و چوومە ژوورەکەی خۆم.
پێ دەچێت دایکی بە نیاز نەبێت ئەو ئێوارەیە بە سەلامەتی بە ڕێ بخات، چونکە لەوکاتەی باوەشم بە شەبەنگی **لۆلیتادا** دەکرت، گوێم لە دەنگێکی کز بوو، کە لە تۆی دەرکەوە دەیویست بێتە ژوورەوە، ویستی بزانێت ئایا لە خوێندنەوەی ئەو گۆڤارە تەواو بوومە کە دوێنێ لێم وەرگرتبوو، بەڵام **لۆلیتا** ڕزگاری کردم و لە ژوورەکەی خۆیەوە هاواری کرد و گوتی گۆڤارەکە لای منە.
**هەینی:** ئەگەر لەژێر کاریگەریی ورووژانی بووکی خەونی ژیانمدا، بۆ ماوەیەکی زیاتر لەمماڵەدا بمێنمەوە، ئەوا تووشی هەرەسهێنانی دەروونی دەبم.
پرسیاری ئەوەم لا دروست بوو، ئەی ئەگەر (سروشتی گەورەمان) لە جەستەی **لۆلیتادا** دەست بە کارەکانی بکات و بەرەو ڕێی نیهێنییەکانی هەڵچوون و چێژی سێکسیی ببات؟ خەریکە شێت دەبم، هەست دەکەم نەفرەتێک لە ئاسمانەوە دەڕژێتە سەرم، بەڵام ئەگەر تاوانێکی دیکەی لەوە قووڵتر و سامناکترم پێ بکەن، لەوەی لەگەڵ **ڤالێریای** هاوسەرە خائینەکەمدا کردم.

خوێنەر پێویستە تێبینی ئەوە بکات، ئەو کاتانە بێدەسەلات بووم، ئەگەر ئارەزوویەک هەبوایە بۆ ئەوەی دەست بە قورگمەوە بگرێت و تا مردن بیگوشێت، پێویستە ئەوەی لە بیر بێت، ئەوەی وزەم پێ دەبەخشێت بۆ ئەوەی بەهێز بم جگە لە بەشێکی شێتی هیچی تر نەبوو، هێندێک جاریش لە خەونەکانمدا دەبوومە کەسێکی زلهێز، ئایا خوێنەر تێ دەگات مەسەلەکە چۆنە!
هێندێک جار خۆمم دەبینی دەمانچەیەکم ئاراستەی دوژمنێکی جوان کردووە، دواتر کە دەست دەنێمە سەر بەلەپیتکەی دەمانچەکە، گوللەکان یەک لە دوای یەک بەرەو زەوی شۆڕ دەبنەوە، تاکە خەمی من لە خەونەکانمدا ئەوە بوو شکستەکانم لە دوژمنەکەم بشارمەوە.
لەو شەوەدا لە کاتی نانخواردندا دایکە مەکربازەکەی چاوێکی داگرت و بە دەنگێک کە مەبەستی **لۆلیتا** بوو گوتی:
ـ هەست دەکەم خەریکە سمێڵ درێژ دەکەیت، باشتر وایە ئەو سمێڵە لابەی بۆ ئەوەی عەقڵی هێندێک کەس تێک نەچێت.
**لۆلیتا** بە توورەییەوە خواردنەکەی لا کردەوە و هێندەی نەمابوو پەرداخە ماستاوەکە بڕژێت و بە بێزاریدەربڕینەوە لە ژوورەکە چووە دەرەوە، دایکیشی ئاوڕی دایەوە و گوتی:
ـ ئەگەر **لۆلیتا** لەسەر ئەو ڕەفتارەی داوای لێبووردن بکات، سبەی لەگەڵمان دێت بۆ زەریاچەکە؟
دایکی خۆی کشاندەوە، لە تۆی دەرکە دوورەکانەوە گوێم لە دەنگی توورەیی ئەو دوو ڕکابەرە هەمیشەییە بوو، بێگومان **لۆلیتا** داوای لێبووردنی نەکرد و بۆ زەریاچەکەیش نەڕۆیشتین.
**شەممە:** چەند ڕۆژێکە لە کاتی سەرقاڵبوونم بە نووسین، دەرکەی ژوورەکەم بە کراوەیی بەجێ دەهێڵم، بەڵام ئەم تەڵەیە تا ئەمرۆ

سەرکەوتوو نەبوو، تەنیا ئەمڕۆ نەبێت، **لۆلیتا** هێندێک ئەملاوئەولای کرد بۆ ئەوەی وا خۆی پیشان نەدات کە بەبێ مەبەست هاتووەتە سەردانم، خۆی کرد بە ژوورەکەدا، بەبێ ئەوەی من بانگهێشتی بکەم، هێندێک سەیری ئەملاوئەولای کرد و لەسەر مێزەکە ئەو وێنەیەی بینی کە بۆ دانەیەک لە خەونە ناخۆشەکانم کێشابووم. بە مەبەستی شیکارییەک بۆ خەونەکەم کێشابووم، هیچ شتێکم تێدا بەدی نەدەکرد لە خەیاڵێکی وێژەییەوە هاتبێت، بەڵکوو تەنیا بەڵگەی ئەوەم تێدا دەبینی، ئەو خەونانە گوزارشتیان لە حەزە سێکسییە کوژەرەکانم دەکرد، کە لە جنۆکە هارەکانەوە سەرچاوەی دەگرت.

سەری چەماندەوە بۆ سەر مێزەکەم، **هەمبەرتی بەدرەوشت** (کە منم) وەکوو سۆزێکی باوکێتیی دەستکرد دەستم خستە پشتییەوە، هەرگیز لەو نواندنەیشدا لێهاتوو نەبووم، میوانە بێتاوانەکەیشم، بە سەرسوورمانەوە لە وێنەکەمی دەکۆڵییەوە، بە بزاوتێکی بێمەبەستەوە لە باوەشم دانیشت، ڕووخساری زۆر جوان بوو، قژە ئاوریشمی و لێوە کراوەکانی خستنە بەر ددانە ڕووتەکانم، هەستم بە گەرمیی جەستەی دەکرد لە تۆی جلەکانییەوە بەرز دەبووەوە، لەو کاتەدا درکم بەوە کرد دەتوانم پشتەملی ماچ بکەم و دەمی هەڵبلووشم، بەبێ ئەوەی لە هیچ بترسم، دەمزانی ئەو بۆ ئەوە خولقێنراوە ڕێم پێ بدات ئەو کارە بکەم، بۆ ئەوە خولقێنراوە ماچەکانم وەکوو ئەستێرەیەکی سینەمایی بە چاوداخراوییەوە قبووڵ بکات.

ناتوانم بە خوێنەرەکانم بڵێم کە برۆکانی وەها بەرز بووبوونەوە، لەوەدا بوو بگاتە سەرووی نێوچەوانی، ئەم زانستەم لە کوێوە بۆ هات، لەوانەیە گوێچکە سووکەکانم بەبێ ئاگا، هەستی بە گۆڕانی ئیقاعی هەناسەی کردبێت، لە ڕاستیدا سەیری وێنەکەی منی نەدەکرد،

بەڵکوو لە چاوەڕوانیی ئەوەدا بوو، کرێچییەکەی دایکی ئەو کارە بکات کە سووتاندوویەتی و ئارەزووی دەکات. کارێکی نامۆ نەبوو لای ئەو کە پێشبینیی ئەو ڕەفتارە بکات، چونکە ئەو خوێنەرێکی پسپۆڕی گۆڤارە سینەماییەکان و باوەشی سەر شاشەکان بوو، هەموو هۆکارەکان ئامادە بوون، لە ناکاو دەنگی کارگوزارەکە بەرز بووەوە، کاتێک مسز هیزی بینی لە بازاڕ هاتووەتەوە بۆ ئەوەی پێی بڵێت ئاژەڵێک لە باخچەکەدا مردار بووەتەوە.

لۆلیتایش لەو کەسانە نەبوو ڕووداوی مردارەوەبوونی ئاژەڵەکە لە دەست خۆی بدات، بە خێرایی چووە خوارەوە.

یەکشەممە: بە مەزاجێکی نێوان بێتاقەتی و قایلبوون خەبەرم بووەوە، لۆلیتایش وەکوو تەماتەیەکی بچووک لە کراسە کورتەکەیدا بوو، تا ئەژنۆی ڕووت کردبوو.

دووشەممە: کەشوهەوا باراناوی بوو، خۆمم وەکوو جاڵجاڵۆکە زەردهەڵگەڕاوەکان دەهاتە بەر چاو کە لە باخچە کۆنەکاندایە و لە شوێنێکدا چاوەڕوانە تۆڕەکەی شتێکی بۆ بگرێت، بەڵام تۆڕەکانی من لەنێو هەموو ژوورەکاندا دانرابوون، لەسەر کورسییەکەی خۆمەوە گوێم لە هەموو جووڵەیەکی لۆلیتا دەگرت بۆ ئەوەی بە دەنگی پێی بزانم لە چ شوێنێکیماڵەکەدایە، نزام دەکرد جاروبار لە بەردەمم دەربکەوێت.

کاتێک چاوەڕوانییەکەم درێژەی کێشا، چوومە هۆڵەکە بۆ ئەوەی هەواڵێکی بزانم، بینیم دایکی بە دەنگێکی کزەوە بە تەلەفۆن قسە لەگەڵ هاوڕێیەکیدا دەکات. نەمدەزانی پەرییەکەم دەرچووە لەماڵ یان نا، ماڵەکە وەکوو مردوو بوو، سارد. ئۆه لۆلیتا، ژیان چەندە قورسە

بەبێ تۆ.' لە ناکاو لە پشتی درزی دەرکەکەوە گوێم لە پێکەنینێکی بچووکی **لۆلیتا** بوو:
'بەشەگۆشتی بەرازەکەتم خوارد، بە دایکم مەڵێ.'
یەکراست بەرەو دەرکە ڕایکرد و دیار نەما. **لۆلیتا** کوای؟ من خواردنەکەم لا گرینگ نییە **لۆلا، لۆلیتا**.
**سێشەممە:** ناچار بووین جارێکی تر گەشتی زەریاچەکە دوا بخەین. چونکە هەورهەلا ئاسمانی گرتبوو، تۆ بڵێیت قەدەر پیلانی بۆم دارشتبێت؟
**چوارشەممە: مسز هێز** پێی گوتم بۆ کرینی دیارییەک بۆ برادەرێکی خۆی لە دوای نیوەڕۆوە دەڕوات بۆ بازاڕ و داوای لێ کردم هاوڕێیەتیی بکەم، چونکە زەوقێکی باڵام هەیە لە دەستنیشانکردنی قووماش و بۆندا. لە ڕاستیدا هەر بە پاڵنان فرێی دامە نێو ئۆتۆمبێلەکەوە و هیچ ڕێیەکی هەڵهاتنی بۆ بەجێ نەهێشتم، لەو کاتەدا گوێم لە دەنگە زیکنەکەی **لۆلیتا** بوو، لە پەنجەرەی هۆڵەکەوە گوتی:
- هێی بۆ کوێ؟... منیش دێم... چاوەڕێم بکەن.
دایکی گوتی پشتگوێی بخە، بەڵام من ئۆتۆمبێلەکەم کوژاندەوە و چاوەڕێی **لۆلیتام** کرد، ئەویش بە توندی دەرکەی ئۆتۆمبێلەکەی کردەوە و سەرکەوت.
**مسز هێز** هاواری کرد:
- ناتوانم بەرگەی ئەم ڕەفتارانە بگرم.
بەڵام **لۆلیتا** بە پێکەنینەوە گوتی:
- قوونت لابە با دابنیشم.
دایکی هاواری کردەوە و گوتی:

- **لۆلیتا!** ئەم قسانە چییە دەیکەیت، ناکرێت منداڵیکی وەکوو تۆ بەم شێوەیە ڕەفتار بکات و خۆی هەڵقورتێنێتە ئەو شوێنانەی کە باش دەزانێت ئامادەبوونی لەو شوێنە خوازراو نییە.

بەڵام **لۆلیتا** وەڵامی نەدایەوە و قاچی نووساند بە قاچمەوە، تێبینیم کرد **لۆلیتا** بەبێ پێڵاو هاتووە و بۆیەی نینۆکی پێیەکانی دیارە، ئای خوایە ئامادەم هەموو شتێک بکەم تەنیا لە پێناو ئەوەی پاژنە باریک و ئێسکە نەرمەکەی ماچ بکەم، لە ناکاو دەستی خزاندە نێو دەستم و بەبێ ئەوەی دایکی هەست بکات بە درێژاییی ڕێیەکە دەستی لەنێو دەستم بوو، منیش ئاواتم دەخواست بۆ هەتاهەتایە هەرگیز بەو دوکانە نەگەین.

هیچی تر ڕووی نەدا کە شایەنی ئەوە بێت بینووسم، جگە لەوەی لە گەڕانەوەدا دایکی بە زۆر لە دواوەی ئۆتۆمبێلەکەدا داینیشاند.

**پێنجشەممە:** لە یەک لە کتێبەکانی **لۆلیتادا** لیستێک ناوم بینی، ناوی سەرجەم خوێندکارەکانی پۆلەکەی بوو، وەکوو شیعرێک دەهاتە من کە گوزارشت لە جوانیی **لۆلیتا** بکات. وێنای ئەوەم کرد **لۆلیتا** سەری قەڵەمەکە دەگەزێت و مامۆستاکەی لێی تووڕە دەبێت و نیگای هەموو خوێندکارەکان لەسەر قژ و ملی **لۆلیتا** جێگر بووە.

**هەینی:** ئارەزووی ئەوەم دەکرد کارەساتێک ڕوو بدات، بوومەلەرزەیەک، تەقینەوەیەک، هەرچیی بێت، بۆ ئەوەی لەژێر داروپەردووەکاندا **لۆلیتا** بکەمە باوەشم و بە ئارەزووی خۆم دوور لە دایکی چێژی لێ وەربگرم.

ئەگەر یەک تۆز بوێرتر بام، دوێنێ دەمتوانی شتێکم لێ کردبا، کاتێک بانگهێشتی ژوورەکەی کردم بۆ بینینی ئەو وێنانەی لە خوێندنگەدا

کێشاونی، هەرکەسێک لە جێی من با دەیتوانی بە زەبری بەرتیل مەبەستی خۆی لێ بە دەست هێنابا.
هەر کەسێکی تر بوایە کە تۆزێک لە من ئاڵۆزتر نەبێت، دەیتوانی بە ڕێچارەی بازرگانی کێشەکەی چارەسەر بکات، بەڵام من نەمدەزانی بۆ کوێ بڕۆم، هەرچەندە دیمەنێکی پیاوانەم هەبوو بەڵام زۆر شەرمن بووم.
مسز هێز گوتی، هەواڵەکانی کەشوهەوا، پێشبینیی ئەوە دەکەن یەکشەممە باران نابێت و کەشێکی گونجاو دەبێت بۆ ئەوەی بچین بۆ زەریاچەکە. لەسەر جێیەکەم ڕاکشام و لە دۆخێکی ناجێگری سێکسیدا بووم، خەیاڵی لۆلیتام دەکرد، هەوڵم دەدا لە خەیاڵەکانمدا باوەش بە لۆلیتای فریشتەدا بکەم و بخەوم، لە ناکاو بیرم لە پلانی کۆتایی کردەوە بۆ ئەوەی سوود لە سەیرانەکە وەربگرم. من دەمزانی دایکی پێی ناخۆش بوو کە لۆلیتا نازم بەسەر دەکات و زمانی خۆشە لەگەڵم، بۆیە بڕیارم دا تەواوی کاتی سەیرانەکە بۆ ئەوە تەرخان بکەم کە لەگەڵ مسز هێز قسە بکەم و دڵی ڕازی بکەم، بۆ ئەوەی لە کاتی گونجاودا بڵێم سەعاتەکەم لە شوێنێکی نێو درەخت و گژوگیاکاندا لە بیر کردووە کە پێشتر لێی ڕاکشاوم و بۆ گەڕان بۆی دەڕۆمە نێو دارستانەکەوە و دەستی لۆلیتای پەرییش دەگرم.
کاتژمێر سێی شەو بوو، حەبێکی خەوم خوارد و لە خەونەکەمدا ئەو زەریاچەیەم بینی کە تاکوو ئێستا سەردانم نەکردووە، بینیم ئاوی زەریاچەکە بەستبووی و دوو پیاوی ئەسکیمۆ بە تەور بەستەڵەکەیان دەشکاند، لۆلیتایشم لەسەر دوو ئەسپ بینی، منیش لە ناوەڕاستیان بوو، بەڵام هیچ ئەسپێک لەژێر مندا نەبوو، بەڵکوو سواری هەوا بووبووم.

یەکشەممە: دیمەنێکی زۆر جوانم بینی، لەو کاتەدا کە لە پەردەم پەنجەرەی هۆڵەکەدا تێپەڕیم، شتێکم لە سینگی **لۆلیتا** بینی، کە لەگەڵ ڕۆژنامەفرۆشەکەدا قسەی دەکرد. لەژێر چاوەوە تەماشایم دەکرد و هەستم دەکرد جەستەم بە تەواوەتی دەتوێتەوە و وەکوو لاقی جالجالۆکە شەپۆل دەکات. وا خەیالم دەکرد، کە لە کونی تلسکۆپێکی گەورەوە سەیری دەکەم، وەکوو ئیفلیج خۆمم پەلکێش کرد و چوومە ماڵەوە- بۆ هۆڵەکە، هەموو چاوم خستبووە سەر قوونە ڕاخراوەکەی و لە پشتییەوە بە دزییەوە بۆی ڕۆیشتم و لەوێدا گەمژەییەکی گەورەم کرد و چمکێکی ئەو دەستەسرەیم گرت کە وەکوو یەخە بە کراسەکەیەوە بوو، بۆ ئەوەی پەشۆکاویی خۆم بشارمەوە کەمێک یەخەکەیم لەراندەوە.

پەرییەکە بە زمانێکی سەرزەنشتکارانەوە هاواری کرد و گوتی: "بەسە، بەسە."

بە ڕووشکاوییەوە خۆم کشاندەوە، ئەویش بەردەوام بوو لە قسەکردن لەگەڵ ڕۆژنامەفرۆشەکەدا و خۆی وا دەرخست کە بێتاقەتیم کردووە، بەڵام دوانیوەڕۆ دانیشتبووم و سەرقاڵی خوێندنەوە بووم، هەستم کرد دوو دەستی نەرم لە پشتەوە بەرچاویان گرتم، لەبەر ئەو خۆرەدا کە بەرچاوی گرتبووم دەستەکانی هێندە نەرم و ناسک بوون دیمەنێکی سووریان پێ بەخشیم، دواتر **لۆلیتا** بە قاقاوە، خۆی بە لای چەپوڕاستدا دەهێنا و دەبرد، منیش دەستم بۆی درێژ کرد و دەستم بەر لاقە نەرم و گەرمەکانی کەوت، لەو کاتەدا کتێبەکەی بەر دەستم کەوتە باوەشم.

لە ناکاو دایکی بە تووڕەییەوە خۆی کرد بە ژوورەکەدا و گوتی: جارێکی دی ئەگەر خوێندنەوە زانستییەکانتی پچڕی زللەیەکی لێ بدە.

دوابەدوای ئەوە بە دەنگێکی بێتامەوە گوتی:
- ئاه چەندە ئەم باخچەیەم خۆش دەوێت.
ئەو خانمە ڕەزاقورسە لەسەر فریزەکە ڕاکشا و تەماشای ئاسمانی دەکرد، لە ناکاو تۆپێکی کۆنی تێنسی بەر کەوت، گوێمان لە دەنگی لۆلیتا بوو، لەنێو ماڵەکەوە بە پێکەنین گوتی:
- دایکە بمبوورە مەبەستم تۆ نەبوو.
بێگومان ئەو مەبەستی ئەو نەبوو، بەڵکوو ئەو پەرییە هارە مەبەستی من بوو.

## ١٢

هەموو هەوڵە شەیتانییەکانم شکستی هێنا، دۆخەکەیش وەکوو خۆی مایەوە، ڕۆژانە شەیتان هانی دەدام و دەیورووژاندم و دواتر وازی لی دەهێنام و ئازایەتییەکەیشم لە دەست دەدا، هێندەم ئازار چەشت وا هەستم دەکرد بوونم دەخواتەوە.
باش دەمزانی چیم دەوێت و چۆن دەیکەم، بەبێ ئەوەی پاکیی ئەو منداڵە پیس بکەم. لە ژیانی ڕابردوومدا ئەزموونی دەستبازیم زۆر بوو لەگەڵ هەرزەکارەکاندا، کە هەرگیز زیانم بە پەردەی کچێنییان نەدەگەیاند، بە تایبەتی لەنێو پاس و باخچە گشتییەکاندا، کە خۆمم پێوە دەنان.
سێ حەفتە بەسەر چوو. من هەر پلانم دادەڕشت و دایکی شکستی پێ دەهێنا. ئەگەر خوێنەر تێبینیی ئەوەی کردبێت، ئەو دایکە هێندەی لەوە دەترسا کچەکەی چێژ لە من ببینێت، ئەوەندە ترسی ئەوەی نەبوو من چێژ لە کچەکەی ببینم.

ئەو بڵیسەیەی لە دڵی مندا هەڵگیرساوە لە ئاست ئەو پەرییە، بۆ ئەوە خولقابوو کە دووبارە بەرەو نەخۆشخانەی دەروونی بمباتەوە. ئەگەر شەیتان درکی بەوە نەکردایە، کە شتێک هەیە ئەم کێشەیەم بۆ چارەسەر دەکات، ئەوا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ یاریی پێ دەکردم. **لۆلیتا** دوایین پەری بوو، کە نینۆکە بەئازار و لەرزۆکە شەرمنەکانمی پێ گەیشت.

لەوانەیە خوێنەر سرنجی دابێت، کە وشەی زەریاچەکە زۆر جار دەهاتە نێو باسەکانەوە، بەڵام خوێنەر ئەوە نازانێت کە **مسز هیز** هەموو خەونەکانی وێران کردم، چونکە پێی گوتم **ماری هاملتۆن** هەرزەکارە ئەسمەرەکەیش لەگەڵماندا بۆ سەیرانەکە دێت. پێم وا بوو هەردوو پەرییە هارەکە، کاتەکانی سەیرانەکە بە چرپەچرپ و یاریکردنەوە بەسەر دەبەن، منیش ناچار دەبم لەگەڵ دایکی **لۆلیتادا** بە جلێکی نیمچەڕووتەوە خۆم بدەمە بەر هەتاو و لە کاتی گفتوگۆکردندا بەردەوام چاوەکانم بێلانە بە دوای **لۆلیتادا** بگەڕێن.

## ١٣

قەدەر دژایەتیم دەکات، ڕۆژێک بەر لە ڕۆژی سەیرانەکە دایکی ماری هاملتۆن تەلەفۆنی کرد و گوتی کچەکەی زۆر نەخۆشە و ناتوانێت بۆ سەیران بێت.

لەو کاتەدا کە لە ژوورەکەم دەرچووم بۆ ئەوەی قاپی خواردنەکەم لە ڕێڕەوەکەدا دابنێم، گوێم لێ بوو **مسز هیز** بە کچەکەی گوت سەیرانەکە دوا دەخات. بێدەنگی باڵی بەسەرماڵەکەدا پۆشی و دەستم

بە تاشینی ڕدینم کرد، بەبێ ئەوەی سابوونەکە بە باشی لە دەموچاوم پاک بکەمەوە خۆم خزاندە هۆڵەکەوە و بە دوای لۆلیتادا گەڕام.
دەمەوێت خوێنەرانیش بەشداریم بکەن لەم ڕووداوەی باسی دەکەم، دەمەوێت خوێنەر لە هەموو وردەکارییەکان ورد ببێتەوە، بۆ ئەوەی ببینن ڕووداوەکە چەند پاک و بێگەرد بوو، ببینن پارێزەرەکەم چۆن لە بری من وەسفی کرد: (سۆزێکی بەدەر لە حەز.)
پاڵەوانی شانۆگەرییەکە بێگومان منم بووم (هەمبەرت،) بەڵام کاتەکەی ڕۆژی یەکشەممە بوو لە مانگی یۆنیۆ، شوێنەکەیش هۆڵی میوانەی بوو، کە تیشکی خۆر تێیدا مەڵەی دەکرد. لۆلیتا لەو ڕۆژەدا کراسێکی خەت خەتی جوانی لەبەر کردبوو، پێشتر یەک جار ئەو کراسەم لەبەریدا بینیبوو و لێوەکانی سوور کردبوو و گونجاو بوو لەگەڵ باڵا جوانەکەیدا، کە بە کراسەکەیەوە نووسابوو. بەرزونزمییەکانی لەشی هەمووی دەرخستبوو. بۆ ئەوەی وێنەیەکی جوانتر ببەخشم: باسکەکانی ڕووت بوون، ڕوومەتی ئاڵ و سوور بوون، سێوێکی سووری بە دەستەوە بوو، بەهەرحاڵ، تاقەتی نەبوو بچێت بۆ کڵێسە، جانتا سپییەکەی وەکوو خۆی لە تەنیشت ئامێری موسیقاکەوە دانرابوو.
دڵم وەکوو تەپڵ لێی دەدا، کاتێک هات لەسەر قەنەفەکە لە تەنیشتم دانیشت، با لەژێر تەنوورەکەی دەدا، بە سێوەکەی یاریی دەکرد، هەڵی دەدایە ئاسمان و گرتییەوە.
لە ناکاو سێوەکەم لێی سەند. بە ئاماژەیەکی دەستە نەرمەکەی هەڕەشەی لی کردم، کە بیدەمەوە، سێوەکەم بۆی درێژ کرد، بە پەلە گرتی و قەپێکی لێی گرت. بە کاریگەریی دەستلێدانی دڵم وەکوو بەفر دەتوایەوە. گرتی بەو گۆڤارەوە کە بە دەستمەوە بوو، خۆمم ڕا

دەرخستبوو کە دەیخوێنمەوە، بە خێراییی لاپەڕەکانی هەڵدایەوە و بە دوای بابەتێکدا دەگەڕا کە دەیویست نیشانمی بدات، خۆمم وا پیشان دا کە گرینگی دەدەمە ئەو بابەتەی بۆی دەگەڕێت. سەرم لێی نێزیک کردەوە تا ئەو ئاستەی قژەکەی بەر نێوچەوانم کەوت، بە دەستی دەمی سڕی و قوڵی بەر ڕوومەتم کەوت. بە هۆی ئەو تەمومژەوە، کە نیگای گرتبووم، ئیقاعی کارتێکەرییەکانم خاو کردەوە. لەو کاتانەدا ئەژنۆکانی دەلەرزین و بە یەکیاندا دەدا و بە تووڕەیییەوە دەیانی-نووساند بە یەکەوە. لە ناکاو گۆڤارەکەم لە دەستی سەند و خۆی فڕێ دایە باوەشم و ویستی گۆڤارەکەم لێ بستێنێتەوە. دەستە لاوازەکانیم گرت و گۆڤارەکە کەوتە زەوی، ورتەورتێکم لێوە هات و گوتم: "لۆ!" خۆی لە باوەشم کشاندەوە و وەکوو دانیشتنی پێشووی لەسەر لێواری قەنەفەکە دانیشتەوە. ئەو منداڵە دڕندەیە بە سادەیییەکی زۆر بێسنوورەوە، لاقەکانی درێژ کردن و لە باوەشمدا پشووی پێیان دا.

لەو کاتەدا گەیشتمە ئەوپەڕی لوتکەی چێژ تا سنووری شێتبوون، بەڵام توانیم پارێزگاری لە مەکری شێتایەتیم بکەم، لەو دانیشتنەمدا لەسەر ئەو قەنەفەیە توانیم خۆڕاگر بم- دوای زنجیرەیەک بزاوتی پۆشراو- ئاوازی حەزەکانم لەسەر ئەندامە پاک و بێگەردەکەی ئاسان نەبوو بۆم، کە وا لەو هەرزەکارە بکەم لە مەبەستەکانم تێ نەگات، کۆمەڵێک گۆڕانکاری و چاکسازیی پێویستم گرتە بەر، بۆ ئەوەی پرۆسەکەم سەرکەوتوو بکەم.

بە خێرایی دەستم کرد بە قسەکردن و وا خۆم دەرخست سەرم دێشێ و بیانووم بۆ وشە و هەناسە پچڕاوەکانم دەهێنایەوە، لە هەمان کاتیشدا چاوی گێژی ناوەوەم خستبووە سەر ئامانجێکی

تایبەت لە زەینی خۆمدا. زۆر بە ئاگاییەوە لێخشاندنە تەلیسماوییە خاوەکانم خێرا کردنەوە، لە وەهمی خۆمدا زیاتر خێرام کرد، لەوێدا بەربەستێک هەبوو، هەرگیز نەمدەتوانی لایبدەم، چ دەبوو ئەگەر بیجامە و ڕۆبەکەم دابکەنم؟ ئەوکات لێخشاندن و هەستەکان خۆشتر دەبوو لە نێوان لاقەکانیدا، کە خۆر سواغیانی دابوو و لە باوەشی مندا بوون، بە شاراوەیی تووشی شەهوەتێکی سووتێنەر بووبووم، بە شێوەیەک ناتوانم گوزارشتی بکەم. لەو کاتەدا کە وشە و هەناسەم پچڕپچڕ بوون، وشەکانی گۆرانییەکەی (کارمن ئازیزەکەم) هاتە سەر زمانم و وەکوو ئامێر دووبارەم دەکردەوە و وەکوو کارتێکی سیحری بە کارم دەهێنا. لە هەمان کاتیشدا هەستم بە ترسێکی زۆر دەکرد کە قەدەرێک بێتە ژوورەوە و چێژەکەم لێ ببڕێت و ئەو بارە زێڕینە لە باوەشم لا بدات. وا هەستم دەکرد بوونی من تەنیا کاری بۆ ئەوە دەکرد کە خۆشی بچێژم، ئەو ڕاڕاییە ناچاری کردم لە ماوەی یەکەم خولەکەوە بە پەلە کار بکەم، هەرچەندە لەگەڵ ئەو پیلانەدا کە بۆ چێژوەرگرتن دامڕشتبوو نەدەگونجا، بەڵام ئەو هەوڵی ئەوەی دەدا ئاوازی گۆرانییەکەم بۆ ڕێک بخاتەوە، چونکە بە باشی دەیزانی و گوێیەکی مۆسیقیی باشی هەبوو.

کاتێک دەستم وەکوو مۆسیقا بەسەر لاقیدا دەهێنا، هەردوو لاقی لەسەر باوەشە بەتینەکەمدا کە درێژ بووبوون، کەمێک گرژ بوونەوە و قاقای بەرز بووەوە و بە دەم سێوخواردنەوە دەستی بە لەرزینی لاقی کرد، تا تاکێکی پێڵاوەکەی کەوتە سەر ئەو کۆگۆڤارەی تەنیشتم. لەو کاتەدا هەر جووڵەیەکی بکردایە وەکوو ئامرازێک هاوکاریی دەکردم؛ چێکردنی ئەو پەیوەندییە لە نێوان ئەژدیها و کچە

قەشەنگەکەدا کارامەتر بێتە دەست، کە لە پەیوەندیی نێوان ئەژدیهایەکی زیندانیکراو و جوانیی جەستەی پاکوبێگەردی دەچوو.
هەستم دەکرد نووکی پەنجەکانم بوون بە چاو، هەموو ئەو مووە نەرمانەم بینین کە لەسەر قاچی دابەش کرابوون، لەنێو تەومژی ئەو گەرما پڕووکێنەرەدا ون بووم، کە لە جەستەی **لۆلیتادا** دەردەچوو، وەکوو هاوینی سووتێنەر بوو.
کاتێک سەرقاڵی خواردنی دوابەشی سێوەکەی بوو، لە ناخمدا ئاواتم دەخواست لە جێی خۆیدا بمێنێتەوە. کە خۆی لار کردەوە بۆ ئەوەی پاشماوەی سێوەکەی فڕێ بداتە نێو تەپڵەکەوە، قورسایی لاقی کەوتە باوەشە ئازارکێشەکەمەوە، لە ناکاو گۆڕانکارییەکی تەومژاوی بەسەر هەستەوەرەکانمدا هات و چوومە قۆناغێکەوە کە هیچ شتێک گرینگیی نەما، جگە لە گرینگیی ڕشتنی شەهوەت، کە ناخی پڕ کردبووم. ئەوەی دەستی پێ کرد وەکوو درێژەپێدانێکی خۆش بوو بۆ قووڵایی ڕەگەکانی بوونی ناوەوەم، بووە درکێکی هەڵگیرساو و گەیشتە قۆناغی دڵنیاییەک کە لە هیچ لایەنێکی ژیاندا بوونی نییە.
هەستم کرد توانای ئەوەم هەیە ئارام ببمەوە، بۆ ئەوەی درێژە بەو گڕە بدەم، چونکە ئەو شەپۆلە بەچێژە هەنگاوی نایە ناخمەوە و بەرەو ڕەقبوون هەنگاوی دەنا، لەو کاتانەی کە بە تەنیا چێژم وەردەگرت، سەیری ڕووخساری ئەو پەرییە پێستگوڵاڵەییەم کرد کە خۆر بە ڕەنگی زێڕین سواغی دابوو، مەست بووم، لە پشت ماسکی چێژە کۆتوبەندکراوەکانمەوە تەماشایم دەکرد، ئەویش هیچ هەستی بە من نەدەکرد و تیشکی خۆر لە لێوەکانی دەدا و سەمایان دەکرد.
هێشتا بەردەوام بوو لە گیزەگیزکردنی گۆرانیی (کارمن ئازیزەکەم!)

ئێستا هەموو شتێک ئامادە بوو، هەستەوەرەکانی چێژ ڕووت بوونەوە، شوێنە هەستیارەکانی جەستەم بەرەو شێتبوون هەنگاویان دەنا، بچووکترین گوشار بەس بوو، بۆ ئەوەی بگەمە کۆتایی چێژێکی ئاسمانی، لەو کاتانەدا، من ئەو **هەمبەرت هەمبەرتە** سەگ و زەلیلە نەبووم، کە قاچی دەلستەوە و شەقی لێ دەدرا، بەڵکوو بووم بە کەسێک لە سەرووی ئەو خەمانەی کە گاڵتەجاڕییان پێ دەکرت و دوورتر بووم لە دەستی سزا، هەستم بەوە کرد کەسێکی گەورە و بەهێزم، بە تەواوەتی درکم بە ئازادیی سوڵتانی تورکی دەکرد، کە بە مەبەست چرکەکانی چێژی بەو هەموو بچووکی و بەختەوەرییەوە دوا دەخست.

وامدەزانی لە لێوار شیوێکی قووڵی شەهوەتدا هەڵواسراوم، بەردەوام بووم، وشەی گۆرانییەکەم وەکوو مرۆڤێک دەگوتەوە کە لە کاتی نووستندا قسە دەکات و پێ دەکەنێت، دەستەکانیشم تنۆکی خۆشیان دەتکاندە سەر ئەو قاچانەی کە بە تیشکی خۆر بە ڕەنگی ئەسمەر سواغی کردبوون. تا ئەوپەڕی سنووری ڕێپێدراو دەستم لە قاچەکانی دا.

لە ڕۆژی پێشوودا **لۆلیتا** خۆی کێشابوو بە باوەڵێکی گەورەی نێو هۆڵەکەدا و شوێنەوارێکی مۆری لەسەر ڕانە نەرمەکەی بۆ دروست بووبوو، منیش بە دەستە گەورە و تووکاوییەکانم دەستم پێدا دەهێنا و بە بیانووی بەزەییەوە گوتم: "سەیرکە چیت لە خۆت کردووە؟"

بە ئارەزووی خۆم و زۆر بە ئاسانی قاچیم دەپشکنی. جلەکانی ناوەوەی شێ بووبوونەوە. هیچ شتێک نەیدەتوانی ببێتە ڕێگر لە پەنجەم بۆ گەیشتن بە قووڵاییە گەرمەکانی. کاتێک ختووکەی قاچیم دەدا، گوتی: "ئۆهـ.. ئەوە هیچ نییە."

پێکەنینێکی قوولی کرد، پاکێی مرواریئاسا لە خوارەوەی لێوی دەرکەوت و لەسەر لێوی لای چەپیدا پشووی دا. لەنێو باوەشمدا خۆی ڕاست کردەوە و دانیشت، لەوەدا بوو پشتەملە ڕووتەکەی بەر ئەو دەمەم بکەوێت، کە نکەنکی بوو.

کاتێک دواسەرنجم خستە سەر قوونی چەپی، تەزوویەک درێژترین نەشئەی پێ بەخشیم، کە هیچ مەخلووقێکی مرۆیی یاخود ئەژدیهایەکی ئینسانی پێشتر نەیبینیوە.

لۆلیتا خۆی لەسەر قەنەفەکە خل کردەوە و لەسەر لاقەکانی خۆی هەڵدا بۆ ئەوەی وەڵامی تەلەفۆنەکە بداتەوە، بە من بوایە ئەو تەلەفۆنە بۆ هەتاهەتایە زەنگی لێ بدایە و وەڵام نەدرایەوە.

لەسەر یەک قاچ وەستابوو و بە چاوترووکان و ڕوومەتی گردار و قژی پەرژوبڵاوەوە، نیگای بێ باکی لە نێوان من و کەلوپەلەکاندا دانابوو. لەگەڵ دایکیدا قسەی دەکرد و گوێی دەگرت و وەڵامی دەدایەوە. منیش بە دەستەسرێکی ئاوریشمین ئارەقەی نێوچەوانم سڕی و چەرچەفە ئالۆسکاوەکەم ڕێک خستەوە. ئەو بەردەوام بوو لە تەلەفۆنەکە، قسەی لەگەڵ دایکیدا دەکرد و مشتومڕی بوو لەگەڵیدا. کاتێک ئاوازی دەنگی بەرز بووەوە، خۆم خشاندە حەمامەکەوە.

## ١۴

کاتێک گەڕامەوە بۆ ماڵ، هێندە بە چێژەوە نانم خوارد ساڵانێکی زۆر هەستم بەو چێژە نەکردبوو. **لۆلیتا** هێشتا نەهاتبووەوە. دووبارە مەستی خەیاڵە سەختە خۆشەکانم بووم، وەکوو وشترێک ڕووداوەکانی نێوان خۆم و **لۆلیتام** دەهێنایە بەر چاوم.

هەستم بە دڕەوشانەوە دەکرد؛ هەنگوینم دزی بەبێ ئەوەی هیچ زیانێک بە ڕەوشتی ئەو هەرزەکارە بگەیەنم، هەموو هەستە سووتێنەرەکانم ڕشتنە نێوی، بەبێ ئەوەی پیسی بکەم، بەم شێوەیە لۆلیتا بە سەلامەتی مایەوە و ئەو شێتییەی من بە دەستم هێنا لە ڕێی لۆلیتای ڕاستەقینەوە نەبوو، بەڵکوو لە ڕێی **لۆلیتای** خەیاڵمەوە بوو کە خۆم خوڵقاندبووم. لەوانەیە لە **لۆلیتای** ڕاستەقینە ڕاستگۆتر بێت. لۆلیتای بێ ئیرادە، بێ هەست، بێ ژیان، ئەو **لۆلیتایە** جیاوازیی لە نێوان من و **لۆلیتای** ڕاستەقینە دەکرد- لەسەر قەنەفەکەدا.

ئەو منداڵە بە هیچ شتێکی نەزانی، چونکە من هیچم لێی نەکرد، ئەمەیش نەبووە ڕێگر لەوەی ئەو پرۆسەیە دووبارە بکەمەوە، وەکوو ئەوە بوو کەسێکی پشتکوم و زەلیل لەسەر کچە قەشەنگێکی نێو فیلمێکی سینەمایی دەستپەڕ لێ بدات.

هەستم بە چەند سەعاتێکی سەخت کرد، کە لەم گەردوونە ترسناکەدا درێژەی دەکێشا. وامدەزانی دارچنارەکان بە نهێنییەکەم دەزانن. سەرلەنوێ ئارەزووەکانم لە خوێنمدا دەستیان پێ کردەوە، بەو بەیانییە ئارەزووەکانم زۆر بەهێزتر بوون، لە ناخی خۆمدا خوازیار بووم لەو کاتەی دایکی لە چێشتخانەکە سەرقاڵی دروستکردنی خواردن بوو، دووبارە بێتەوە و شانۆگەرییەکەی بەیانی لەسەر قەنەفەکە دووبارە بکەینەوە. خوایە بێتەوە بۆ لام. زۆر بە سەرسامی دەیپەرستم.

نەخێر، وشەی سەرسام گوزارشتێکی هەڵەیە، ئەو چێژەی ناخ و خەونەکانی پڕ کردم سەرسامبوون نەبوو، بەڵکوو زۆر خۆش و ئەرمونیان بوو، من بە چێژ و ئەرمونیانی وەسفی دەکەم، چونکە نیازی ئەوەم هەبوو بە هەموو هێز و حیکمەتێکمەوە پاکیی ئەو منداڵە

بپارێزم، سەرەڕای ئەوەی ئاگر لە مەیلە سێکسییەکانمەوە بڵێسەی دەسەند.
ئێستا گوێ بگرن بزانن چۆن بەسەر ئازارەکانمدا سەر کەوتم: **لۆلیتا** گەڕایەوە، بە تەنیا خۆی نەبوو، بەڵکوو لەگەڵ **ئال چاتفیلدی** دراوسێیان بوو، لە سینەما گەڕانەوە. خوانی ئێوارەمان لەسەر مێزەکە خوارد، کە **مسز هیز** لە ڕازاندنەوەی زیادەڕۆیی کردبوو. لە کاتی نانخواردنەکەدا باس لەوە کرا کە **فیلیس چاتفیلدی** دراوسێیان سبەی دەچێت بۆ خێوەتگەی هاوینەی کچان و ماوەی سێ حەفتە لەوێ دەمێنێتەوە، بڕیاریش درا پێنجشەممەی داهاتوو **لۆلیتایش** بۆ هەمان شوێن بڕوات، تا ئەو کاتەی خوێندنگە دەکرێتەوە.
ئەم هەواڵە تووشی شۆکی کردم، ئایا ئەمە واتای ئەوە نییە کە ئەو خۆشەویستەی بە نهێنی خاوەندارێتیی دەکەم، لە دەستم دەچێت؟
بۆ ئەوەی گرژومۆنییە سەختەکەم بپۆشم وا خۆم دەرخست کە سەرئێشەکەی بەیانیم بۆ هاتووەتەوە و هۆکارەکەیم بۆ ددانم گەڕاندەوە. دوای ئەوەی گوێم لە سەرجەم ڕاسپاردەکانی **مسز هیز** گرت، سەبارەت بە سەردانکردنی دوکتۆری ددان، بە پێچوپەنایەکی لێهاتووەوە توانیم پرسیار لە دایکی بکەم: "پێت وایە لەوێ دڵخۆش دەبێت؟" (ئای! چ پرسیارێکی پەڕپووت بوو.)
لە وەڵامدا گوتی: "بەڵێ، لەوێ حاڵی باشتر دەبێت، هەموو کاتەکەی بە یاریکردن بەسەر نابات، چونکە خێوەتگەکە **شێرلی هۆلمزیش** بەڕێوەی دەبات، پسپۆڕە لە پەروەردەکردنی پارچەڵەکان، پێ دەچێت **لۆلیتا** فێری شتی زۆر ببێت لەوێ، بە تایبەتی فێری هەستکردن بە بەرپرسیارێتی دەبێت بەرانبەر بە کەسانی تر."

گفتوگۆکان لە بارەی پێشنیاری مسز هیزەوە بۆ ڕۆیشتن بۆ لای مەلەوانگەکە کۆتایی هات و منیش بە بیانووی دانیشتنەکەمەوە ڕووم کردە ژوورەکەم.

## ١٥

**لۆلیتا** بە مەبەستی کڕینی پێداویستییەکانی خێوەتگەکە چوو بۆ شار. لە کاتی خوانی ئێوارەدا لەوپەڕی خۆشیدا بوو. چاوی بە گۆڤارەکانی (کۆمیک)دا دەخشاند. منیش بڕیارم دا هێندێک نامە بنووسم. بیرم لەوە دەکردەوە ماڵەکە بەجێ بهێڵم و بەرەو شارێکی کەنار بڕۆم، تا ئەو کاتەی خوێندنگە دەکرێتەوە. واتا تا ئەو کاتەی **لۆلیتا** دەگەڕێتەوە لە خێوەتگەکە، چونکە گومانم لەوە نەبوو، کە بەبێ ئەو منداڵە ناتوانم بژیم.

لە ئێوارەی ڕۆژی پێش سەفەرەکەیدا، لە دوای شەڕێکی ئاسایی لەگەڵ دایکیدا، **لۆلیتا** نانی ئێوارەی لە ژوورەکەی خوارد. گریانێکی زۆر بە کوڵ گریا، پێی خۆش نەبوو چاوە ئاوساوەکانی ببینم، پێستی زۆر هەستیار بوو، لە دوای هەر گریانێک چاوی سوور دەبووەوە و دەئاوسا.

گەلێک بە داخ بووم، چونکە ئەو وایدەزانی بە دیمەنی ئەو چاوانەی زیان بە بەهاکانی ئەو جوانییە دەگەیەنێت کە من هەستم پێ دەکرد. ئەو پەڵە سوورانەم زۆر پێ جوان بوو کە لە دوای گریاندا وەکوو گەڵای گوڵ دەوری لێوەکانیان دەدا. دیمەنی پڕژانگە تەڕەکانیم گەلێک پێ ژیکەڵە بوون، کە بە هۆی فرمێسکەوە تەڕ دەبوون، ئەو

شەرمکردنەی لە زۆر شت بێبەشی کردم، کە لە ڕێیەوە شێوەنێکی بەچێژی پێ دەبەخشیم.
لەسەر بەلکۆنەکە، لەگەڵ **مسز هیز**، لە تاریکیی شەودا دانیشتبووین، من بیرم لە ڕووخسارە شێواوەکەی **لۆلیتا** دەکردەوە و **هیز** بە پێکەنینێکی زۆردارانەوە گوتی بە **لۆلیتام** گوتووە **هەمبەرت**ی خۆشەویستت بە تەواوەتی هاوڕایە لەگەڵم بۆ ئەوەی بڕۆیتە خێوەتگەکە و گوایە ناردنی ئەو بیانوویەکە بۆ ئەوەی لە کۆڵ من و تۆیش ببێتەوە.
توانیم ڕۆژێک بەر لە سەفەرکردنەکەی چەند دەقەیەک لەگەڵ **لۆلیتادا** تەنیا ببمەوە. شۆرتێکی منداڵانە و قەمیسێکی ڕوونی لەبەر کردبوو. بۆ گاڵتەکردن هێندێک قسەم بۆی کرد، لێوەکانی گوشین و ورتەورتێکی تەمومژاوی لێوە هات، بەبێ ئەوەی سەیرم بکات.
بە زۆڵێتییەوە دەستی بە سمتی کێشا و گوتی: "گورزێکی بە هێزی لە قوڵم دا."
بۆ ئێوارەکەیشی سازشی نەکرد و نەهاتە خوارەوە بۆ ئەوەی خواردن لەگەڵ دایکی و هەمبەرتدا بخوات، قژەکەی شۆرد و چووە سەر جێیەکەی و دەستی بە تەماشاکردنی کتێبی هەزەلی کرد.
لە بەیانیی پێنجشەممەدا دایکی زۆر بە ئارامی بردی بۆ خێوەتگەی کچان.
ئەگەر نووسەرێکی لێهاتوو و مەزن هەبوایە و چیرۆکەکەی باس کردبام، دەیگوت: (حاڵی خۆم بۆ خەیاڵی خوێنەر بەجێ دەهێڵم، کە چیم بەسەر هات!) بەڵام من هیچ شتێک بۆ خەیاڵیان بەجێی ناهێڵم و دەیڵێم، کە **لۆلیتام** بۆ هەتاهەتایە خۆش دەویست. لەگەڵ ئەوەیشدا دەمزانی، **لۆلیتا** بۆ هەتاهەتایە بۆ من نابێت، لە مانگی یەناییردا دەبێتە

سیزدە ساڵ، دوای دوو ساڵی تر **لۆلیتا** نابێتەوە بە پەرییەکی هەرزەکاری هار، بەڵکوو دەبێتە کچێکی ئاسایی و دواتر دەبێتە کچە خوێندکارێکی زانکۆ، بەم شێوەیە وشەی *هەتاهەتایە* تەنیا بۆ منە، بۆ عەشق و خۆشەویستیی **لۆلیتای** نەمر و ئەبەدییە، کە لە خوێنمدا ڕەنگ دەداتەوە.

**لۆلیتا**، ئەو چرۆیەی گەلا پەمەییەکانی دەمی نەکردووەتەوە، **لۆلیتای** دەنگبارێکی ناسکی قژهەنگوینیی پڕ، کە هەمیشە دەتوانم دەستی لێ بدەم و بۆنی بکەم و بە دڵ و دەروونم گوێم لێی بێت. بەم شێوەیە پرسیاری ئەوەم دەکرد چۆن دەتوانم بۆ دوو مانگی تەواو نەیبینم؟ لە خۆم دەمپرسی، جلی ژنان لەبەر بکەم و خێوەتگەیەک لە نزیک خێوەتگەی کچەکان هەڵبدەم؟ بەم جۆرە دوو مانگی ژیان لە نزیک جوانی و ناسکییەوە، لە دەست دەدەم، لەگەڵ ئەوەیشدا هیچم پێ ناکرێت.

ئەوەی سەرلەبەیانیی ئەو پێنجشەممەیە ڕووی دا، وەکوو تنۆکێکی هەنگوین بوو، کە بۆ ماوەیەکی زۆر لە پەرداخەکەیدا نامێنێت.

لەسەر جێیەکەم داپەڕیم و سەیری پەنجەرەکەم کرد، گوێم لە دەنگی کۆچکردن بوو، خۆشەویستەکەمم بینی لە دەست خۆری بەیانیان بە دەستی سێبەری بۆ چاوەکانی کردبوو، چاوەڕێی دایکی دەکرد. ئەو ساتە بوو بە ئۆتۆمبێلەکەیەوە هات تاکوو بۆ خێوەتگەکەی ببات. ئۆتۆمبێلەکە لە ڕۆیشتندا بوو، بە دەستی ماڵئاواییی لە خزمەتکارەکەی دەکرد، لەو کاتەدا سەیری سەرەوەی کرد و منی بینی، **لۆلیتا** گەڕایەوە بۆ ماڵ، گوێم لە دەنگی پێیەکانی بوو بە پەیژەکەدا سەردەکەوت، بیجامەکەم لە پێ کرد و دەرکەکەم لەسەر پشت کردەوە، هەستم دەکرد دڵم لە خۆشییان سەما دەکات و لەوەدایە

بتەقێت، هێندەی پێ نەچوو **لۆلیتا** لە بەردەمم دەرکەوت و بە دەم ڕاکردنەوە خۆی هەڵدایە نێوان باسکەکانم و دەمە خۆش و پاک و بێگوناحەکەی خستە نێو دەممەوە و توایەوە و منیش زۆر بە توندی باوەشم پێدا کرد و گوشیم.
دەستی لێ بەردام و گەڕایەوە بۆ ئۆتۆمبێلەکە و قەدەر دیسانەوە دەستی بە بزاوتی خۆی کردەوە، لەگەڵ سەرکەوتنیدا ئۆتۆمبێلەکە کەمێک جووڵایەوە و قاچە زەردەکانی دەرکەوتن.

## ١۶

هێشتا دەستەکانم بۆنی **لۆلیتای** پێوە مابوو، هێشتا هەستی خرۆکەکانی لەشی ئەو هەرزەکارە نەرمە لە دەستەکانمدایە. لە دوای ڕۆیشتنی ئەو چوومە ژوورەکەیەوە و کانتۆری جلەکانی ژێرەوەییم کردەوە و دەموچاوم نوقمی نێو جلە لۆچەکانی کرد، کە بەر جەستەی کەوتبوون. دەیانمخشاندە دەموچاومەوە، پارچەپەڕۆیەکی سوورم بینی، بۆنی عارەقەی **لۆلیتای** لێ دەهات، هەڵمگرت و توند خستمە سەر سینگم.
لە ناکاو گوێم لە دەنگی لویزی خزمەتکار بوو، بانگی دەکردم، کاتێک ڕووم تێی کرد، گوتی نامەیەکی لایە بۆ من نێردراوە، بە دەستە لەرزۆکەکانمەوە نامەکەم لێ وەرگرت و تێیدا ئەوەم خوێندەوە:
"ئەمە نامە نییە بەڵکوو دانپیانانە بەوەی کە تۆم خۆش دەوێت (بەم شێوەیە دەستم بە نامەکە کرد. بە هۆی ناشرینیی نووسینەکەوە وامزانی **لۆلیتا** نووسیویەتی) ئەم نامەیەم لە دوای ئەوە نووسی کە لە کەنیسەدا داوای

لێبووردنم لە کردەوەکانم کرد و ئیلهامی ئەم ڕێچارەیەیان پێم دا. هیچ دەرفەتێکم نییە بۆ هەڵهاتن لەو مەسەلەیە."
لە یەکەم چرکەوە من تۆم خۆش ویست. تۆم وەکوو خۆشەویستی ژیانم دۆزییەوە. من ژنێکم ململانێ لەگەڵ تەنیاییدا دەکەم.
ئێستایش ئەی ئازیزترین کەسم! ڕاستییەکانت بۆ دەرکەوت لە خوێندنەوەی نووسینەکانی پێشوو.
بەم شێوەیەی من تکات لێ دەکەم شتەکانت کۆ بکەیتەوە و هەر ئێستا بڕۆی و ئەو ماڵە بەجێ بێڵی. بە سیفەتی ئەوەی خاوەنی ئەو ماڵەم فەرمانت پێی دەدەم وەکوو کرێچییەک ئەو ماڵە بەجێ بهێڵی. دەرت دەکەمە دەرەوە. بەڵێ خۆشەویسترین خۆشەویست! بڕۆ. من ئێوارە دەگەڕێمەوە و نامەوێت لەو ماڵەدا بمێنی. تکات لێ دەکەم هەر ئێستا بڕۆی و ئەم نامە بێمانایەیش تا کۆتایی نەخوێنیتەوە.
ئازیزەکەم! مەسەلەکە زۆر ڕوونە. من باش دەزانم کە من هیچ گرینگییەکم لای تۆ نییە. بەڵێ. تۆ پێت خۆش بوو قسەمان لەگەڵ بکەی و کەشی ماڵەکەت پێ خۆش بوو. بەڵام من وەکوو بووکەشووشەیەکی فەرامۆشکراو بووم بۆ تۆ. وا نییە؟
ئەگەر بڕیارت دابوو ئەم دانپیانانە بخوێنیتەوە. ئەوا بە خراپترین تاوانباری لەڕێلادراوت وەسف دەکەم کە منداڵێک لاقە دەکات. ئەگەر بڕیارت دا لە دوای خوێندنەوەی نامەکە دۆخەکە باش بکەیت و من بە دەست بێنی.
بەم شێوەیە. ئەگەر بڕیارتدا بمێنی (دەیشزانم کە نامێنی) ئەوا مانەوەی تۆ واتای ئەوەیە کە تۆ هێندەی ویستی من بۆ تۆ. من وەکوو هاوبەشی ژیان دەوێت و ئامادەم بۆ هەتاهەتایە ژیانم ببەستم بە ژیانتەوە و ببیتە باوکی کچە بچووکەکەم.

خۆشەویستەکەم! لە ماوەی مانگی (یۆنیۆ)دا. چ جیهانێکی خۆشەویستیم بۆت بونیاد نا. تۆ چەند پارێزکاری! ئەم جورئەتەی من تا چەند دەتهەژێنێت.
تا ئێرە هەوەسی خۆتت تێر کرد. بەڵام لە بارەی نامەکەوە، ئەگەر ناواکارییەکەمت فەرامۆش کرد و تا کۆتایی نامەکەت خوێندەوە، کێشەیەک نییە بیدڕێنە و بڕۆ بە حاڵی خۆتەوە و بیرت نەچێت ناونیشانی خۆتم بۆ بەجێ بهێڵە. تاکوو مافی کرێکەتت بۆ بگەڕێنمەوە کە ناوتە بۆ ئەم مانگە.
ماڵئاوا ئازیزترین خۆشەویست! نوێژم بۆ بکە ئەگەر نوێژ دەکەی. **شارلۆت هیز**.

لە دوای خوێندنەوەی نامەکە کاردانەوەی یەکەم کە دایپۆشیم، هەستی سەرسووڕمان و پەشۆکاوی بوو، دواتر وەکوو بڵێی دەستێکی هاوڕێ بەسەر شانی دام و هێوری کردمەوە، دوای ئەوەی ئارام بوومەوە و لە پەشۆکاوییەکەم دەرچووم، سەرلەنوێ خۆمم لە ژوورەکەی **لۆلیتادا** بینییەوە، لەسەر دیوارەکەدا ریکلامێکم بینی کە بڕدراوی پەڕەی گۆڤارێک بوو؛ زاوایەکی قژڕەشی چاوشین.
(لۆلۆ)یش بە قەڵەمی (هەزل) تیرێکی بۆ دەموچاوی پاڵەوانەکە کێشابوو و نووسیبوی (هـ هـ) لە ڕاستیدا لێچووەکە زۆر نیزیک بوو ئەگەر جیاوازیی تەمەن نەبوایە.
ریکلامێکی دیکەی ڕەنگاوڕەنگی لەژێرەوە هەڵواسرابوو، وێنەی نووسەرێکی شانۆ بوو، کە نمایشی جگەرەی (درووم)ی دەکرد، لێرەدا لێچووەکان بوونە مایەی گومان بۆم.
دڵنیا بوومەوە لەوەی کە خزمەتکارەکەیش ڕۆیشت. لەسەر جێیەکەی (لۆ) ڕاکشام و دووبارە نامەکەم خوێندەوە.

# ١٧

جەنابی دادوەران: ناتوانم سویندتان بۆ بخۆم کە پێشتر هیچ هەست و هەڵچوونێکی تایبەتم لەسەر ئەو بابەتە بە بیر نایەت، لەوانەیە لە پێناو ئەوەی بە ئاسانی بگەم بە **لۆلیتای** کچی، چەند چرکەساتێک بە شێوەیەکی بابەتییانە، مەسەلەی هاوسەرگیری لەگەڵ بێوەژنێکی کامڵی وەکوو شارلۆت هێزدا کاریگەریی کردبێتە سەرم.

بەڵکوو ئامادە بووم بەو کەسانەیش کە ئەشکەنجەم دەدەن، بڵێم، من بە چاوی مشتەرییەوە سەیری لێوە سوورەکانی شارلۆت و قژ و سینگە ورووژێنەرەکەیم دەکرد و هەوڵم دەدا بە شێوەیەکی تەمومژاوی بیکەمە یەکێک لە زیندەخەونەکانم.

من ددان بەوەدا دەنێم کە لەژێر کاریگەریی ئەشکەنجەدام، لەوانەیە ئەشکەنجەیەکی وەهمی بێت، بەلام ئەشکەنجەیەکی ترسناکە.

بەهەرحاڵ. نامەکەی شارلۆتم دڕاند و چوومە ژوورەکەی خۆمەوە و قژم چاک کردەوە و بیرم لەو دەستبازییانە دەکردەوە کە وەکوو هاوسەری دایکی، دەتوانم لەگەڵ **لۆلیتادا** بیکەم، وێنای ئەوەم کرد کە ڕۆژانە سێ جار باوەشی پێدا بکەم.

دواتر زۆر بە ئاگاییەوە وەکوو هاوبەشی ژیانم وێنای شارلۆت و جێی نووستنەکەم کرد و بیرم لە خۆم کردەوە وەکوو هاوسەرێک کار بۆ دابینکردنی هۆیەکانی ژیانی بەختەوەری دەکەم.

هەمبەرت هەمبەرت کە لەژێر تیشکی لێکۆڵینەوەدا ئارەقی دەڕشت و پیاوانی پۆلیسیش کە بە هەمان شێوە ئارەقیان دەڕشت، ڕایاندەکێشا و پاڵیان پێوە دەنا.

هەمبەرت هەمبەرت، کە ڕووناکی، ویژدانی کردەوە، دانپیدانانێکی دیکەیشی خستە ڕوو:

بەڵێ من زەواجم لەگەڵ شارلۆتی داماودا بۆ ئەوە نەکرد کە بە شێوەیەکی دڕندانە لە ناوی بەرم و ترشۆکی جیوە بکەمە پێکی شەرابەکەیەوە، هەرگیز بیرم لەوە نەکردەوە. وێنای ئەوەم دەکرد، کە هاوسەری شارلۆتم و حەبی خەو دەکەمە نێو خواردنەوەی دایک و کچەکەیەوە بۆ ئەوەی بە درێژاییی شەو چێژ لە کچەکە وەربگرم، بەبێ ئەوەی هیچ شتێک بێزارم بکات، بەو شێوەیە هیچ سزایەک نادرێم، لەو کاتانەی شارلۆت پرخەی خەوی دێت و **لۆلیتایش** وەکوو بووکەشووشەیەکی بۆیەکراو لە هەناسەدان کەوتووە.

بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر دایکەکە بخوازم لەوانەیە بتوانم هەڕەشەی ئەوەی لێ بکەم ئەگەر ڕێم پێ نەدات وەکوو زڕباوکێک لە **لۆلیتا** نێزیک ببمەوە ئەوا بەجێی دێڵم. بە کورتییەکەی بەرلەوەی شارلۆت هێز پێشنیاری هاوسەریم بۆ بکات، وەکوو ئادەم وا بووم کە لە بەهەشت دەرکرا؛ بێهێز و بێچارە بووم.

ئێستایش ئاگاداری ئەو تێبینییە گرینگە بن:

کەسایەتیی من وەکوو هونەرمەندێک باڵی بەسەر ئەو کەسایەتییەمدا پۆشی کە وەکوو پیاوێکی باش دەربکەوم، دوای ئەوەی کە شارلۆت پێشنیاری زەواجی بۆم کرد، ڕووداوەکان لە هزرمدا زیاتر پێشکەوتنیان بە خۆوە بینی و کار گەیشتە ئەوەی بیکوژم.

بەم شێوەیە ئارەزووی ئەوەم هەبوو ماوەی دوو بۆ سێ سەعاتی ڕارایی و سەرقاڵبوون بۆ شارلۆت دروست بکەم، تاکوو لە پێچاوپێچەکانی ڕێی گەڕانەوەدا تووشی ڕووداوێکی هاتوچۆ ببێت. چونکە شارلۆت لە کاتی هەڵچوونیدا بە خێراییەکی شێتانەوە ئۆتۆمبێل لێ دەخوڕێت، دواتریش دەتوانم پێی بڵێم تەلەفۆنم بۆ خێوەتگەکە کردووە، بەڵام کەمێک دوا کەوتم، بۆیە لەگەڵ **لۆلیتا** قسەم کردووە و فریای تۆ نەکەوتووم چونکە خێوەتگەکەت بەجێ هێشتبوو.

لەگەڵ **لۆلیتا** قسەم کرد و بە لەرزینەوە پێم گوت کە دایکی دەخوازم، ناچار بووم دوو جار ئەو هەواڵەی بۆ دووبارە بکەمەوە، پێ دەچوو شتێک مێشکی **لۆلیتای** سەرقاڵ کردبوو، فکری زۆر لام نەبوو، بەڵام دواتر گوێم لێ بوو بە پێکەنینەوە گوتی:

- ئۆهـ کارێکی باشە، کەی ئاهەنگەکەیە؟

ئا ڕاوەستە ئەو سەگە نەفرەتلێکراوە قاچم دەلیسێتەوە.

لێرەدا تەلەفۆنەکەی داخست، هەستم کرد خۆشییەکانی ژیان لە خێوەتگەکەدا، بیرەوەرییەکانی هەمبەرتی لای **لۆلیتا** پەردەپۆش کردووە، بەڵام ئایا ئەو کارە هیچ گرینگییەکی هەیە؟ دەتوانم بە بۆنەی ئاهەنگی هاوسەریم بیگەڕێنمەوە بۆ ماڵ، دوای تەلەفۆنەکە ڕووم کردە سەلاجەکە بۆ ئەوەی بزانم چیی تێدایە، سەیرم کرد شتەکانی ناوی تێک چوونە، دواتر چوومە بازاڕ هێندێک خواردنی خۆش و گرانترین مەیم کڕی. من دڵنیام بەوەی کە لە ڕێی ئەو مادە (چالاککەرەوانە)وە بە پشتیوانیی بەهرەکانم، دەتوانم خۆم لە هەموو شەرمەزارییەک لابدەم کە دەبێتە هۆی ساردبوونەوەم لەگەڵیدا، دەبێت مەیلی گڕدار و بەهێز بنوێنم بۆ ئەو بێوەژنە.

هەولم دا پشت بە خەیاڵەکانم ببەستم بۆ ئەوەی وێنەیەک بۆ شارلۆت دروست بکەم کە ئارەزووم بچێتە سەری. هەولم دا وێنای جەستەی پری وەکوو خۆشکێکی **لۆلیتا** لێ بکەم نەک وەکوو دایکی. هەرچەندە من بە خەیاڵیش وەکوو ژنێکی قوونقورس و ڕانئەستوور و سینەپڕ و ڕەنگی قرمزی دەیبینم، ژنێکی شێکە لە دیدی منەوە، بەڵام گەمژەیەکی چارسکەریشە.

خۆر بەرەو ئاوابوون لار بووبووەوە. سێیەم پێکی تێکەڵەی جن و شەربەتی ئەنانسم تێکرد بۆ ئەوەی ئازایەتیی دەروونی خۆم کۆ بکەمەوە و خۆمم بە باخچەکەوە سەرقاڵ کرد و ئەو شوێنانەم چاک کردەوە کە فەرامۆش کرابوون و چاویشم گۆشەی ئەو شەقامەی دادەماڵی کە شارلۆتی لێوە دێت.

دوای ماوەیەک شارلۆت بە ئۆتۆمبیلەکەی هاتەوە و بۆ پشتی ماڵەکەی پێچی کردەوە. توانیم ڕووخسارە ئارامەکەی ببینم، وام دانابوو، شارلۆت هەتا نەچێتە سەرەوە بەوە نازانێت کە من ڕۆیشتووم یان نا. دوای خولەکێک، بە نیگایەکی نیگەرانەوە کە نازارەکەی ئاشکرا دەکرد، لە پەنجەرەی ژوورەکەی **لۆلیتاوە** سەیرێکی کرد، منیش بە پەلە بە پەیژەکاندا چوومە سەرەوە تاکوو بەرلەوەی لە ژوورەکەی **لۆلیتا** دەربچێت فریای بکەوم.

## ۱۸

ئەگەر بووکە بێوەژن بێت و پیاوەکەیش پێشتر جیا بووبێتەوە و بووکە دوو ساڵە لەو شارەدا بێت، زاوایش مانگێک. کاتێک زاوا دەیەوێت بە خێرایی کۆتایی بە سەودایەکی نەفرەتلێکراو بێنێت و

بووکە بە بزەیەکی لێبووردەوە ڕادەستی ئارەزووەکانی دەبێت، ئەوکات ئاهەنگێکی ئارام و دوور لە مەراسیمی تایبەت بەڕێوە دەچێت.

پێم خۆش بوو **لۆلیتا** ئامادەی ئاهەنگەکە بێت، بوونی ئەو هاندەرێک بوو بۆ من لەوەی ئاهەنگەکە خۆشتر بێت، بەڵام هاوڕا بووم لەگەڵ دایکی لەسەر ئەوەی چەند ڕۆژێکە چووەتە خێوەتگە خۆشەویستەکەی، ئەوە ناهێنێت بیگەڕێنینەوە.

بۆم دەرکەوت کە شارلۆت زۆر واقعییە، هەرچەندە ناتوانێت کۆنترۆڵی دڵ و فرمێسکی بکات، ژنێک بوو خاوەن بنەما و پرەنسیب بوو، دوای ئەوەی ژنە عاشقبووەکەم کەوتە جێخەوی هاوسەرێتییەوە، دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد لە بارەی پێوەندیم لەگەڵ خودا، دەمتوانی بە شێوەیەکی ڕوون وەڵامی بدەمەوە، بەڵام من لە بری ئەوە گوتم ئیمانم بە ڕۆحێکی گەردوونی هەیە. کەمێک سەیری پەنجەکانی کردم و پرسیاری کرد هیچ نەخۆشییەکی بۆماوەییت هەیە؟ ڕووبەڕووی بوومەوە بەوەی ئایا ئامادەیە هاوسەریم لەگەڵ بکات ئەگەر بزانێت باوکی باپیری دایکم تورک بووە؟

گوتی ئەوە گرینگ نییە، بەڵام ئەگەر ڕۆژێک بزانێت کە ئیمانم بە یەسووعی خودا نییە، ئەوە ئامادەیە خۆی بکوژێت، ئەو قسەیەیشی زۆر بە جددی کرد، موچڕکێکی خستە لەشمەوە.

ژنێکی زۆربلێ بوو، پێی خۆش بوو لای هاوڕێیەکانی دەستبازیم لەگەڵ بکات. خۆشحاڵیش دەبوو، چونکە وێنەیەکی خۆم و ئەوم لە ڕۆژنامەیەکدا بڵاو کردەوە کە دیدارێکیان لەگەڵم ساز دابوو، تەنانەت چاوپۆشیی لەو هەڵەیەی گۆڤارەکەیش کرد کە بە ناوی شارلۆت هیز ناوی بردبوو.

دوو مانگی پێ نەچوو بووە خانمێکی دیاری شاری (ڕامسدێل) بەو پێیەی هاوسەری (مستەر ئەدغار هـ هەمبەرت)ی نووسەر و ڕەوندی ناسراوە (بۆ ڕازیکردنی ئەو، ناوی ئەدغاریشم بۆ ناوەکەی زیاد کرد.) لە دیدارە ڕۆژنامەوانییەکەدا ئەوەم دایە بەری کە من و شارلۆت ماوەی ١٣ ساڵە یەک دەناسین و لە نزیکەوە هاوسەری پێشووی دەناسم و بەر لە ١٣ ساڵ پێوەندیی سۆزداریمان هەبووە، (ئێستایش با لە چیرۆکە نامۆکەمان بەردەوام بین.)

پێ دەچێت پرسیاری ئەوە لای خوێنەر دروست ببێت، ئایا هەستم بە تاڵی و بێزاری نەدەکرد لەوەی لە پلەی کرێچییەوە بەرز بوومەوە بۆ پلەی عاشق.

نەخێر، هەستم بەوە نەکرد، بەڵکوو پێ دەچێت هەستم بە ختووکەی غروور کردبێت و ئەو هەستەم پێ خۆش بووبێت. بەڵام هەستە ڕوونەکە ئەوە بوو کە گاڵتەم بە هیز دەهات، چونکە ئیمانێکی کوێری بە حیکمەتی کەنیسە و کتێبەکەی و دابونەریتەکەی هەبوو، بە شێوەیەکی توند وابەستەی پرەنسیپەکانی نەریتی کۆمەڵایەتی بوو. بیرم دێت لە ژوورەکەی لۆلیتادا دەستم بۆ درێژ کرد، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و ڕاچڵەکی و گوتی:

. نا نا تکایە، لە نەریتی کۆمەڵایەتیدا زۆر شەرمەزارییە ژنێک لە ژووری کچەکەیدا خۆی ڕادەست بکات، تەنانەت ئەگەر لە ماڵەوەیش نەبێت.

شێوەی خۆی لە بێوەژنێکی بەجێماوەوە گۆڕی بۆ ژنێکی عاشق و بزە ساختەکانی بوونە بزەی ڕاستەقینە و تیشکی خۆشی و شەیدایی و بەختەوەری پێوە دیار بوو، بەر لەوەی بچینە سەر جێی نووستن چەند پێکێک ویسکیمان دەخواردەوە تاکوو لەو کاتانەی کە لەگەڵ

ژنیکدا دەستبازی دەکەم، هاوکاریم بکات، بەوەی لە خەیاڵەکانمدا وەکوو منداڵیک ببینم، هەموو خەیاڵەکانم کۆ دەکردەوە و لە قژەکەی شارلۆتدا قژی **لۆلیتام** دەبینی و لە سینگیدا بۆنی سینگی **لۆلیتام** دەکرد، هەمیشە دەمگوت ژنێکی هەمەچەشنم هەیە وەکوو ژیان، کە جەستەی ئەو جەستەی **لۆلیتایە**. لەگەڵ خۆمدا دەمگوت ژنێکی هەمەچەشنم هەیە وەکوو ژیان، کە جەستەی لە ڕووی بایۆلۆژییەوە نزیکترە لەوەی بمگەیەنێت بە جەستەی **لۆلیتا**. بەوە دڵی خۆمم خۆش دەکرد کە لەشی دایکی **لۆلیتا** وەکوو **لۆلیتای** کچی خۆش بووە لەو کاتانەی کە خوێندکار بووە و لە تەمەنی ئێستای کچەکەیدا بووە، داوام لێ کرد وێنەی منداڵیم پیشان بدات، بۆ ئەوەی ڕووخساری **لۆلیتا** بناسمەوە لە کاتی منداڵیدا.

بەم شێوەیە لەسەر جێی هاوسەرێتیدا لە پەنجەرەیەکی ڕابردووەوە دەمڕوانییە ژنەکەم بۆ ئەوەی لە ڕێی خەیاڵەوە وەکوو **لۆلیتا** لە شێوەی هەرزەکارێکی هارەوە ببینم، پشتیشم بە تاریکی دەبەست کاتێک سنووریم تێدەپەڕاند.

ناتوانم پێتان بڵێم ژنەکەم چەندە بەستەزمان و نەرمونیان بوو. بەیانیان خۆی بە کراسێکی سوورەوە دەئاڵاند و لەسەر مێزەکە دادەنیشت و سەری دەکردە سەر دەستی و بە نیگای نەرمەوە لێی دەڕوانیم، کاتێک نانی بەیانیانم دەخوارد لە ڕووخسارمدا جوانی دەبینی، هەرچەندە هێندێک جار تووشی تووڕەیی گڕی دەسەند.

بێدەنگییە کپەکەی منیش لای ئەو وەکوو بێدەنگیی خۆشەویستی بوو، کاتێک داهاتی پارە کەمەکەی خۆمم دەخستە سەر پارە کەمترەکەی شارلۆت، لای ئەو وەکوو سامانێکی گەورە بوو، چونکە کۆی داهاتەکەمان بەشی ئەوەی دەکرد پێداویستیی ئەو کەسانە پڕ بکاتەوە

که لە چینی ناوەڕاستدان، لەگەڵ ئەوەشدا سامانی من لە چاوەکانیدا دەدرەوشایەوە، وەکوو درەوشانەوەی نیشانەکانی پیاوەتیم بوو.

لە ماوەی ئەو پەنجا ڕۆژەی کە هاوسەرێتیم لەگەڵ ئەو ژنە داماوەدا کرد، شارلۆت ناچار بوو ئەو چالاکییانەی پێشتر دەستی لێیان هەلگرتبوو، دووبارە بگەڕێتەوە سەری، خۆی بە هێندێک کارەوە سەرقاڵ کرد کە ماوەیەکی دووروودرێژ لە بیری کردبوون، پێ دەچێت پێشتر هێندێک لەو کارانەشی هەر نەکردبێت، ژنەکەم هەوڵی مەحاڵی دا وەکوو تازەبووکێک ژیان بگەڕێنێتەوە بۆ ماڵەکەی و باشیش دەیزانی کە من تەنیا پێوەندییەکی سۆزداریم لەگەڵ ئەو ماڵەدا هەبوو، بەڵام نەیتوانی درک بەوە بکات کە هۆکاری پێوەندیی من بەوەوە بۆ کاریکی زۆر قێزەوەن و ناشیرینە.

شارلۆت هەوڵی دا ژیانی هاوسەرێتی بە تازەکردنەوەی کەلوپەلەکانی نێو ماڵەکەی جوان بکاتەوە. لە ڕاستیدا ئەو کەسانەی کە پێوەندیی دۆستانەیان لەگەڵ شارلۆت هەبوو، ئەندامانی خێزانی (فارلۆ) بوون کە تازە لە گەشتێکی بازرگانی لە وڵاتی چیلییەوە هاتبوونەوە و ئامادەی ئاهەنگەکەیشمان بوون.

## ١٩

پێویستە هێندێک قسەی باش لەسەر ژنەکەم بڵێم بەر لەوەی کار لە کار بترازێت (چونکە ڕووداوێکی دڵتەزێن بەم نزیکانە ڕوو دەدات.)

لە سەرەتاوە درکم بەوە کرد کە ئارەزووی ئەوەی هەبوو کاریگەر بێت، بەڵام هەرگیز بیرم لەوە نەکردبووەوە کە بەو شێوە شێتانە دڵپیس بێت و غیرە بکات، بە تەواوەتی ژیانی داگیر کردم و بە زەبری

زۆرداری وردەکارییەکانی ژیانی ڕابردووی پێ دەرخستم- سەبارەت بە پەیوەندییە سۆزدارییەکانم، تەنانەت وای لێدەکردم سووکایەتی بەو کەسانە بکەم کە خۆشیانم ویستوون، دەیویست ڕابردووم ویران بکات و بە تەواوەتی چیرۆکی هاوسەرێتیم لەگەڵ ڤالێرا بۆی باس کرد، بەڵام ناچار بووم ئەو چیرۆکە شتی زۆری تێدا بگۆڕم تاکوو غرووری ڕازی بکەم.

هەرچەندە بە شێوەیەکی ناشیرین وێنای سۆزدارییەکانی پێشووم بۆی بکردایە ئەو شادییەکی میهرەبان دەیگرت.

هەرگیز لە ژیانی پێشوومدا هێندە ململانێم لەگەڵ ئەو دانپێدانانەدا نەکردبوو، کە بۆ شارلۆتم کرد. بەهەمان شێوە ئەویش باسی هەموو پەیوەندییەکانی خۆی بۆ کردم، لە یەکەم ئەزموونی باوەشپێداکردنەوە تا دوایین باوەش، سەرەڕۆییەکانی ئەو لە ڕووی ڕەوشتەوە بە بەراورد لەگەڵ سەرەڕۆییەکانی من زۆر پاک بوون، بەڵام شێوەی کاریگەرییەکان لە ژیان و ناخماندا هاوشێوە بوو.

لە شارلۆتەوە فێری هێندێک ڕێوشوێنی دەستبازیی نوێ بووم، ئەو دەستبازییانەیش بۆ من کارێکی خۆش بوون، ئەو ڕێوشوێنانەی شتی جوان بوون و دەستبازییەکانی منی بە خۆش و گونجاو نەدەزانی.

ئەم خاڵانە گرینگترین خاڵی ژیانە قورسەکەی شارلۆت بوون، زۆر بە کەمی باسی لۆلیتای دەکرد، هەمیشە باسی لە منداڵێکی زەردتاڵ دەکرد کە لە دەستی دابوو، هەمیشە لە زیندەخەونەکانیدا پێشبینیی ئەوەی دەکرد کە بەشێوەی کوڕێک دەگەڕێتەوە ژیان و لە ڕێی منەوە دووگیان دەبێت.

هەرچەندە من بیرم لەوە نەکردبووەوە کە برایەک بۆ لۆلیتا دروست بکەم لە دایکییەوە (دەبینن چۆن دەستم بەوە کرد کە لۆلیتا وەکوو

کچی خۆم بزانم)، بەڵام ڕۆیشتنی شارلۆت بۆ نەخۆشخانە و بۆ منداڵبوون لە بەهاری داهاتوودا، هەلێکم بۆ دەرەخسێنێت، کە بە تەنیا بیمەوە، بە تایبەتی کە ئەگەر دۆخەکە وا پێویست بکات نەشتەرگەرییەکی قەیسەری بۆ شارلۆت بکرێت، خەیاڵی ئەوەم دەکرد کە کاتێک حەبی خەوتن دەدەمە **لۆلیتا** دەبێت چەند چێژی لێ وەربگرم.

شارلۆت هەمیشە ڕقی لە **لۆلیتا** بوو و هەمیشە بە منداڵێکی یاخی و سلبی و ڕاڕا و کەللەڕەقی دەزانی، هەمیشە ئارەزووی ئەوەی دەکرد بە خەراپە باسی بکات.

## ٢٠

دواحەفتەی مانگی یۆلیۆ زۆر گەرم بوو، من و ژنەکەم هەموو ڕۆژێک دەڕۆیشتین بۆ زەریاچەکە، هێندە دوور نەبوو لە ماڵمانەوە، چەند کیلۆمەترێک بوو.

پێم وایە باسی وردەکاریی دوایین جار بکەم، کە لە بەیانییانێکی سێشەممەدا مەلەمان کرد.

ئۆتۆمبێلەکەمان لە شوێنی تایبەت دانا و بڕیارمان دا ڕێیەکی کورتکراو بگرینە بەر لەنێو دارستانی سنۆبەرەکانەوە، بۆ ئەوەی بگەین بە زەریاچەکەمان، پیاسە و قسەمان پێکەوە دەکرد، باسی قسەوقسەلۆکی کەپلداریی دراوسێیەکەمانی دەکرد و گوتی:

- هەمبەرت دەزانی ماوەیەک خەونێکی جددی بووەتە ئاواتم؟

کاتێک ئەم قسەیەی کرد سەری دانەواند و وەکوو ئەوەی شەرم بکات لە خەونەکەی، گوتی:

ـ ئارەزووی ئەوەم هەیە خزمەتکاریکی ڕاستەقینەی مەشقپێکراوی وەکوو خزمەتکارە ئەڵمانییەکەی ماڵی (تالبوت)ی دراوسێمانم لە ماڵەوە هەبێت.
لە وەڵامدا گوتم ماڵەکە جێی خزمەتکاری تێدا نابێتەوە.
لە وەڵامدا گوتی: تۆ هێشتا هەست بە گەورەیی ماڵەکەمان ناکەی، دەتوانین لە ژوورەکەی **لۆلیتا** دایبنێین. بەهەرحاڵ، من بەنیازم بیکەم بە ژووری میوان چونکە ئەوە بە کون دەچێت و بە ژوور ناچێت.
هەستم کرد خوێن لە لەشمدا بەرز بووەوە و پێم گوت:
ـ باسی چی دەکەی! (ئەم قسەیەم بە زمانێکی قیزەون و هەڵچوون و دەرخستنی باوەڕنەکردنەوە کرد.)
ـ پێت ناخۆشە شانۆی بیرەوەرییە ڕۆمانتیکییەکانت لابدەم (ئەو باسی ئەو ڕۆژەی دەکرد کە بۆ یەکەم جار خۆی ڕادەستم کرد.)
ـ نەخێر، ئەی کچەکەت لە کوێ دادەنێی ئەگەر میوانێکت هات، یاخود ئەگەر خزمەتکاریکت هەبوو؟
بە بزەیەکی خەوناوییەوە گوتی:
ـ ئەها مەبەستت **لۆلیتا**یە، دەترسم شوێنی لای ئێمە نەمابێت، لە دوای خێوەتگەکە ڕەوانەی خوێندنگەیەکی ناوخۆیی دەکەم کە خوێندنی تێدا زۆر باش بێت و سیستمی خوێندنیان ئایینی و گونجاو بێت، بەڵێ، هەموو شتێکم بۆی ئامادە کردووە. تۆ بێخەم بە.
لەم کاتانەدا لەوەدا بووین بگەین بە زەریاچە شەپۆلبریقەدارەکە، پێم گوت، چاویلکەکەم لە ئۆتۆمبیلەکەدا بەجێ هێشتووە و دەڕۆم دەیهێنم و دەگەڕێمەوە.
هەمیشە وامدەزانی دەستبەرزکردنەوە بۆ پاڕانەوە لە جوولەی دەستی شانۆگەرییەکانی سەدەی ناوەڕاستەوە بۆمان ماوەتەوە، بەڵام ئەمرۆ

لە دوای ئەوەی شارلۆت ئەو قسانەی کرد و دەستم بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و گوتم: تەماشا خودایە، ئەم کوتوبەندە تازەیە، کە ئەو ژنە دەیەویت منی پی ببەستیتەوە.

ئەگەر شارلۆت وەکوو **ڤالێریای** هاوسەری یەکەمم بوایە، دەمزانی چۆن چارەسەری دەکەم، لەوکاتەدا دەمتوانی قۆلی **ڤالێریا** سوور بدەم و بە زۆر ڕایەکەی پێ بگۆڕم، بەلام ئێستا ئەم پلانە مەحالە لەگەڵ شارلۆتی ژنە ئەمەریکییەکەمدا جێبەجێ بکەم، کە بە خۆیەوە دەنازێت. بەڕاستی دەیترساندم، لەلایەکی تریشەوە کارێکی گونجاو نییە لە ڕێی خۆشەویستییەکەیەوە هەولی کۆنترۆلکردنی بدەم، نەشمدەویست ئەو وێنەیەی کە لەسەر من دروستی کردووە و دەیپەرستێت بشێوێنم. هەولم دەدا شارلۆت بکەم بە وێنەیەکی گەورەکراوی **لۆلیتا**، بە وێنەی خۆشەویستە ڕاستەقینەکەم، ڕووم خۆش بوو، ئەو ڕووخۆشییەیشم بەردەوام بوو لەگەڵی.

گرینگترین وەرەقەی یارییەکە ئەوە بوو کە شارلۆت بێئاگا بوو لە خۆشەویستییە ترسناک و مەزنەکەم بۆ **لۆلیتای** کچی، هەمیشە هەستم بەوە دەکرد کە ئەگەر **لۆلیتا** مەیلی بە من بدایە ئەو پێی تەنگ دەبوو، بەلام هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان نەیتوانی باسی ئەو هەستانەی بکات، ئەگەر ڤالێری ژنی یەکەمم لە جێی شارلۆت بوایە، پێم دەگوت، گوێ بگرە قەلەوەی گەمژە، من خاوەن فەرمانم لە ڕەتکردنەوەی هەر کارێک کە لە بەرژەوەندی یاخود زیانی **لۆلیتادا** بێت، من هەمبەرتم.

بەلام لەگەڵ شارلۆتدا نەمدەتوانی تەنانەت بلێم: (ببوورە ئازیزەکەم من هاوڕات نیم، بەڵێ ئازیزەکەم با هەلێکی دیکە بە **لۆلیتا** بدەین و ببمە مامۆستای تایبەتیی بۆ ماوەی یەک ساڵ).

لە ڕاستیدا نەمدەتوانی هیچ شتێک لە بارەی **لۆلیتاوە** باس بکەم بەبێ ئەوەی نهێنییەکەم ئاشکرا بێت، چونکە لەو حاڵەتەدا هەستی بەوە دەکرد کە نواندن دەکەم لە دەرخستنی نیازپاکیمدا. لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆی ئەو دابونەریت و ڕێنمایی و ڕەوشتەیەوە، نەیتوانی ئەو ژیانە ساختەیەی دەوروبەری تێبینی بکات. ئەو وەکوو مۆسیقا بوو، دەیتوانی لە ژیانی ئاساییدا ببێتە کەسێکی بازاڕی و بێزەوق، لە هەمان کاتدا بە دیقەتێکی شەیتانانەوە لە پارچەمۆسیقاکاندا دەیتوانی هەر ئاوازێکی نارێک ئاشکرا بکات، واتا وێرانکردنی ئیرادەی شارلۆت پێویستی بە وێرانکردنی دڵێتی، بۆیە ئەگەر منیش دڵی وێران بکەم، ئەوا ئەو وێنەیەی کە بۆ من نەخشاندوویەتی وێران دەبێت، ئەگەر هۆشداریی ئەوەیشم پێ بدایە، کە دەبێت ئازادم بکات لەگەڵ **لۆلیتادا** ئەگینا جیا دەبینەوە، دەمزانی ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕا و دەیگوت:

- باشە با کۆتایی بێت.

بەم شێوەیە کۆتاییەکە هەر دەبێت بێت.

ئەم بیرۆکانە لە ناخمدا جیاوازیی لێ دەکەوتەوە تا ئەو کاتەی گەیشتمەوە ئۆتۆمبێلەکەم، لەوێدا مزەخەیەکی ئاو هەبوو ئاوێکی زۆری وەکوو باران کرد بە سەرمدا، وەکوو بڵێی ئەو ئاوە حیکمەت و گەنجێتی و ئازادی و توانای چارەسەرکردنی کێشەکانی پێ بەخشیم، دواتر لە لێواری دارستانەکە دانیشتم، دوو کچی بچووکم بینی بە شورتێکی کورتەوە، بیرۆکەیەکی زۆر مەترسیدارم بۆ هات، چارەسەرەکە لەوەدایە **مسز هێز** لەناو بەرم. بەڵام چۆن؟

هیچ مرۆڤێک نییە لە دونیادا بتوانێت تاوانێکی بێکەموکوڕی ئەنجام بدات و شوێنەوار و گومانی تێدا بەجێ نەهێڵێت، بەڵام دەکرێت مرۆڤ تاقی بکاتەوە، بەڵکوو هەلێکی بۆ ڕێک کەوت.

لەم بیرۆکەیەدا بووم گەڕامەوە بۆ زەریاچەکە بۆ ئەو شوێنەی من و شارلۆت و چەند دراوسێیەکمان مەلەمان تێدا دەکرد، ئەو شوێنە وەکوو کەنارێکی تایبەت بوو بە ئێمە، چونکە بەردێکی گەورەی لێ بوو چاوی خەڵکی لێ پەردەپۆش دەکردین و وەکوو دەگوترێت (ڕێی بە مەلەکردن و نوقمبوونیش دەدا.)

زۆر بە ناسکی لە تەنیشت هاوسەرەکەم دانیشتم، چونکە ئەو بە شتی ناکاو ڕادەچەڵەکا، پرسیاری کرد:

- خۆمان فڕێ بدەینە نێو ئاوەکەوە.

منیش گوتم بەڵێ، یەک خولەکی تر. چونکە دەمەویست بیرۆکەیەکی نائاسایی لە مێشکمدا یەکلایی بکەمەوە.

دوای زیاتر لە خولەکێک گوتم:

- با مەلەکەمان بکەین.

- چی بوو سواری شەمەندەفەری بیرۆکەکانت بووبووی؟

- بێگومان.

بە دەم خۆهەڵدانییەوە گوتی خوازیارم وا بێت، کاتێک ئاوەکە گەیشتە سمتەکانی دوای کەوتم و بینیم دەستەکانی کردەوە بۆ ئەوەی بەرەو قووڵاییەکان خۆی نوقم بکات و دواتر دەرکەوتەوە و پرشەئاوی زۆری هەڵدا و تا ناوەڕاستی زەریاچەکە مەلەمان کرد. لەسەر کەناری ئەو لای زەریاچەکە دوو پیاوم بینی بە جددی چاڵێکیان هەڵدەکەند، نێزیکەی هەزار هەنگاو لە ئێمەوە دوور بوون، هەردووکیانم ناسییەوە، یەکێکیان پۆلیسێکی خانەنشین بوو و ئەوەی دیکەیشیان تەنەکچیی ئۆتۆمبێل بوو، زۆربەی دارستانی تەنیشت زەریاچەکە مولکی ئەوان بوو.

سەیرێکی دەوروبەری خۆمم کرد جگە لەو دوو پیاوە دوورە کە سەرقاڵی کارکردن بوون کەسی ترم نەبینی، هەموو شتێک ئامادە بوو وەکوو تەختەی شانۆی تاوانی کوشتنێکی ناکاو، هەردوو پیاوەکە دەیانتوانی لە شوێنەکەی خۆیانەوە ڕووداوێکی نوقمبوون و خنکانی کەسێک ببینن لە زەریاچەکە، بەڵام نەیاندەتوانی ئەنجامدانی تاوانێکی ئارام ببینن، بەتایبەتی ئەگەر تاوانەکە لەلایەن هاوسەرێکەوە بێت کە لەگەڵ ژنەکەی مەلە دەکات و نوقمی بکات و لەژێر ئاوەکە بیخنکێنێت.

بەڵێ، ئەو دوو پیاوە ئەوەندە نێزیک بوون کە تواناى ئەوەیان هەبوو گوێیان لە دەنگی شلپەی ئاوەکە بێت، لەوکاتانەی کەسێک دەخنکێت، بەتایبەتی ئەگەر ژن بێت و هاوار بکات، بەڵام نەیاندەتوانی مەلەکردن و یاریکردنی دوو هاوسەر جیا بکەنەوە کە پیاوەکەی لەژێر ئاوەکەوە قاچی ڕادەکێشێت.

هێشتا بە شێوەیەکی کرداری نەگەیشتبوومە قۆناغی جێبەجێکردنی پیلانەکەم، بەڵام نەخشەی وێنەیەکی واقعیم لە زەینی خۆمدا دەکێشا بۆ ئەوەی دۆخەکە ئاسان بکەمەوە و بیگونجێنم، گەیشتم بەوەی کە زیاتر بەرەو قووڵایی بڕۆم و هەناسەیەکی قووڵ هەڵمژم و پاژنەی بگرم و تەرمەدیلەکە بەرەو قووڵایی ڕابکێشم، کە دەڵێم تەرمەکە، چونکە شارلۆت کەمئەزموونە و ڕاستەوخۆ گالۆنێک ئاوی سوێر قووت دەدات و بۆ ماوەی یەک دەقیقە بە نوقمکراوی کۆتایی پێ دەهێنم.

ڕووداوەکەم وا وێنا کرد کە بە تروووکانی چاو بەڕێوە بچێت، وەکوو خێرایی کلکی ئەستێرەی کشاو لە تاریکیی ئاسماندا جێبەجێ دەبێت. پێم وا بوو کە دەتوانم دیسان بچمەوە سەرەوەی ئاوەکە بۆ ئەوەی هەناسەیکی دیکەی قووڵ وەربگرمەوە و دەستیشم بە دیلەکەمەوە

بێت لەژێر ئاوەکەدا، دوای تێپەڕبوونی بیست دەقیقە، دوو پیاوەکە بە دەنگ هاواری منەوە بە بەلەمێکەوە دێن، بەلام دوای ئەوەی کە هەموو شتێکت کۆتایی دێت.

خوێنەرانی ئازیز! کارەکە زۆر ئاسانە، بەلام لەگەل ئەوەیشدا نەمتوانی ئەنجامی بدەم!

شارلۆت بە ئەوپەڕی دڵنیاییەوە مەلەی لەگەلم دەکرد، بەلام توندی تینم بۆ لۆلیتا هاواری بە گوێمدا دەکرد بۆ ئەوەی تاوانێک بکەم و ئێستا کاتی تاوانەکە هاتووە، بەلام نەمتوانی، ڕووم کردە کەناری زەریاچەکە ئەویش دوام کەوت، بەلام ڕێنوومایە شەیتانییەکە لە گوێمدا دەیزرینگاندەوە، ڕاسپاردەیەک بوو لە دۆزەخەوە بەرەو گوێیەکانم بەرز دەبووەوە، درکم بەو ڕاستییە خەمگینە کرد کە نە ئەمڕۆ و نەیش سبەی و نە ڕۆژێکی تر من ناتوانم کۆتایی بە ژیانی بێنم.

لەوانەیە ئەگەر سالی ١٤٤٧ بوایە لە بری ١٩٤٧، ئەوکات دەمتوانی چارەسەری بکەم و ژەهرم دەکردە نێو خواردنەکەیەوە و زۆر بە هێمنی دەمرد، بەلام لەم سەردەمەدا پشکنینی تاوانەکان پێش کەوتووە و لەم ڕۆژانەدا ئەگەر بتەوێت پیاوکوژ بیت، دەبێت زانایەکی جیهانی سروشت بیت.

بەلام من زانا نیم و پیاوکوژ نیم و نەشمدەویست هیچ کام لەوانە بم.

جەنابی دادوەران:

زۆربەی ئەو کەسانەی لادەرن و پێوەندیی جەستەییی گەرم لەگەل کچێکی هەرزەکار دەکەن، کەسانێکن کەسایەتییان نامۆیە، بەلام زیانبەخش نین، بەلکوو ئەوان سەلامەت و ئارامن، تەنیا داوای ئەوە دەکەن کۆمەل ڕێیان پێ بدات ڕەفتارە نازیانبەخشەکانیان ئەنجام

بدەن، کە پێی دەگوترێت رەفتاری لادەر، ئەوەی داوای دەکەن ئەوەیە لادانەکانیان ئەنجام بدەن (کە لە ڕووی کردارییەوە زیانبەخش نییە) بە ئارامی و بەبێ ئەوەی کۆمەڵ و پۆلیس (قامچیی ئازار)یان لەگەڵدا بەکار بهێنن.

ئێمە لاقەی کچان ناکەین وەکوو ئەو سەربازانەی کە لە ڕۆژە زێرینەکاندا دەیکەن، ئێمە پیاوگەلێکی ئارام و بەئەدەبین، ڕەوشتمان هاوشێوەی ڕەوشتی خوێندکارێکە، بەشبەحاڵی خۆمان ڕێز لە خۆمان دەگرین، بە شێوەیەک کۆنترۆڵی هەستەکانمان دەکەین لە بەرانبەر ئەو کچانەی کە ئامادەین چەندەها ساڵی تەمەنمان ببەخشین تەنیا بۆ دەستلێدانی هەرزەکارێکی پارچەڵەی هاربوو بۆ سێکس.

بەڵێ ئێمە پیاوکوژ نین، شاعیرەکان هەرگیز تاوانی کوشتن ئەنجام نادەن، ئێمەیش چەشنی شاعیرین.

ئای شارلۆتی ئازیز! بە هیوام ڕقت لێم نەبێت ئەو کاتەی لە ماڵی تاماندای لەنێو ڕۆحە هەتاهەتاییەکاندا لەوێ...

با بگەڕێینەوە بۆ باسەکەمان:

گەڕاینەوە بۆ کەناری زەریاچەکە و لەسەر خاولییەکان دانیشتن و خۆمان دایە بەر هەتاوەکە، شارلۆت پشکنینێکی دەوروبەری کرد و جلی مەلەوانییەکەی لابرد و لەسەر سکی ڕاکشا- بۆ ئەوەی پشتی داپۆشێت و هەلێک برەخسێنێت بۆ دەستبازیکردنی من و خۆر.

گوتی خۆشتم دەوێت و هەناسەیەکی هەڵکێشا و دواتر دانیشت و دەستی بۆ گیرفانی برد، بە دوای جگەرەدا دەگەڕا، جگەرەیەکی داگیرساند و خۆی بەرەو من لار کردەوە و ماچێکی بەهێزی کردم بەو دەمەی کە پیس بۆنی جگەرەی لێ دەهات، لێرەدا هەستمان بە

جوولەیەک کرد لەنێو درەختەکاندا، بینیمان (جین فارلۆ)یە و کەرەستەی وێنەکێشانی پێیە، شارلۆت پێی گوت: ئێمەت ترساندا.

جین گوتی هەوڵی ئەوەم دەدا وێنەی زەریاچەکە بکێشم. بەڵام مەحاڵە، ئاخر شێوەکارێکی بەهرەمەند نەبوو، ئەوەندەی بەس بوو سەیری سروشت بکات، بەڵێ ئەوە کاری سێخورەکانە، هەمیشە هونەرمەندێکی خراپن، چونکە ناتوانن گوزارشت بکەن، ناچارن بەرهەمەکانیان لە سێخوڕیدا بڕێژن. جین گوتی لەو شوێنەوەی کە وەستابوونم بە ڕوونی ئێوەم بینی، تەنانەت توانیبووی ئەوەیش ببینێت کە من بە سەعاتەکەی دەستمەوە مەلەوانیم کردووە.

خۆی ڕێک خستەوە و گوتی: 'ئێوارانێک لە کاتی نزیک خۆرئاوابووندا کچوکوڕێکم بینی لە سەرەتای تەمەنیاندا بوون، پێکی شەرابیان دەنۆشی، سێبەرەکانیان لەگەڵ ڕووناکییەکاندا بە شێوەیەکی زۆر سەرسووڕهێنەر درێژ بووبوونەوە.'

## ٢١

هەرشتێک بێزاری کردبێتم، هەمیشە بێدەنگیم هەڵبژاردووە، هاوسەری یەکەمم بەوە تووڕە دەبوو و تووڕەییەکەی گڕی دەسەند و دەیگوت: (ئەوەی شێتم دەکات ئەوەیە کە نازانم بیر لە چی دەکەیتەوە، ئەوکاتانەی بە جۆرێکی جیاواز بیر دەکەیتەوە.)

هەوڵم دەدا لەگەڵ شارلۆتیشدا بێدەنگ بم، بەڵام ئەو بێدەنگییەکەی دەشکاندم و باوەشی پێدا دەکردم و پشتملی ماچ دەکردم، ژنێکی سەرسووڕهێنەر بوو، زۆر جار بیانووی ئەوەم بۆی دەهێنایەوە کە

شتێکم لە مێشکدایە و دەبێت بینووسم و دەڕۆیشتم بۆ ژوورەکەم، بەڵام شارلۆت بە شادییەوە سەرقاڵی کارەکانی دەبوو بێباک لە بێدەنگییەکەم.
حەفتەیەکی تر لە بێتاقەتی بەسەر دواسەردانماندا بۆ زەریاچەکە تێپەڕی، لە هەموو تەمەنمدا بیرم نایەت حەفتەیەکی ئاوا درێژم لە خەمۆکی و بێتاقەتیدا بەسەر بردبێت، دواتر لە ئاسمانەوە هەستم بە سەرەداوی ڕووناکییەک کرد.
تا ڕادەیەک کەسێکی ژیرم و عەقڵم بە باشیی ئەرکەکانی جێبەجێ دەکات، بۆیە پێویستە بە کاری بێنم، لەگەڵ خۆمدا گوتم دەبێت دەست وەربدەمە ئەو پلانانەی کە شارلۆت دایدەڕێژێت بۆ ئاییندەی کچەکەی، کە لە ئێستادا لەو خێوەتگەیەدا ڕۆژبەڕۆژ زیاتر ئەسمەر دەبێتەوە، دەتوانم هێندێک ڕێوشوێنی ناڕاستەوخۆ بگرمە بەر بۆ ئەوەی لە ڕێی پلانەکانییەوە هەلێک بۆ خۆم بڕەخسێنم.
لە ڕاستیدا شارلۆت خۆی ڕێی بۆ کردمەوە، لەو ئێوارەیەدا کە لەسەر نانخواردن بووین بە نیگایەکەوە سەیری دەکردم و گوتی:
- سوپرایزێکم بۆت هەیە، ئەم پاییزە من و تۆ دەچین بۆ بەریتانیا.
لێوم بە کلینکس سڕی و پێم گوت:
- منیش سوپرایزێکم بۆ تۆ هەیە، من و تۆ ناڕۆین بۆ بەریتانیا.
کاتێک ئەو قسانەم دەکرد نیشانەی سەرسووڕمانێکی زیادی پێوە دیار بوو لەوە زیاتر بوو کە من پێشبینیم دەکرد:
- بۆ؟ هۆکار چییە؟
لەو کاتەدا کلینیکسێکم بە دەستەوە بوو بەبێ ویست دەمدڕاند، بەڵام ئەو بزەیەی کە لە ڕووخسارمدا بوو کەمێک هێوری کردەوە و بەردەوام بوو لە گوێگرتن، گوتم:

- هۆکارەکەی ئاسانە، نابێت ژن تەنیا خۆی هەموو بڕیارەکانی ماڵەوە بدات، بەو پێیەی ئێستا لە ڕووی شیاوی و تەواوکارییەوە بووەتە ماڵی هەردووکمان، هێندێک کار هەیە پێویستە پیاو خۆی بیکات، من دەتوانم وێنای ئەوە بکەم کە چەند دڵخۆش و شادی، تۆ ژنێکی ئەمەریکیت، وا ڕاهاتووی پشت بە خۆت ببەستی، بەو پاپۆڕەی کە زەریای ئەتڵەسی پێ دەپەڕێنیتەوە دەتوانم وێنات بکەم چەند گەش و بەختەوەری تێدا کاتێک لەگەڵ شای (گۆشتە بەستووەکان) یاخود لەگەڵ لەشفرۆشێکی هۆلیووددا بی. گومانم لەوە نییە کە من و تۆ ببینە بابەتێکی باش بۆ وێنەیەک کە نووسینگەکانی گەشتیاری بەکاری بێنن، وێنەیەکی تۆ کە بە سەرسووڕمانەوە دەڕوانیتە پاسەوانی شاهانەی بەریتانیا، منیش لە وێنەکەدا دەبێت سەرسووڕمانی خۆم خەفە بکەم، بەڵام دەبێت ئەوە بزانی کە ئەورووپا بەو بەریتانیا کۆنەیشییەوە، تووشی بێتاقەتیم دەکەن، جگە لە بیرەوەریی ناخۆش هیچی ترم تێدا نییە، هیچ ڕیکلامێکی ڕەنگاورەنگی گۆڤارەکانی ئەمەریکایش ناتوانن هەڵوێستم بگۆڕێت.

شارڵۆت ویستی قسەکانم ببڕێت و نیازپاکیی خۆی ڕوون بکاتەوە، پێم گوت:

- ڕاوەستە ئەو بابەتەی کە باسی دەکەم بابەتێکی ئاساییە، بەڵام ئەوەی بۆ من گرینگە بنەمای گشتیی پێوەندیی هاوسەرێتیمانە. ئەو کاتانەی دوای نیوەڕۆ لەسەر زەریاچەکە ویستت بەسەری بەرین، بە قسەتم کرد و لە پێناوی شادیی تۆ بێدەنگ بووم، لە کاتێکدا دەبوایە نووسینە ئەدەبییەکەم تەواو بکەم، لە پێناو تۆ بووم بە گەنجێکی ڕۆحسووکی خاوەن جەستەیەکی سوور، لە بری ئەوەی ببمە مامۆستایەکی بەویقار، لەگەڵ ماڵی ئاڵ هارلی دراوسێت پەلکێشت

کردم بۆ یاریی ناپلیۆن و خواردنەوەی ویسکی، خۆمم بچووک کردەوە و دوات کەوتم. هەرگیز دەستکاریی ئەمماڵەم نەکرد کە تۆ دەیڕازێنیتەوە، هەرچەندە ڕای جیاوازیشم هەبێت تۆ بڕیار لەسەر کارەکانی نێو ماڵەکەم دەدەیت، هەرچەندە هێندێک حاڵەتی تایبەت هەیە خۆم ئەو حاڵەتانەم فەرامۆش کردووە و پێم باشە سەرپەرشتی کارەکان بکەی، بەڵام هەموو یارییەک ڕێوشوێنی خۆی هەیە، منیش بووکەشووشەیەکی فەرامۆشکراو نیم، بەڵکوو نیوەی ئەم ماڵەم و دەبێت قسە و دەنگی منیشی تێدا بێت.

لەم کاتانەدا شارلۆت نێزیکم بووەوە و لەسەر چۆک کەوت و لاقی گرتم و گوتی ئاگام لەو شتانە نەبووە و تۆ گەورەی ماڵەکەمی و پێشنیاری کرد باوەشی پێدا بکەم و گوتی ئەگەر لێی خۆش نەبم ئەوە دەمرێت.

ئەم ڕووداوە سادەیە گرۆتینی گەورەی پێدام و پێم گوت مەسەلەکە ئەوە نییە لێت خۆش بم یان نا، بەڵکوو مەسەلەکە ئەوەیە مامەڵەکردنت بگۆڕی، ئەو بەستەزمانەیش خۆی بێدەنگ کرد و منیش بڕیارمدا دەرفەت بقۆزمەوە و کاتێکی باش بۆ نووسینەکەم تەرخان بکەم و خۆم وا پیشان بدەم کە سەرقاڵی نووسینم.

دوو ڕۆژ دوای ئەو ڕووداوە لە ژوورەکەی خۆمدا بووم. لەناو کورسییەکەم خۆمم نوقم کردبوو. شارلۆت لە دەرکەی دا، ئای خودایە لێدانی درکەی **لۆلیتا** و ئەو چەندە جیاوازە، کاتێک بە بیجامەیەکی پیاوانەوە دەهاتە ژوورەوە و بۆنێکی خۆشی لێ دەهات، وەکوو بۆنی گوڵی دوورگەی پەرییە هارەکان بوو، کاتێک لاقێکی پێش دەخست و لاقێکی دوا دەخست و ناز و لارولەنجەی دەکرد، گۆشە

بەرزەکانی سینگی لە نێوان کراسەکەیەوە دەردەکەوت کە هەمیشە هەموو قوپچەکانی دانەدەخست.
هەولم دا وەکوو نووسەرێک خۆم پیشان بدەم، دواتر، خۆمم وا پیشان دا کە نوقمی نێو نووسینم و بە ئاگابییەوە لێم نیزیک بووەوە و لەسەر دەسکی کورسییەکە دانیشت، وا هەستم کرد کە هەمان ئەو بۆنەی بەکار هێناوە کە ژنی یەکەمم بەکاری دەهێنا. گوتی:
- حەز دەکەی بۆ ئەم ئێوارەیە شتێکی تایبەتت بۆ دروست بکەم، جۆن و جێن هارنۆ ئەمشەو سەردانمان دەکەن.
بە ورتەورتێکەوە وەلامیم دایەوە و لێوی ماچ کردم و گوتی کێکی گەورە ئامادە دەکەم و بەتەنیا جێی هێشتم.
بەرلەوەش پرسیاری یەکێک لەو باولانەی لێ کردم کە هەمیشە، کلۆم دراوە، لە وەلامدانەوەی هەلهاتم، دوای ئەو پشکنینی حەشارگەی کلیلی باولەکەم کرد، بینیم کلیلەکە لە جێی خۆیەتی، هەرچەندە کارێکی قورسە مرۆڤ شتێک لە هاوسەرەکەی بشارێتەوە، کە هەمیشە بەئاگایە بۆ ئەوەی هەموو کەرستەکانی مالەوە بپشکنێت.

## ٢٢

پێم وایە حەفتەیەک بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕی کە لە زەریاچەکە مەلەمان کرد، شارلۆت لە خوێندنگە ناوخۆییەکەوە ئاگانامەیەکی پێگەیشت بەوەی کە دوا کەوتووە لە داواکاریی تۆمارکردنی ناوی کچەکەی، بەلام ئەگەر بۆ مانگی کانوونی دووەم سەردانی ئیدارەی خوێندنگەکە بکەن ئەوە ڕێوشوێنی وەرگرتنەکەی جێبەجێ دەکەن.

لە ڕۆژی دواتر و لە دوای نانخواردنی نیوەڕۆ سەردانی دوکتۆری خێزانەکەمانم کرد، کەسێکی ڕەوشتجوان دیار بوو، ڕەوشتجوانییەکەی وای لێ کردبوو، ئەو نەزانییەی لە بواری پزیشکیدا هەیەتی دەرنەکەوێت، چونکە ئەو تەنیا یەک جۆری دەرمانی بە هەموو نەخۆشەکان دەدا.

ئەو ڕۆژە لە ڕادەبەدەر دڵخۆش بووم، نێزیکبوونەوەی هاتنەوەی **لۆلیتا** بۆ ڕامسدێل وەکوو کانییەک وا بوو کە قوومی چێژم لێی وەردەگرت. ویستم بەتەواوەتی خۆم ئامادە بکەم، هەڵمەتەکەشم لە دوای بڕیارە قورسەکانی شارلۆتەوە دەستی پێ کرد کە بۆ لابردنی **لۆلیتا** دەری دەکردن.

دەبوایە دڵنیا بم لەوەی ڕێوشوێنی تەواوم هەیە بۆ ئەوەی خەوتنێکی قووڵ بۆ **لۆلیتا** و دایکی دابین بکەم، بە شێوەیەک هیچ دەنگەدەنگ و دەستلێدانێک نەتوانێت خەبەریان بکاتەوە، لەو شەوانەی پێش ئەوەی خوێندنگە بکرێتەوە و **لۆلیتام** لە دەست بکاتەوە.

لەسەر ئەو بنەمایە بە درێژاییی مانگی تەمووز چەندین جۆر دەرمانی خەوم لەسەر شارلۆت تاقی کردەوە، بیرم دێت بۆ دوایین جار کە دەرمانێکم پێ دا بۆ هێورکردنەوەی دەمارەکان، بۆ ماوەی چەند سەعاتێک شارلۆتی خەواند و لەو کاتەدا ڕادیۆیەکەم بە بەرزترین دەنگ کردەوە و چونجوڕکم لێ گرت و ماچم دەکرد و ڕامکێشا و ڕووتم کردەوە و دەمجووڵاند، بەڵام هیچکام لەوانە نەیتوانی سیستمی هەناسەدانی تێک بدات و لەو خەوە قووڵەی خەبەری بکاتەوە، ئەمە لە کاتێکدایە کە بەبێ ئەو دەرمانانە بە بچووکترین ماچ شارلۆت وەکوو ئەسپ بەئاگا دەهات.

لەگەڵ ئەوەشدا دەرئەنجامی ئەو دەرمانە نەیتوانی قایلم بکات و پێویستم بە شتێکی بەهێزتر بوو تاکوو دڵنیابم، دووبارە سەردانی دوکتۆرەکەم کردەوە و گوتم ئەو دەرمانەی کە پێت دابووم بۆ ئەوەی پشووم پێبدات، نەیتوانی پشووم بداتێ. دوکتۆرەکە تووشی سەرسوورمان بوو و بڕوای پێ نەکردم و داوای کرد کە دووبارە دەرمانەکە تاقی بکەمەوە و ویستی باسەکە بگۆڕێت و وێنەی کچەکەی پیشاندام کە لە تەمەنی **لۆلیتادا** بوو، بەڵام من تێگەیشتم لە مەبەستەکەی و زۆرم لێ کرد دەرمانێکی بەهێزترم بۆ بنووسێت کە بتوانێت بمخەوێنێت، دوای ئەو هەوڵانە گوتی حەبێکی دیکەت بۆ دەنووسم کە دەرئەنجام باشی هەبێت و لە دۆلابەکەیەوە دەرمانێکی وەنەوشەیی دەرکرد و گوتی ئەمە دوایین داهێنانی پزیشکییە و بۆ ئەو کەسانە نییە کە دەکرێت بە سەتڵێک ئاو چارەسەر ببێت، بەڵکوو ئەمە بۆ ماندووبوونی هونەرمەندەکانە کە هەرگیز ناتوانن بخەون.
دڵخۆشبووم کە فێڵەکەم سەرکەوتوو بوو لەگەڵ دوکتۆرەکە، چونکە پێمخۆشە دوکتۆرەکان هەڵخەڵەتێنم، بەڵام من نیشانەکانی دڵخۆشیی خۆمم شاردەوە و حەبەکانم برد و بەگومانەوە دوکتۆرەکەم بەجێ هێشت، دەبوایە بەئاگابم لێی چونکە جارێکیان لە زمانم دەرچوو و باسی نەخۆشخانە دەروونییەکەم بۆی کرد، بینیم گوێچکەکانی دەهاتنە لای دەممەوە بۆ ئەوەی قسەی بۆ بکەم.
دەبوایە لە شارلۆت و کەسانی تریش بەئاگابم، کە هیچ شتێک لە بارەی ئەو کاتەی ژیانم نەزانن، بۆیە بە دوکتۆرەکەم گوت بۆ توێژینەوەیەکی دەروونیی شێتەکان ڕووم کردووەتە ئەو نەخۆشخانەیە تاکوو لە یەکێک لە چیرۆکەکانم بەکاری بهێنم.

دڵم خۆش بوو کە دوکتۆرەکەم بەجێ هێشت، هەستم بە شادی دەکرد و سووکانی ئۆتۆمبێلی ژنەکەم گرتبوو و بە متمانە و دڵنیاییەوە پەنجەکانم خستبوونە سەر سووکانە و لێمدەخوڕی، هەموو دونیا بۆم پێدەکەنی.

ڕۆژێک بەر لە سەردانیکردنی دوکتۆرەکە، کۆتاییم بەو گۆشەگیرییە هێنا کە بەسەر خۆمدا سەپاندبووم، بەم شێوەیە ئەمڕۆ لە دوای گەڕانەوەم هاوارێکم کرد کە گوزارشتی لە دڵخۆشیم دەکرد بە گەڕانەوەم بۆ ماڵ، بینیم شارلۆت لە هۆڵەکە تەنوورەیەکی قاوەیی و کراسیکی زەردی لەبەردایە، تەنیا لە یەکەم ڕۆژدا ئەو جلەم لەبەری بینی، خۆی چەماندبووەوە و سەرقاڵی نووسینی نامەیەک بوو، دیسانەوە هاوارێکی دیکەم کرد کە نیشانەی دڵخۆشیی پێوە دیار بوو، شارلۆت لە نووسین وەستایەوە و بۆ تاوێک نەجووڵا و ئاوڕی دایەوە و دەستی خستە سەر پشتی کورسییەکەی و ڕووخساری زۆر بە ئاڵۆزی دەرکەوت، هەڵچوونێکی مەترسیداری پێوە دیار بوو، هێندەی پێ نەچوو ئەو دایکەپشیلە پیرە و دەسەڵاتدارە وەکوو سەگێکی دڕندە هاوارێکی کرد بە ڕوومدا و گوتی:

- شارلۆتە گەمژەکەت چیتر نابێتە بووکەسەماکەری دەستی تۆ... ئەو... ئەو...

وەستایەوە لە قسەکردن و قووتێکی خواردەوە و دەستی کردەوە بە هێرشەکەی و گوتی:

- تۆ ئەژدیهایەکی دڕندەی، تاوانبارێکی بەدڕەوشتی، ئاگادار بە! نیزیک نەبیتەوە لێم. هاوارێک دەکەم، خەڵکت لێ ئاگادار دەکەمەوە، دوورکەوە لێم.

پێ دەچێ ئەو ورتەورتەی لە منەوە هات بۆ وەڵامدانەوەی، هیچ لە دۆخەکەی نەگۆڕیبێ. بۆیە شایەنی باس نییە، شارلۆت گوتی:
. ئەمشەو من دەڕۆم و ماڵەکەت بۆ جێ دەهێڵم، بەڵام هەرگیز ئەو منداڵە داماوە بە چاو نابینیتەوە، دەی لاچۆ لەبەر چاوم.
خوێنەری ئازیز! بە قسەییم کرد و چوومە ژوورەکەمەوە، کە هەمیشە خۆمم تێدا تەنیا دەکردەوە، کاتێک بینیم ئەو باوڵەی کە نووسینە نهێنییەکانمی تێدەکەم شکاوە و تاوێک وەستام و دەفتەری بیرەوەرییەکانم لەژێر سەرینەکەم دەرهێنا و کردمە گیرفانمەوە، کاتێک بە پێپلکانەکاندا دادەبەزیم گوێم لێبوو بە تەلەفۆن قسە دەکات، هەناسەی خۆمم بڕی بۆ ئەوەی گوێم لە قسەکانی بێت، لەوە تێگەیشتم کە شتێکی کڕیوە و پەشیمان بووەتەوە لێی و داوای کرد کە بۆی نەهێنن، چوومە موبەقەکەوە و سەری بتڵێک ویسکیم کردەوە، دەمزانی شارلۆت ناتوانێت بەرگری لە ویسکی بکات و ڕەتی بکاتەوە، ڕووم کردە هۆڵەکە، لە ناوەڕواستی دەرکەکە وەستام و بە هێمنییەوە گوتم:
. شارلۆت! تۆ ژیانی من و ژیانی خۆت دەڕووخێنی، با ژیر و وشیار بین. تۆ شێتی شارلۆت! ئەوەی لە مێشکی تۆدایە دەرئەنجامی کاریگەریی وێناکردن و وەهمەکانتە، ئەو شتانەی لە دۆلابەکەمدا خوێندووتنەوە چەند بەشێکن لە ڕۆمانێک، بەڵام کە ناوی تۆ و **لۆلیتام** بەکار هێناوە، ڕێکەوتە، چونکە لەو کاتەدا تەنیا ئەو دوو ناوە بە مێشکمدا هات، بە باشی بیر لە مەسەلەکە بکەوە و ئێستا پێکێکت بۆ دەهێنم.

هیچ وەڵامی نەدایەوە و ئاوڕیشی نەدایەوە و بەردەوام بوو لە نووسین، لەو کاتەدا سەرقاڵی نووسینی سێیەم نامە بوو، چونکە دوو نامەی داخراوم بینی لە تەنیشتییەوە بوو و ناونیشانیان لەسەر بوو.

لە مووبەقەکە بووم و دوو پێکم ئامادەکرد و بیرم لەوە دەکردەوە کە دەکرێت دووبارە بیرەوەرییەکانم بخوێنێتەوە، کێشەم نییە، چونکە من جەختم لەوە دەکردەوە کە ئەو نووسینانە بۆ نووسینی ڕۆمانێکی خەیاڵی بووە و باشتر وایە شتێک بخەمە سەر نووسینەکان و لەبەردەستیدا بێت، کە پێوەندیی بە ناوەڕۆکی نووسینەکانی پێشووەوە هەبێت، تاکوو بەڵگە بۆ قسەکانم بهێنمەوە، سەلاجەکەم کردەوە و وێنەکەی **لۆلیتا** لەبەردەمم سەمای دەکرد، سەهۆڵم دەردەهێنا، دوو پێکەکەم گرت بە دەستەوە و لەبەر دەرکەی هۆڵەکە بووم، لەنێو درزی باریکی دەرکەوە گوتم:

- پێکێکم بۆت تێ کرد.

بەڵام ئەو سەگە هارە هێندە تووڕە بوو وەڵامی نەدامەوە و هەردوو پێکەکەم لە تەنیشت تەلەفۆنەکە دانا بۆ ئەوەی وەڵامی زەنگەکە بدەمەوە، دەستکی تەلەفۆنەکەم هەڵگرت، پیاوێک بوو، گوتی:

- من لێزلی تومسۆنم، ئۆتۆمبێلێک لە ژنەکەتی داوە، پێویستە ئێستا بێی!

بە ڕەوشتێکی جوانەوە پێم گوت ژنەکەم باشە و بڕوا ناکەم ئەوە ژنی من بێت. هێشتا دەسکی تەلەفۆنەکەم بەدەستەوە بوو گوتم:

- ئازیزەکەم! ئەوە پیاوێک لە تەلەفۆنەکە دەڵێت گوایە تۆ مردوویت و ئۆتۆمبێل لێتی داوە.

سەیری هۆڵەکەم کرد، هیچ شوێنەوارێکی شارلۆت نەبوو. هانام بردە دەرەوە، بەرەو شەقامەکە، دیمەنێکی سەیرم بینی، ئۆتۆمبێلێکی

دواتر پارچە دڕاوەکانی نامەکەی شارلۆتم پشکنی، یەکێکیان ئاراستەی **لۆلیتا** کرابوو و ئەوەی دووەمیش ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە لەگەڵ **لۆلیتا** رابکەن بۆ شوێنی لەدایکبوونیان، بەو پێیەی دەترسێت **لۆلیتا** تووشی مەترسی ببێت، ئەوەی سێیەمیشیان داواکاریی تۆمارکردنی ناوی **لۆلیتا** بوو لە خوێندنگەیەکی زۆر توندوتیژ کە بە (گرتووخانەی کچان) ناسرابوو.

لە ناکاو ماڵ چۆڵ بوو و جۆن بۆ پێشوازیکردن لە کڕیارێکی ڕۆیشت و جینیش بۆ ئەوەی خۆراک بە سەگەکەیان بدات ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆیان، بەم شێوەیە هاوڕێتیی ئەو دوو هاوسەرەم لە دەست دا کە ترسی ئەوەیان هەبوو خۆم بکوژم، ئەگەر بە تەنیا بمێنمەوە، هێندەی پێ نەچوو (لترلی و لویزی هاوسەری) لەسەر داواکاریی جین هاتنە سەردانم، بەڵام کاتێک جۆن و جین فارلۆ هاتنەوە، وێنەیەکی منداڵی شارلۆتم نیشانیان دا کە لە نێوان کەرەستەکانیدا دۆزیمەوە، لە وێنەکەدا شارلۆت پێدەکەنی و با قژی هەڵدەدایەوە، لە پشتی وێنەکەشەوە ئاماژە بۆ ئەوە کرابوو کە وێنەکە لە ساڵی ١٩٣٤ لە شاری بێسکی گیراوە، منیش گوتم لەو ساڵەدا بۆ سەردانێکی کارکردن هاتمە ئەمەریکا و هاوینم لە بیسکی بەڕێکرد و چاوم بە شارلۆت کەوت و پێوەندیی سۆزداریم لەگەڵیدا بەست، کاتێکیش گەڕامەوە بۆ ئەورووپا لە ڕێی برادەرێکەوە کە ئێستا مردووە بەردەوام بووین لە نووسینی نامە بۆ یەکدی، دواتریش هاتمەوە بۆ ماڵەکەی و هاوسەرێتیمان پێک هێنا.

جین چرپاندی بە گوێی هاوسەرەکەیدا و گوتی پێشتر پڕوپاگەندەیەکی وام بیستووە و ئەویش سەرێکی لەراندەوە و قسەکەی پەسند کرد، دواتر ماڵەکەیان جێهێشت و چەند سەعاتێکی

پێ نەچوو، قەشەی ناوچەکە هاتە سەردانم و هەوڵی زۆرم دا کە سەردانەکەی کورت بکەم، بەبێ ئەوەی هەستی بریندار بکەم و دووپاتم کردەوە بۆی کە هەموو ژیانم تەرخان دەکەم بۆ ئەوەی لۆلیتا بەخێو بکەم و خاچێکی شارلۆتم نیشانی دا و گوتم بە شارلۆت پێی داوم، باسی ئەوەشم بۆی کرد کە کچەمامێکم هەیە لە نیو یۆرک، زۆر بەڕێزە و لە خوێندنگەیەکی باشدایە، سەرپەرشتی خوێندنی لۆلیتا دەکات.

بەڵێ، چەندە میهرەبان بووم لەگەڵی!

لە پێناو لیزلی و لویز و بەهیوای ئەوەی ئەم هەواڵە بە جۆن و جین بگەیەنن، تەلەفۆنێکی وەهمیم بۆ خێوەتگەکە کرد کە لۆلیتای لێیە، کاتێک جۆن و جێن هاتن، بەو شێوەیە خۆم چارەسەر کرد کە گوایە لۆلیتا لەگەڵ کچە برادەرەکانی چووە بۆ گەشتێک و پێنج ڕۆژیان پێ دەچێت و خۆمم شلەژاند گوایە بیرم لای لۆلیتایە و کەس ناتوانێت تەلەفۆنی بۆ بکات و هەواڵەکەی پێ بگەیەنێت.

جێن گوتی: ئای خودایە چی بکەین؟

جۆن گوتی: زۆر ئاسانە، پۆلیسی کلیماکس ئاگادار بکەنەوە و کاتژمێرێکی پێ ناچێت دەیدۆزنەوە.

پاشان بەردەوام بوو لە قسەکردن و گوتی:

- ڕات چییە ئەگەر بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆم بڕۆم بۆ خێوەتگەکە و هەواڵەکەی پێ بگەیەنم؟

پێشنیارەکەی دووبارە کردەوە و وەکوو بڵێت کە لەگەڵ ژنەکەی بخەوم، ژنەکەشی هێندە بە گەرمی پاڵپشتی لێ دەکرت وەکوو ئەوە بوو کە نیازی هەبێت لە باوەشیدا بخەوم.

هەستم کرد ئەم کارە ئابرووم دەبات، بە جۆنم گوت نەخێر لە شتەکان گەڕێ، تاکوو بە پێی ویستی خۆی بەڕێوەبچێت، گوتیشم حاڵەکەم ڕێی ئەوەم پێ نادات منداڵێک ببینم بە گریانەوە بنووزێتەوە و خۆی بگرێت بە منەوە و ئاگاداریشیم کردەوە لەوەی کە هەواڵەکە تووشی شۆکی دەکات و کاریگەریی دەروونیی لەسەر ئاییندەی دەبێت.

جۆن ڕادەستی قسەکانم بوو، گوتی:

- هەموو مەسەلەکە بۆ خۆت دەگەڕێتەوە، بەڵام من دەمەوێت بزانم چی لەو منداڵە دەکەیت؟

جێن هاواری کردە گیانی و گوتی:

- جۆن تۆ نازانی ئەوە کچی خۆیەتی، نەک کچی هارولد هیز، تێناگەی، هەمبەرت باوکی ڕاستەقینەی **لۆلیتا**یە.

- بەڵێ تێگەیشتم، من داوای لێبووردن دەکەم، ئەوەم لە بیر نەبوو.

- بەڵێ مەسەلەکە ئێستا ئاسان بووەوە، هەمبەرت لەهەموو کەسێک باشتر لە بەرژەوەندیی **لۆلیتا** دەزانێت.

بە خەمبارییەکی زۆرەوە پێیانم ڕاگەیاند لە دوای تەواوبوونی پرسەکە دەچمە شوێنی **لۆلیتا** و هەموو هەوڵێک دەدەم دڵنەواییی بکەم و دڵخۆشی بکەم و لە کەشوهەوایەکی تردا دایدەنێم، لەوانەیشە گەشتێک بۆ کالیفۆڕنیا یاخود نیو مەکسیکۆ بکەین.

نواندنێکی سەختی ئارامیم بۆیان کرد، بە شێوەیەک جۆن و جێن بەزییان بە من دەهاتەوە و منیان بۆ ماڵی خۆیان برد و لە هۆڵەکەیاندا نووستم.

ئێستاش ئەو هۆکارانە شی دەکەمەوە کە بووەتە مایەی ئەوەی کە **لۆلیتا** دوور بخەمەوە.

کاتێک شارلۆت نەما، وەکوو باوکێکی ئازاد هاتمەوە بۆ ماڵ، بە پەلە دوو پێک ویسکیم خواردەوە، دواتر لە دەست هاوڕێ و دراوسێکان هەڵهاتم و چوومە گەرماوەکەوە، مێشکم گەرم بووبوو لە بیرۆکەکان، بیرم لای ئەوە بوو کە دوای چەند سەعاتێکی تر بە جەستە گەرم و قژە هەنگوینییەکەیەوە لە باوەشم دەبێت و فرمێسک دەڕێژێت، منیش بە دەمم فرمێسکەکانی دەسڕم، بە شێوەیەکی خێراتر لەوەی کە دێتە خوارەوە، کاتێک لە حەمامەکە بە چاوێکی کراوەوە سەیری ئاوێنەکەم دەکرد، جۆن فارلۆ لە دەرکەی گەرماوەکەی دا و بە ڕەوشتێکی جوانەوە گوتی، حاڵت باشە؟ لێرەدا بۆم دەرکەوت کە کارێکی شێتانەیە ئەگەر **لۆلیتا** بهێنمەوە بۆ ماڵ و خەڵکم لێ کۆ دەبێتەوە و پلان بۆ ئەوە دادەڕێژن کە لە منی بستێنن.
لەوانەیە **لۆلیتاش** متمانەی بە کەسایەتیم نەبێت، لەوانەیە ترسی لا دروست ببێت و دەستکەوتە زێڕینەکەم لە چرکەساتی سەرکەوتندا لە دەست بچێت و پارووەکە لە قوڕگی خۆمدا دەربکەن.
لە بارەی ئەو کەسانەی کە خۆیان هەڵدەقورتێننە کاروباری دراوسێکانەوە، پێویستە ئاماژە بۆ بێل بکەم کە ڕۆحی ژنەکەمی برد، هاتە سەردانم و خەمۆکیی ڕووخساری پۆشیبوو و وەکوو یاریدەدەری جەللادێک بوو، کە تازە هاتووەتە سەر کار. دوای ئەوە باسی خۆی بۆ کردم کە دوو کچی هەیە و لەگەڵ **لۆلیتادا** دەخوێنن، دواتر نەخشەیەکی شیکاریی لە بارەی ڕووداوەکەوە بۆ کردم و وای دەرخست کە تاوانی نەبووە و سەگێک هاتووەتە پێشی و خۆی لاداوە و ژنەکەم لە ناکاو هاتووەتە پێش ئۆتۆمبێلەکەی و هیچ ڕێیەکی بۆ نەهێشتووەتەوە کە خۆی لێ لابدات.

کاتێک ڕازی بووم بەوەی کە تاوانی نەبووە، لە لووتییەوە هەناسەیەکی گەرمی دەرکرد، وەکوو شیلاوەی ئاگری فڕۆکەکان بوو و گوتی ئامادەیە تێچووی پرسەی ژنەکەم بدات. کە ئەو قسەیەی کرد پێشبینیی ئەوەی دەکرد ڕەتی بکەمەوە، بەڵام بە سوپاسگوزارییەوە قبوولم کرد و بە ساردوسڕییەوە پێشنیارەکەی دووبارە کردەوە و دووبارە بە گەرموگوڕییەوە سوپاسیم کردەوە.
دەرئەنجامی ئەم دیدارە ئەفسووناوییە جوانەش ئەو گرێکوێرەی کە ڕۆحمی سڕ کردبوو بۆ دواجار کرایەوە، کارێکی سەرسووڕهێنەرە کە (بێل) پیاوی قەدەرە و نێردراوێتی، لەسەر شانیمدا و دڵنەواییم کرد، وا هەستم کرد کە یاری بە پارچەکانی قەدەر دەکەم، هەستم بە گۆڕانێکی سەیر و ناکاو کرد لە ناخی خۆمدا، دوای ئەوەی چاوم بە ئامرازەکانی قەدەر کەوت لە لەناوبردنی شارلۆتدا، پێشم وا بوو کە بێل و سەگەکە و ئۆتۆمبێلەکە هەموو ئەو کەرستانە نەبوون لە جێبەجێکردنی قەدەردا، بەڵکوو منیش هاوبەشێکی شاراوەیان بووم.
ئەگەر ئەوەندە گەمژە نەبام و ئەو بیرۆکانەم نەنووسیبانایە و شارلۆت نەیخوێندبانەوە، بەو شێوەیە تووڕە نەدەبوو و هەڵنەدەچوو؛ وەکوو کوێر بەرەو ئەو سندووقی پۆستە نەدەڕۆیشت تاکوو ئۆتۆمبێل لێی بدات.
کاتێک بۆ ماڵئاواییکردن تەوقەم لەگەڵ بێلدا دەکرد، وامدەزانی تەوقە لەگەڵ قەدەردا دەکەم و پیرۆزباییم لێدەکات، چونکە لە قورسایی هەستەکانم ڕزگاری کردم، دەستم کرد بە گریان. جەنابی دادوەران! سوێندتان بۆ دەخۆم کە دەستم بە گریان کرد!

## ٢٤

بارانێکی بەخوڕ دەباری و ڕەشەبایەکی بەهێزیشی لەگەڵدا بوو. سەیری دەوروبەری خۆمم دەکرد و بۆ دوایین جار سەیری شاری ڕامسدالم کرد، چونکە پاڵنەرێک هانی دەدام بۆ ئەوەی سەرەڕۆییەکی شاراوە بکەم و بڕیارم دا ئەو ماڵە خامۆشە بەجێ بێلم کە وەکوو کرێچیی ژوورێک ڕووم لێ کرد و تێیدا ژنم هێنا و ژنەکەم تێیدا مرد. هەموو ئەو ڕووداوانە لە ماوەی دوو مانگدا ڕوویان دا، کاتێک جۆن کەلوپەلەکەی بۆ دەکردمە نێو ئۆتۆمبێلەکەوە، لەبەر چەند هۆکارێک چەند جارێک چوومە ماڵەکەوە، بەڵام ڕووداوێکی سەیر ڕووی دا، نازانم ئەگەر شوێنی ببێتەوە لەم لاپەڕە دراماتیکییانەدا.

نازانم ئەگەر ئەم لاپەڕە دراماتیکییە ئەوەی لە مێشکی خوێنەردا ڕوون کردەوە کە من لە هەموو تەمەن و کەشەکاندا، کاریگەریم لەسەر ژنان هەبوو، ئەوەش بە هۆی جوانیی شێوەمەوە بوو، کە لە نێوان پیاوێکی ڕاستەقینە و بەرائەتی منداڵێکدا بووم.

بە هۆی جوانیی ڕووخسارمەوە، **لۆلیتای** پێگەیشتوو بە سیحری منەوە ئارامی دەیگرت و **لۆلیتای** هەرزەکاری پێگەیشتوویش بە خۆویستییەوە خۆشی ویستم، بەداخم بۆی و ڕێزێکی زۆریشم بۆی هەیە، بە شێوەیەک کە ناتوانم گوزارشتی لێ بکەم.

ڕووداوە سەیرەکەش ئەوە بوو کە جی فارلۆی مێشکتێکچوو، بێگومان جوانیش بوو، لە ناخی خۆیدا مەیلێکی بەهێزی بۆم هەبوو، جێنی بە پەنجە لەرزۆکەکانییەوە هەمیشە نێوچەوانی دەگرتم و فرمێسک لە چاوە شینە بریقەدارەکانییەوە بەخوڕ دەهاتە خوارەوە، بەبێ ئەوەی سەرکەوتن بە دەست بێنێت، هەوڵی دا لێوی بنووسێنێت

بە لێومەوە، لەو کاتەدا هاوسەرەکەی کەلوپەلەکەی بۆ دەگواستمەوە و بە پاڕانەوەوە پێی گوتم:

- ئاگات لە خۆت بێت و کچەکەشت لە بری من ماچ بکە.

لەو کاتەدا گرمەی بریسکەکە هات و ماڵەکەی لەرزاندەوە و گوتی:

- لەوانەیە قەدەر وا بکات کە لە ڕۆژێکی باشتر لە ئەمڕۆ یەک ببینینەوە.

(ئای جین! ئەگەر بە زیندوویی ماوی یاخود بوویت بە خاڵێکی بچووک و لە جیهانەکەی تردا ون بوویتە، بمبوورە کە ئەمە دەنووسم.)

لەبەر ئەو بارانەی کە دونیای دەشۆردەوە تەوقەیەکم لەگەڵی کرد، کەشی ئاسمانیش پێشبینیی تۆفانی لێ دەکرا، بە ئۆتۆمبێلەکەم بەو شوێنەدا تێپەڕیم کە شارلۆت لەسەری مرد، تەرمێکی داڕووخاو بوو بە برژانگە درێژەکانییەوە، کە هێشتا چاوی تەڕی فرمێسکی پێوە مابوو.

## ٢٥

خوێنەر لەوانەیە وا بزانێت بە نەمانی شارلۆت ئیتر هەموو ڕێگرییەکانی بەردەمم کرانەوە و بە ڕێیەکدا دەڕۆم هەمووی خۆشی و شادییە، نەخێر بەو شێوەیە نەبوو.

لەبری ئەوەی بزە لە ڕووخسارم بنەخشێنم، هەموو جۆرەکانی گومان و ترسی ڕەوشت، سوارم بوون، بۆ نموونە: ئایا خەڵک بەوە سەری سووڕ نامێنێت کە **لۆلیتا** لە ئاهەنگ و پرسەی دایکی دیار نەبێ؟

شتێکی تریش: ئەگەر هاتوو قەدەر لە چرکەساتێکدا لە خۆی خۆش نەبێت و دەستی سۆز بەسەر **لۆلیتادا** بێنێت و چەند کەسانێک بهاوێتە سەر شانۆی ڕووداوەکان.

بەم شێوەیە نەمتوانی ئەو بیرۆکانە لە خۆم دوور بگرم بەوەی هاوڕێیان **لۆلیتایان** ئاگادار کردبێتەوە، لەوانەشە هێندێک هاوڕێی هەبێت، کە من نەیاناسم و بەرەو خێوەتگەکە ڕۆیشتبێتن و **لۆلیتایان** بەرەو ماڵەوە هێنابێ.

ئەوەی زۆر نیگەرانی کردبووم ئەوە بوو کە هاووڵاتییەکی ئەمەریکیم و ڕەگێکی ئەورووپیی تەمومژاویم هەیە و هەوڵم بۆ ئەوە نەدا کە ببمە سەرپەرشتیارێکی فەرمیی کچی ژنەکەم کە هێشتا تەمەنی ١٢ ساڵ و ٧ مانگە.

ئایا بوێریی ئەوەم هەیە ئەو هەنگاوە بنێم؟ نەمتوانی ئەو مچوڕکەیە لە خۆمدا سەرکوت بکەم کە دەیهەژاندم، وا هەستم دەکرد کە خۆمم بۆ ڕاستییەکانی جیهانی یاسا و دابونەریتەکان ڕووت کردووەتەوە.

پلانەکەم بۆ بردنی **لۆلیتا** یەکێکە لە سەرەتاییترین هونەرەکان، بریتییە لەوەی پێوەندی بکەم بە خێوەتگەکەوە و بە **لۆلیتا** بڵێم دایکی نەشتەرگەرییەکی وەهمی بۆ دەکرێت و لەگەڵ خۆمدا بیبەم بۆ هۆتێلێک و ناوە بە ناوە پێی بڵێم کە دۆخی دایکی باشە، تا ئەو کاتەی کە هەواڵی کۆچی دایکی پێدەگەیەنم.

بەڵام کاتێک بە ئۆتومبێلەکەم بەرەو خێوەتگەکە چووم، دڵەڕاوکێیەکەم زیادی کرد و توانای ئەوەم نەبوو تەنانەت بیر لەو ئەگەرەش بکەمەوە کە لەوانەیە **لۆلیتا** لەوێ نەبێت، یاخود لەوانەیە **لۆلیتا** داوا لە هاوڕێیەکانی بکات کە لەلایەن خێزانەکانیانەوە هاوکاریی بکەن و من لەگەڵیاندا نەگونجێم و نەتوانم مەبەستەکانم جێبەجێ بکەم.

بۆ دواجار بڕیارم دا ئەو پێوەندییە تەلەفۆنییە بکەم و وا خۆمم نیشان دا کە بەر لە چەند ڕۆژێک پێوەندیم کردووە، بارانیش بەخوڕ دەباری، وەکوو بڵێی لە دەمی ئاسمانەوە دەهاتە خوارەوە. کاتێک لە وێستگەیەکی بەنزینیدا وەستام و لەوێوە لەگەڵ خێوەتگەکەدا بە تەلەفۆن قسەم کرد، بەڕێوەبەری خێوەتگەکە گوتی: **لۆلیتا** لە ڕۆژی دووشەممەوە لەگەڵ هاوڕێیەکانی بۆ گەشتێک ڕۆیشتوون و بڕیارە ئەمشەو درەنگانێک بگەڕێنەوە، پێشنیاری بۆ کردم سبەینێ سەردانەکەم بکەم، بەڵام بەڕێوەبەرەکە پرسیاری هۆکاری سەردانەکەی لێ کردم و منیش بە شێوەیەکی تەمومژاوی پێم گوت کە دایکی نەخۆشە و لە نەخۆشخانەیە و حاڵی باش نییە، بۆیە پێویستە ئامادە بێت بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆم بیبەمەوە، لە دوای گۆڕینەوەی خواستنی بەختێکی باش، تەلەفۆنەکەم کۆتایی پێهێنا.

دوای نیوەڕۆکەم لە کەناری (بارگنتۆن) بەسەر برد، بە کڕینی شتی جوان بۆ **لۆلیتا**، شتگەلێک کە هەرزەکار دڵخۆش بکات.

بۆ هەموو شتێکی جوانی بۆ نەکڕم؟ ئایا ئەو بۆ من نییە؟ وەکوو بیاتریس بۆ دانتی شاعیر؟ لە ناخی خۆمدا دەنگێ نادیار پرسیاری لێ کردم، ئایا نیازی شتێکی تایبەتت هەیە بۆ ئەو کچە هەرزەکارە! بێگومان نیازی کارێکم هەیە.

جلی ژێرەوەی ئاوریشمیی جوانم بۆی کڕی و هەر بەچاو جلەکانم بۆی هەڵدەبژارد و دەمزانی پڕ بە بەریەتی، چونکە پێ ناچێت لە ماوەی ئەم دوو مانگەدا گەورە بوو بێت، دەمتوانی لەبەرچاو وێنای بکەم بە جەستەیەکی نەرم و ڕووناکەوە، دەتوانم مەمکە دیارەکانی ببینم کە جارێک یان دووجار بەر سینەم کەوت، ڕێک بەر دڵم کەوت، دەتوانم هەست بە قورسایی و گەرمیەکەی بکەم لە باوەشمدا، من

خەریکە لەگەل **لۆلیتا** دەبم، وەکوو ئەو دایکەی کە لەگەل کچەکەی دەبێت، من هەموو شتێکی لە بارەوە دەزانم، دوای ئەوەی دڵنیا بووم لە دروستیی پێوەرەکانم و تەواو بووم لە کڕینی کەرەستەکان، تەماشای کەتەلۆگی ڕێنیشاندەری گەشتیاریم کرد، شارۆچکەیەکم دیاری کرد کە چوار سەعات بە ئۆتۆمبێل دوورە لە خێوەتگەکەوە، بڕیارم دا ئەو شارۆچکەیە یەکەم وێستگەی گەشتەکەم بێت لەگەل **لۆلیتادا**، ویستم تەلەفۆن بۆ هۆتێلی شارۆچکەکە بکەم، بۆ ئەوەی دوو ژووور بگرم، بەڵام ترسام زمانە ئینگلیزییە شکاوەکەم ئاشکرام بکات و بڕیارم دا برووسکەیەکیان بۆ بنێرم.

پێویستە ئاماژە بۆ شتێکی پێکەنیناوی بکەم، ئەوەش ئەوە بوو کە زۆر بە قورسی توانیم بروسکەکە دابڕێژم! چی تێدا بنوسم؟ دوو ژوورمان بۆ دیاری بکەن بۆ هەمبەرت و کچە بچووکەکەی؟ یاخود هەمبەرت و کچە جحێڵەکەی؟ یاخود بۆ هەمبەرت و کچە شیرخۆرەکەی؟

دواتر هەمبۆرگم هەڵبژارد. ئەو ڕۆژە بە درێژاییی شەوەکەی نەنووستم، بیرم لەوە دەکردەوە یەکێک لە حەبەکانی نووستن بخۆم بۆ ئەوەی پشوو بدەم؟ دواتر پەشیمان بوومەوە و پێم باش بوو چێژ لە ماندووبوونەکەم وەربگرم، ئەو ماندووبوونەی کە زیندەخەون و ترس ئاوێتەی بووبوون، هەر چرکەیەک لە چرکەکانی یەکسان بوو بە خۆشیی نووستنی یەک نەوە، بەڵێ وەکوو خەڵک دەبێت شەوی بەر لە ئاهەنگەکەم بێدارێکی سەرسەخت بم.

توانیم کاتژمێرێک لە بیدارییەکەم بدزم و تێیدا بە باشی خەوتم و لە کاتژمێری شەشی بەیانیدا خەونێکی ناخۆشم بینی، کە لەگەڵ نێرەمووکێکی تووکندا بووم. خەبەرم بووەوە.

جلەکانم لەبەر کرد، کاتژمێر حەوت بووبوو، بیرم لەوە کردەوە کە بەر لە وادەکە بکەم باشترە، چونکە بە بەڕێوەبەری خێوەتگەکەم گوتبوو دوای نیوەڕۆ بەدوای **لۆلیتادا** دێم. دڵڕاوکێ و ئارەزووەکانم، دەیانویست لە نێوان و من ئەودا، مەودایەک هەبێت، تا وەکوو دەرمانی پڕکردنەوەی تاسەم بەکاری بێنم.

دەشترسام ئەگەر دوا بکەوم زۆر شتی نەخوازراو رووبدات، لەوانەیە کەسێک تەلەفۆنی بۆ بکات لە ڕامسدیلەوە و ڕاستییەکانی پێ بڵێت.

ویستم بەڕێ بکەوم، بینیم پاتری ئۆتۆمبێلەکەم مردووە، بەو هۆیەوە تاکوو دوای نیوەڕۆ نەمتوانی لە بارکینگتۆن دەربچم، کاتژمێر دووونیو بوو گەیشتمە خێوەتگەکە.

ئۆتۆمبێلەکەم لەژێر سێبەری دارسنەوبەردا ڕاگرت و لە منداڵێکی هەرزەکار کە لە تەنیاییەکی تەواودا یاریی دەکرد، پرسیاری نووسینگەی خێوەتگەکەم کرد، چوومە خێوەتگەکە و بەڕێوەبەرەکە پێشوازیی لێ کردم، ژنێکی قژپەشۆکاو بوو و نیگایەکی توندی هەبوو و بە توندی منی پشکنی، دواتر پێی گوتم کە **لۆلیتا** خۆی ئامادەکردووە بۆ دەرچوون و دەشزانێت دایکی نەخۆشە و حاڵی مەترسیدار نییە، پرسیاری ئەوەشی کرد کە ئەگەر ئارەزووی هەیە سەرپەرشتیارانی خێوەتگەکە و ژووری نووستنی کچەکان ببینێت؟

هێندەی پێ نەچوو ئەو ژنە ناشرینە چەکمەجەی مێزەکەی کردەوە و پارەیەکی ئاسنی دەرهێنا و خستییە نێو دەستە لەرزۆکەکەمەوە،

گوتی ئەمە هەموو ئەو پارەیەی کە لە پارەکەی **لۆلیتا** ماوەتەوە و بروانامەکەی **لۆلیتای** پێدام، لەگەڵ راپۆرتێکی رەفتاری **لۆلیتا** لە مانگی یولیودا و تێیدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە ئارەزووی مەلەوانی و بەلەمسواریی هەیە.

کاتێک پشتم لە دەرکە کراوەکەی نووسینگەکە کردبوو، هەستم بەوە دەکرد کە هەموو خوێنەکەم بەرەو سەرم دەروات، گوێم لە هەناسەی **لۆلیتا** بوو- لە پشتمەوە دەهات و جانتاکەی رادەکێشا و هاواری کرد:

.سڵاو!

بە دوو چاوی گەش و بریقەدارەوە بۆ ساتێک وەستا و لێی ڕوانیم، لێوە تەڕەکانی بزەیەکیان کرد، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بزەیە ئەفسووناوی و وروووژێنەر بوو.

تەماشام کرد کەمێک بالای بەرزتر بووە و جەستەی لاوازتر بووەتەوە و ڕووخساری کەمێک جوانی لە دەست دابوو، لە چاو ئەو ڕووخسارەی کە چەند مانگێک بوو لە هزرمدا وێنام دەکرد. ڕوومەتەکانی سوور بووبوونەوە و پەڵەکانیش لە بەشێکی دەموچاویدا زیادی کردبوو.

یەکەم هەستم ئەوە بوو کە وەکوو هاوسەری دایکە بێوەژنەکەی ئەو کچە هارەی کە خۆر دیمەنێکی جوانی بۆ سواغ دابوو، خوێندنێکی باشی بۆ دابین بکەم و لە ماڵێکی جوانیشدا دایبنێم و لەگەڵ چەند برادەرێکی هاوتەمەنی خۆی هەڵسوکەوتی پێ بکەم، کە لەوانەیە پەرییەکی هاریان تێدا بدۆزمەوە بەر دڵم بگرێت!

بەلام بە چاوتروووکانێک وێنەکان سڕانەوە و وەکوو ئەڵمانییەکان دەڵێن: هێڵی فریشتەکانی نیازم (کات زۆرجار پێش خەیال دەکەوێت) نێچیرەکەم بە دەست هێنایەوە و دووبارە **لۆلیتای** خەیاڵم هاتەوە.

دەستێکم خستە ملی و بە دەستەکەی تریشم جانتاکەییم هەلگرت.
لۆلیتا بەشێوەکی گشتی پارچەیەکی حەز بوو بۆ من، پەیکەرێک بوو لە ئاوی گوڵ و هەنگوین، کراسێکی شەفافی لەبەر بوو، جوانی و هێڵی جەستەی دەردەخست و قاچە ڕووشاوەکەی تێدا دیار بوو.
ماڵئاوا خێوەتگە خۆشەکە، ماڵئاوا خێوەتگە خۆراکخراپەکە، ماڵئاوا دەرکەوانەکە، دەستی ماڵئاوایی بۆ هاوڕێیەکانی و خێوەتگەکە بەرز دەکردەوە، دواتر لە دانیشتنەکەیدا جێگیر بوو لە تەنیشتم.
شڵپێکی لە سەر ئەژنۆی دا، بۆ ئەوەی مێشێک بکوژێت کە لەسەری وەستابوو. بنێشتێکی لە دەمدا بوو، دەمی پڕ کردبوو، دوای ئەوەی کە بە ئۆتۆمبێلەکە لەنێو دارستانەکەدا دەڕۆیشتین، وەکوو ئەرکێک گوتی:
- تەندروستیی دایکم چۆنە؟
گوتم هێشتا پزیشکەکە بۆی دەرنەکەوتووە چییەتی و لەوانەیە نەخۆشییەکی هەناو بێت، بۆیە بڕیاریان دا بۆ چاودێریکردنی لە نەخۆشخانە بمێنێتەوە. کاتێک گوتم لە نەخۆشخانەیە لە (لیبینگفیل)، گوتی چەند خۆشە پێش سەعات ٩ بگەینە (لیبینگفیل).
وەلامیم دایەوە دەبێت بۆ خوانی ئێوارە لە (برایسلاند) بین و سبەی سەردانی (لیبینگفیل) بکەین، دواتر پرسیاری خێوەتگەکەم لێی کرد کە ئایا کاتێکی خۆشی بەسەر بردووە؟
- ئۆهـ زۆر خۆش بوو.
- پێت ناخۆشە کە خێوەتگەکەت بەجێهێشت؟
هێندێک ورتەورتی لێوە هات، هیچ ڕوون نەبوو و پێم گوت ورتەورت مەکە و بە زمانێکی ڕوون وەلامم بدەرەوە و شتێک بڵێ.
- چ شتێک باوکە! (وشەی باوکە بە زمانێکی توند سوارم بوو.)
- هەر شێکی کۆن بێت.

- باشە پێت چۆنە ئەگەر ناوت بنێم (شتە کۆنەکە)؟
- دەمت داخە.
- گاڵتە دەکەم، کەی دایکمت خۆش ویست؟
- لۆلیتا ڕۆژێک دێت لە هەست و حاڵەتەکان تێدەگەی، وەکوو گونجاندن و جوانیی پێوەندییەکانی هاوسەرێتی.
- خەم!
بۆ ماوەیەک بێدەنگییەکی زۆر دایپۆشین، دواتر بێدەنگییەکەم بەم قسەیە شکاند:
- سەیری ئەو مانگایانە بکە لەسەر ئەو هەردە.
- پێم وایە یەک مانگایەکی تر ببینم، خواردنەکەم هەڵدەهێنمەوە.
- (لۆلۆ) دەزانی؟ من زۆر زۆر بیری تۆم دەکرد؟
- بەڵام من نا، بیرتم نەدەکرد، چونکە من لە ئاستی تۆ نەبووم، بەڵام ئەوە گرینگ نییە، چونکە تۆ ئیتر گرینگیم پێنادەیت، ئۆهـ بەڕێز، لە دایکم خێراتر ئۆتۆمبێل لێ دەخوڕی.
خێرایەکەم لە ٧٠ەوە کەم کردەوە بۆ ٥٠ و گوتم:
- بۆچی پێت وایە گرینگیت پێ نادەم؟
- باش بۆ نموونە تا ئێستا ماچێکت نەکردووم، پێم بڵێ ماچت کردووم؟
ئەو پرسیارەی لێ کردم و من لەناوەوە دەسووتام بۆ ماچێک، هەر ئەوە نییە بمرم بۆ ئەوەی باوەشێکی پێدا بکەم، ڕێیەکی فراوان هاتە ڕێم و ئۆتۆمبێلەکەم لە کەناری ڕاگرت، ئۆتۆمبێلەکە هێشتا بەتەواوەتی ڕانەوەستابوو **لۆلیتا** وەکوو فڕین هاتە نێوان باسکەکانم. هەرچەندە من ڕازی دەبووم بە دەستلێدانێکی نەرم تا ئەوپەڕی ناسکی کە بەر لێوە گەرم و گڕدارەکانی بکەوتایە، چونکە نەمدەوێرا

شێلاوەی هەستەکانم دەربخەم و بوێریی ئەوەشم نەبوو **لۆلیتا** لە هەستەکانم ئاگادار بکەمەوە، لەوەی ئەمە سەرەتایەکە بۆ ژیانیکی خۆش و لە ڕێی هاوکاریی قەدەر دەرکەکانیم بۆ کرایەوە.

ماچەکەی من بۆ ئەو زۆر پاک و بیگەرد بوو، هیچ هەستێکی سێکسیی تێدا نەبوو، بەڵام **لۆلیتا** پاڵی نا بە خۆیەوە و بەبێ ئارامگرتن دەمی خستە نێو دەممەوە و زۆر بە توندی ماچی کردم و لەسەر لێوەکانییەوە هەستم بە دانەکانی کرد و تامی ئەو لێوانەم کرد کە تێکەڵی نەعناعی بنێشتەکە بووبوون.

دەمزانی ئەو ماچە بۆ ئەو، جگە لە یارییەکی پاک و ئاساییکردنەوەی ڕێوشوێنە سۆزدارییە گشتییەکان زیاتر نەبوو، وەکوو هەمیشە سنووری ئەم یارییەش سنوورێکە دەتوێتەوە، بە شێوەیەک کە هاوبەشە گەورەکە (پێگەیشتووەکە) ناتوانێت لە سنووری پاکیدا بمێنێتەوە، بۆیە ترسام زیادڕەوی بکەم لە یارییەکە و دوور بڕۆم لەگەڵی و ترسام ببمە هۆکارێک بۆ ترس و قێزلێبوونەوە بۆی، لە سەرووی هەموویشییەوە ئاگاداری ئەوە بووم کە لە دەست ڕاوچییە فاڵچییەکانی بڕفێنم و دووری بخەمەوە. ٨٠ میلمان لەپێشە، پێویستە بیبڕین و بگەین بە هۆتێلە پیرۆزەکە، لە چرکەساتی ئیلهامە پیرۆزکەدا باوەشەکەمان بڕی و دوای ماوەی ترووکانی چاوێک ئۆتۆمبیلێکی پۆلیس لە تەنیشتمان وەستا و بە چاوێکی خراپەوە گوتی:

- لەسەر ڕێیەکەتان هیچ ئۆتۆمبیلێکی شینتان نەبینی، هاوشێوەی ئۆتۆمبیلەکەی تۆ بێت؟

- نەخێر... بۆچی؟

**لۆلیتا** بە خۆهەڵقورتاندنێکەوە خۆی چەماندەوە سەر جەستەم و دەستی خستە سەر قاچم و گوتی:

- نەخێر ئۆتۆمبێلی شینمان نەبینی، پێم بڵێ تۆ دڵنیای کە شینە؟ چونکە ئێمە...

بەڵام پۆلیسەکە نوقمی بزەیەکی گاڵتەجاڕی بوو و بە ئۆتۆمبێلەکەیەوە کەوتە ڕێ و ئێمەش دوای ئەو بە ڕێ کەوتین.

**لۆلیتا** گوتی:

- ئەو کەرە دەبوایە سەرپێچییەکی بۆت تۆمار بکردبایە.

- بۆ خاتری ئاسمان بۆچی؟

- چونکە تۆ بە خێرایی ٨٠ لێدەخوڕی واتا ٣٠ میل زیاتر لێدەخوڕی... نانا ترسنۆک خاوی مەکەرەوە، ئەی نابینی پۆلیسەکە ڕۆیشت.

- هێشتا ڕێیەکەمان درێژە و دەمەوێت بەر لە داهاتنی تاریکی بگەم، دەی عاقڵ بە، هێی...

- نەخێر من کەسێکی خراپ و گوناحکارم، هەرزەکارێکی لادراوم، بەڵام ڕاشکاوم.

دواتر بە بێدەنگی لەنێو دارودرختەکانی ڕێیەکەدا ڕێمان دەکرد، تا ئەو کاتەی کە **لۆلیتا** بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی:

- پێم بڵێ ئایا دایکم شێت نابێت ئەگەر بزانێت ئێمە عاشقین؟

- بۆ خاتری خوا **لۆلیتا** ئەو قسانە مەکە.

- بەڵام ئێمە ئەڤیندارین و یەکدیمان خۆش دەوێت وا نییە؟

- هیچ شتێک نازانم، ئاسمان دەبینی؟ پێم وایە باران دەبارێت، ئێستاش باسی گەشتە بچووکەکانی خێوەتگەکەم بۆ ناکەی؟

- باوکە وەکوو مامۆستایەکی ڕەزاقورس قسە دەکەی.

- من سوورم بزانم چیت کرد لە گەشتەکان.

- ئاوا زوو تووڕە دەبیت و هەڵدەچی؟

- نەخێر قسەم بۆ بکە.

- کەی چووینە شوێنێک و تەنیا بووین ئەوکات قسەت بۆ دەکەم.
- لۆلیتا من بە جددی پرسیارت لی دەکەم، مەیکە بە گاڵتەجاری.
- باشە بەشداریم لە سەرجەم چالاکییە پێشنیارکراوەکان کرد.
- دوای ئەوە؟
- فێریان کردم چۆن بە بەختەوەری بژیم و کەسایەتییەکی بەهێز بۆ خۆم دروست بکەم و فێری ئەوەشیان کردم چۆن وەکوو کیک خۆش بم، فێری دروشمەکان بووم کە دەڵێت: "دەبێت ژیانم بریتی بێت لە کۆمەڵێک کاری باش و سوودبەخش و هاوڕێتیی تیزینەی ئاژەڵەکان بکەم و گوێڕایەڵی فەرمانەکان بیم، بەڵام هێشتا وێنای ناشرین و بیرۆکەی پیسم هەیە و هێشتا قسە و کردەوەم ناشرینە.
- شتەکانت بە باشی بیر ماوە، بەڵام قسە نەشیاوەکان لە زارت فڕێ بدە، ئیتر هەر ئەوەندە بوو؟
- نەخێر، ملیۆنەها قاپمان شووشت.
- هەمووی ئەوەندە بوو؟
- هەمووی ئەوەندە بوو، تەنیا یەک شتێک نەبێت کە هەتا لە شەرمانا سوور نەبمەوە ناتوانم پێتی بڵێم.
- دوایی دەتوانی پێمی بڵێ؟
- ئەگەر بە تاریکی دانیشتین و ڕێت پێ دام بە کزی و ناسکی قسە بکەم، ئەوکات پێت دەڵێم، بەڕاست پێم بڵێ لە ژوورە کۆنەکەت دەنوی یان لەسەر جێخەو و ژوورەکەی دایکم؟
- لە ژوورە کۆنەکە، دایکت لەوانەیە پێویستی بە نەشتەرگەرییەکی ترسناک بێت.
- دەتوانی لای دوکانی شیرینیفرۆشییەکە بوەستی؟

هەموو ئەو شیرینییەی داوای کردبوو وەکوو هەمیشە هەمووی خوارد و زۆر بە خێرایی ڕێم دەکرد بۆ ئەوەی بگەمە (برایستۆن)، کاتێک گەڕاینەوە بۆ سەیارەکە پشتەملیم ماچ کرد، گوتی:

- وا مەکە ڕەزاقورس! مەکە هەی پیس!

شوێنی ماچەکەی بە شانی سڕی و منیش گوتم:

- ببوورە، تەنیا لەبەر ئەوەی دڵخۆشم بە تۆ بۆیە وام کرد.

- منیش دڵخۆشم بە تۆ.

ئەو قسەیەی بە دەنگێکی نەرم و تێکەڵ بە سۆز کرد و زۆر نێزیک بووەوە لێم، بەردەوام بووم لە لێخوڕینی ئۆتۆمبێلەکەم، تا گەیشتم بە (برایستۆن)، تاریکییش ئاسمانی لوول دابوو، هەرچەندە نەرمەبارانێکیشی هەبوو بەڵام کەشەکە گەرم بوو، لە تەنیشت سینەمایەکەوە تێپەڕیین، کە خەڵک لێی کۆ بووبوونەوە و قەرەباڵغی لەبەردەم پەنجەرەی بلیتبڕەکە دروست بووبوو، **لۆلیتا** گوتی:

- ئۆهـ ئەمەوێ ئەو فیلمە ببینم، با بڕۆین بۆ سینەما لە دوای نانی ئێوارە.

پێم گوت:

- لەوانەیە بڕۆین، لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیابووم کە کاتژمێر نۆی شەو **لۆلیتا** لەنێو باسکەکانمدا نوقمی خەو دەبێت.

بە دوای هۆتێلی (راوچییە ئەفسووناوییەکان)دا دەگەڕام، ماندوو بووم هێندەم ئۆتۆمبێل لێخوڕی، گەدەی **لۆلیتاش** پەرۆشی خوانی ئێوارەیە، هەرچەندە ئەو ڕۆژەم بیر دەکەوێتەوە کە چۆن خۆم ماندوو کردبوو بۆ ئەوەی هۆتێلەکە بدۆزمەوە، پێکەنینم بەو ڕەفتارە منداڵانەم دێت، چونکە بە درێژایی ڕێیەکە دەیان هۆتێل هەبوو، کە گڵۆپی ژوورە چۆڵەکانی کوژابوونەوە، ئامادە بوو بۆ جیگرتنەوەی فرۆشیارە

دەستگیر و زیندانییە هەڵهاتووەکان و ئەو پیاوانەی کە پێوەندیی خراپیان هەیە، بۆ دواجار بە پەرجوویەک لە پەرجووەکانی ڕێکەوت هۆتێلەکەم دۆزییەوە. ئەو کەسەی کە جانتاکانی بۆ هەڵگرتین پیاوێکی پشتکۆم بوو و منداڵێکی ڕەشپێستیش هاوکاریی دەکرد، **لۆلیتا** خۆی فڕێ دایە سەر قەنەفەیەک و یاریی لەگەڵ سەگێکی بچووک دەکرد کە دوو گوێی ڕەشی هەبوو، سەگەکە لەژێر دەستی ڕاکشا (جا کێ لەژێر دەستی **لۆلیتا** ڕاناکشێ دڵەکەم)، کاتێک بەرەو نووسینگەکە ڕێم بڕی، نووسەرە کەچەڵەکە، بە گومانەوە لێی ڕوانیم و سەیرێکی سەعاتەکەی کرد و گوتی:

- ئێمە دوو ژوورمان بۆت دانابوو بۆ سەعات شەشونیو، بەڵام تۆ نەهاتی، بۆیە یەکێکمان بە کرێ دا، چونکە کۆنگرەیەکی ئایینی لە شارەکەدا هەیە.

وەڵامیم دایەوە و گوتم گرینگ نییە ئەو تاکە ژوورەمان پێ بدە، کچە دە ساڵانەکەم زۆر ماندووە، پیاوە پیرەکە لەو کاتەدا سەیرێکی **لۆلیتای** کرد، کە بە لێوە کراوەکانییەوە گوێی لە پیرەژنێک دەگرت کە شاڵێکی مۆری بە سەریەوە بەستبوو، دیمەنی پاکی **لۆلیتا** وای لەو پیاوە پیرە کرد کە هیچ گومانێکی خراپ نەکات و بڕیاری دا ژوورێکی دووکەسیمان پێ بدات، پێم گوت ئایا ناکرێت مەسەلەی تەختەخەوەکەمان بۆ چارەسەر بکەن و دوو سیسەمی یەکنەفەریمان بۆ دابین بکەن، نووسەرەکە گوتی تەختەخەوە دوونەفەرییەکە فراوانە و بەشی سێ کەس دەکات و جارێکیان سێ ژن و منداڵێک لەسەری نووستن، لەگەڵ ئەوەشدا قەنەفەیەک لە ژوورەکەدایە، گوتم کێشە نییە چارەسەری خۆمان دەکەین، لەوانەشە هاوسەرەکەم فریامان بکەوێت بۆ ئێرە، لەگەڵ ئەوەشدا کێشەیەک نییە چارەسەری دەکەین.

بە دەستی تاوانبارێکی ئارام و دڵنیاوە نووسیم: (دوکتور ئیدگار هەمبەرت و کچەکەی، دانیشتووی رامسدیل.) چووینە سەرەوە و ڕێڕەوەکە و هۆڵی تاریکی مەرگمان بڕی و ژوورەکەمان دۆزییەوە کە بریتی بوو لە تەختەخەوێک و ئاوێنەیەک و باوڵێک و دوو کورسی و مێزێک، هەستێک بوو بە پاڵنەرم و وای لێ کردم پێنج دۆلار بەو کوڕە بدەم کە جانتاکەی بۆ هێناین، بەڵام ترسام ئەو کارە تووشی گومانمان بکات، بۆیە تەنیا ٢٥ سەنتم پێ دا و بە چاوی بەزییەوە ٢٥ی دیکەم پێ بەخشی و ئەو ڕۆیشت و بەتەنیا ماینەوە، **لۆلیتا** گوتی:

- هەردوکمان لە یەک ژوور دەخەوین؟

ئەو قسەی بە بێزاری دەربڕین یاخود نارەزایی نەکرد، بەڵکوو بە تۆنێکی دینامیکی کردی، هاوشێوەی پرسیارەکانی دیکەی کە دەیانکات.

- داوام کردووە قەنەفەیەکم بۆ دابین بکەن، تاکوو لەسەری بخەوم ئەگەر بتەوێت.

- تۆ گەمژەی.

- بۆچی ئازیزەکەم؟

- ئەگەر دایکم بەم کارە بزانێت تەڵاقت دەدات و منیش دەخنکێنێت.

**لۆلیتا** لە قسەکردنیدا کچێکی پڕجووڵە بوو، هەرگیز جددی نەبوو، لە دووریی پێنج هەنگاو لە منەوە وەستابوو و سەیری ئاوێنەکەی دەکرد و بێباک بوو لە دیمەنە پەشۆکاوییەکەی، گوتم:

- گوێ بگرە **لۆلیتا**! با لەسەر شتێک ڕێک بکەوین لە ئێستاوە بۆ هەتاهەتایە، من باوکی تۆم و دەبێت بەو شێوەیە بم لەبەرچاوی خەڵک، ئەوەش بە هۆی هەزارویەک هۆکارەوە، لە ڕاستیدا هەست بە

سۆزێکی زۆر مەزن دەکەم لە ئاست تۆدا، لە کاتی نەبوونی دایکتدا من سەرپەرشتیاری تۆم و باری داراییشمان باش نییە، بۆیە دەکرێت هێندێک جار لە یەک ژووردا بخەوین، بۆ زانیاریت ئەگەر دوو کەس لە یەک ژووردا بن، بێگومان لەکۆتاییدا دەگەنە... جۆرێک...

- جۆرێک لە سێکسی ناشەرعی، خراپەکاری.

**لۆلیتا** بە شێوەیەک لە خۆلارکردنەوە ئەو قسەیەی کرد و ڕووی کردە گەرماوەکە و منیش کراسەکەم گۆڕی، چونکە عارەقەیەکی زۆری پێوە بوو، سەیرێکی شووشەی حەبی خەوتنەکانم کرد و دەرکەم داخست. کاتێک **لۆلیتا** لە گەرماوەکەوە دەرچوو بە هەستێکی پەنخواردووەوە ویستم بە شێوەیەکی ئاسایی باوەشێکی پێدا بکەم و سۆزی قەتیسم هێور بکەمەوە، گوتی:

- گوێ بگرە با دەست هەڵگرین لەم یاریی باوەشپیاکردنە و بڕۆین نانی ئێوارە بخۆین.

ڕووی کردە جانتای سەفەرەکەی و کراسێکی تازەی دەرکرد و لەبەری کرد، لاقە جوانەکانی دەرکەوتن و دواتر زۆر بە جوانی خۆی شێک کرد، ڕووی کردە باسکە کراوەکانم کە چاوەڕێیانی دەکرد، دیمەنێکی پرشنگداری هەبوو، بە نیگایەکی پڕ سۆز و تەمومژاوییەوە لە چاوە بریسکەدارەکانی کە دوور بوون لە پاکی، وەکوو پشکنین لێی ڕوانیم، دیمەنی ئەو وەکوو سووکترین لەشفرۆشەکانی جیهان بوو، دیمەنی پەرییە هارەکان بوو کە لە سێکس تێر ناخۆن، لەو جۆرەی کە گیانی بۆ دەدەم و بۆ سۆزیان دەمرم.

دەمم لێی نێزیک کردەوە، لێوەکانم بەر قژەکەی دەکەوت و بە چرپەیەکەوە پێم گوت:

- چ دەبێت ئەگەر ماچێکت بکەم، لاریت لە ماچکردن هەیە؟

- ئەگەر ئەو کارە پێویستە بکرێت، ئەوا شێوازی ماچکردنەکەت هەڵەیە.
- کەواتە شێوازە ڕاستەکەم ئێستا نیشان بدە.
- نەخێر. لە کاتی گونجاودا.

پێش ئەوەی کار لە کار بترازێنم، زۆر بە قورسی توانیم تووڕەبوونی خۆم کۆنترۆڵ بکەم، کارێکی باشی کرد کە لە نێوان باسکەکانم هەڵهات و ڕووی کردە جانتای جلەکانی، چونکە لەوەدا بووم هەڵەیەکی کوشندە بکەم.

ڕووم کردە حەمامەکە، کاتێکی زۆرم پێ چوو تاکوو بگەڕێمەوە خۆم و دیمەنم ئاسایی بکەمەوە، کە دەرچووین (**لۆلیتا**م کردە پشتی خۆمەوە چونکە ئەو کچی منە، نەک خانمی من)، چووینە هۆڵی نانخواردنەکەوە و ئەو باوێشکی دەدا، هێندێک پیرەژنی شپرێو و دوو پیاوی ئایینی بە جلی وەرزشییەوە بە بێدەنگی نانیان دەخوارد، **لۆلیتا** ئاوڕی دایەوە و بە چرپەوە گوتی: ئەو پیاوە بە کیلتی دەچێت، ئاماژەی بۆ پیاوێکی چاکەترەش کرد، لە گۆشەیەکی بەرانبەر هۆڵەکەوە، بە تەنیا دانیشتبوو، نانی دەخوارد.

- مەبەستت دوکتۆری ددانەکەی رامسدێڵە؟

لە خۆشییان پرشی لیکی دەمی بۆم دەهات، گوتی:

- نەخێر، مەبەستم ئەو نووسەرەیە کە لەسەر ریکلامەکانی (دروومـ)ە.

دوای ئەوەی نانمان خوارد و کۆتاییمان بە خواردنی شیرینییەکە هێنا، حەبی خەوەکەم دەرهێنا، پرسیاری حەبەکانی لێ کردم ئەوە چییە، منیش گوتم ئەمانە حەبی ڤیتامینن، مرۆڤ وەکوو (گا) لێدەکات، بەهێزی دەکات وەکوو تەور، سەیرێکی دوروبەری خۆمم کرد و خۆمم وا پیشان دا کە حەبێکم خوارد، **لۆلیتا**ش دەستی درێژکرد و

دانەیەکم پێدا و خواردی، کاریگەریی حەبەکە زۆر بەهێز بوو، بیرۆکەی ڕۆیشتنی **لۆلیتا** بۆ سینەماکە وەکوو هەڵم نەما و لەبیری کرد و دەستی بە وەنەوزدان کرد. کاتێک لەنێو ئەسانسێرەکەدا بووین، خەریک بوو خەو بیکوژێت، سەری خستە سەر شانم، لە کۆتاییدا ناچار بووم بە باوەش بیبەمە ژوورەکەوە و لە لێواری سیسەمەکە دامنا و بە دەنگێکی خەواڵووەوە گوتی:

- ئەگەر پێت بڵێم، ئەگەر پێت بڵێم، بەڵێنم پێ دەدەی کە تووڕە نەبی؟

- دوایی پێم بڵێ، ئێستا بەتەنیا بەجێت دەهێڵم، تۆ بنوو، منیش دوای دە خولەکی تر دێمەوە.

- کچێکی خراپ بووم، با پێت بڵێم.

- سبەی **لۆلیتا** سبەی، بڕۆ سەر تەختەخەوەکە.

ئەو قسانەم کرد و کلیلەکەم خستە گیرفانمەوە و دەرچووم.

## ٢٧

دادوەرانی بەڕێز! خانمە جوانەکانی دادگە! هێندێک ئارام بگرن... ئەگەر بڕێک لە کاتە بەنرخەکەتان دەگرم.

بەم شێوەیە گەیشتمە چرکەساتە مەزنەکە. **لۆلیتام** بەجێهێشت. هێشتا لەسەر لێواری تەختەخەوەکەدا بەدەم یاریکردنەوە وەکوو هەمیشە بێشەرمانە لاقە ڕووتەکەی بەرز دەکردەوە، تا لێواری دەرپێیەکەی دەرکەوتبوو.

ئەم وێنەیەم لە هزری خۆمدا هەڵگرت، کاتێک لە ژوورەکە دەرچووم و دڵنیا بووم لەوەی دەرکە لە دیوی ژوورەوەی سورگی نییە، دەستم کرد بە ختووکەدانی کلیلەکە و هەستم کرد موچڕکی سێکسیم پێ

دەبەخشێت، بە شێوەیەک دەستم دەخستە سەر کلیلەکە وامدەزانی بووەتە بەشێک لە دەستم، **لۆلیتا** بەتەواوەتی بووە هی من، دوای ٢٠ بۆ ٣٠ خولەکی تر دەگەڕێمەوە بۆ ژووری ژمارە ٣٤٢، بۆ لای پەرییەکەم، تاکوو بووکەکەم لە دیلیتیی خەوێکی قووڵدا ببینمەوە.
جەنابی دادوەران! ئەگەر دڵخۆشییەکەم بهاتایەتە گۆ، ئەوا ئەو هۆتێلە کپ و بێدەنگەم پڕ دەکرد لە دەنگ، بەداخ نیم لە هیچ شتێکی ئەو شەوە، چونکە ئەو کلیلەم لە پرسگەی هۆتێلەکە دانەنا و بڕۆم. جا شاری برایستۆن، یاخود ئەمەریکا، یان کێشوەری ئەمەریکا، یاخود هەر تۆپی زەوی بەجێ بهێڵم.
ئەو ئاماژانەی کە لە بارەی خراپەکارییەکانی خێوەتگەکەوە دەیکردن، نیگەرانیان نەکردم، هاوسەنگییان تێک نەدام، ئەو ئاماژانەی بۆ من کردنی بۆ ئەوە بوو کە دەتوانم هەموو شتێکی لێبکەم، بەڵام سووربووم لەسەر ئەوەی پەردەی کچێنیی هەتک نەکەم، بەڵکوو ئەوەندە بێت کە بە تاریکیی ئەو شەوە بەدزییەوە دەست لە جەستەی رووت و سڕی بدەم، بەڵێ، سێکسی لەگەڵ ناکەم کە سێکسێکی تەواوەتی بێت، تەنانەت ئەگەر بە هۆی کارێکی هەزەکارانەشەوە لە خێوەتگەکە پەردەی کچێنیی لە دەست دابێت، چونکە لیسبیان لە نێوان هەرزکارەکاندا کارێکی ئاساییە.
بە هۆی ئەوەوە کە من لە نەوەیەکی کۆنم، کارێکی ئاسایی بوو، کە یەکەمجار **لۆلیتام** بینی وامزانی کچێکی دەستلێنەدراوە و بەمانای پاکی پاکە- وەکوو چەمکی منداڵێکی ئاساییە، ئەم چەمکە وای پیشان دەدا کە لە کۆتاییی جیهانی پێش مەسیحەوە پاکیی بۆ هاتووە، ئێمە لەو سەردەمەدا نین کۆیلەکان لە بەهاری تەمەنیاندا دەروبەرمان بگرن و پێش یاخود دوای خۆشووشتن بەکاریان بێنین، یاخود پێش

ڕۆیشتن بۆ کارکردن یاخود لە دوای گەڕانەوە، ئەو کردەوانە لە سەردەمانێکی تردا دەکرا، قەناعەتیشمان بە ڕۆژهەلاتییەکان نییە کە لە نێوان نانخواردن و خواردنەوەدا وەکوو خزمەتگوزاریی سێکسی کچی بچووک پێشکەش بکەین.

بە ڕوونییەکەی، پێوەندییە کۆنەکەکان، لە نێوان جیهانی گەورەکان و جیهانی منداڵیدا بەسەر چووە و لەم سەردەمەدا دابونەریت و یاسای نوێ هاتووەتە ئاراوە.

هەرچەندە من لە زانستی دەروونی و کاروباری کۆمەلایەتیدا قووڵ بوومەتەوە، بەڵام شتێکی کەم لە منداڵ دەزانم. کاتێک **لۆلیتام** ناسی زۆر ئاسایی بوو هەستێکی وام پێ ببەخشێت کە هەرزەکارێکی پاک و پاکیزەیە، هەرچەندە ئەوەم هەر لە مێشکدا بوو کە خوێندکارانی ئەمەریکا بە شێوەیەکی کراوە ڕەفتار دەکەن، دوو خاڵ هەبوون ململانێیان لەگەلمدا دەکرد، خاڵی یەکەم ئەوە بوو، ئایا ئەم کچە دەبێت لە کوێیدا بێت! خاڵی دووەمیش، وەکوو ئاگرتێبەربوویەک دەمڕوانییە ئەو کچەی کە لە کۆتایی تەمەنی منداڵیدایە و کاتی هاتووە بەرهەمی چێژی لێ بچنم. **لۆلیتا** شتێکی زۆر جیاوازتر بوو لە ئەنابێلی پاک و بێگەرد، چونکە شەڕانگێزیی سێکسێکی هار لەگەڵ هەناسەیدا دێت و دەڕوات، بڕیارم دا ئامادەی بکەم بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی نەبینراو چێژی لێ بەرم، بە شێوەیەک بیکەم بە نهێنییەکی وەهمی و چێژێکی کوژەر.

ئەو بیرۆکانە دەخەمە لاوە، ئێستا **لۆلیتا** لای ڕاستمەوەیە. تەنیا هی خۆمە. ئەوەش کلیلی ژوورەکەیە لەنێو دەستمدا دەیگوشم و بیر لەوە دەکەمەوە چۆن لە کاتی خەوە قووڵەکەیدا ڕووتی دەکەمەوە و تەنیا یەک تاک گۆرەوی و بازنگەکانی دەهێڵمەوە و لەسەر سیسەمە

رایدەکشێنم و دەموچاوم دەخشێنم بەو جەستە هەنگوینییەیدا، کە خۆر جگە لە مەمکە بێنازەکانی هەموو گیانی سواغ داوە، سێبەری مووەکانی لەژێر گلۆپەکە و لەسەر تەختەتەخەوە پەمەییەکە و لە چالاییی سمتیدا دەبریسکێتەوە، هێشتاش کلیلە ساردەکە بە دەسکە دارینەکەیەوە وا لەنێو دەستمدایە.

لە چاوەڕوانیی نیو سەعاتدا بووم، لەنێو ڕێڕەوی هۆتێلەکەدا بە جەستەیەکی گەش و ڕۆحێکی تاریکەوە ڕێم دەکرد، خۆم لە میوانەکانی هۆتێلەکە لا دەدا، لە یەکێک لە هۆڵەکان چاوم بە خێزانێک کەوت، کچە هەرزەکاریکیان پێ بوو لە تەمەنی **لۆلیتا**دا بوو، بەڵام ئەو لە **لۆلیتا** سپیتر بوو، وەکوو **لۆلیتا** بەچێژ بوو، بە چاوێکی تیژەوە سەیریم دەکرد، کاتێک بینی سەیری دەکەم، خوێن لە ڕوومەتیدا کۆ بووەوە و بەدەستی ئەژنۆی پۆشی و شانی سووڕاند و لەگەڵ دایکیدا، کە لە مانگا دەچوو، دەستی بە قسەکردن کرد.

چوومە دەرەوە. سەیری ئەو پەپوولانەم دەکرد لە دەوری گلۆپەکاندا دەسووڕانەوە، هەستم کرد کەسێک لە نێزیکمەوە لەسەر کورسییەک دانیشتووە، منیش هەوڵم دا خۆم دوور بخەمەوە، پرسیاری کرد و گوتی:

- بۆ خاتری شەیتان لە کوێ دەستت کەوت؟
- ببوورە؟
- گوتم کەشوهەوا خۆشی کردووە.
- بەڵێ پێ دەچێت وا بێت.
- ئەو جووجەڵەیە کێیە کە لای تۆیە؟
- کچی خۆمە.
- درۆزن ئەوە کچی تۆ نییە.

- ببووره؟ گوتت چی؟
- گوتم مانگی تەمووز مانگێکی گەرم بوو، کوا دایکی؟
- مرد.
- بەداخەوە، پێم بڵێ دەتوانن سبەی لای من نان بخۆن ئەو کات قەرەباڵغییش کەمتر دەبێتەوە.
- سبەی ئێمەش دەڕۆین، شەو شاد.
- ببووره کە بێزارتم کرد، زۆرم خواردووەتەوە، مەست بووم، شەوێکی شاد، کچەکەت پێویستی بە خەوێکی زۆرە، گوتەیەکی فارسی هەیە دەڵێت: خەو گەنجەکان بە گوڵ دەنەخشێنێت.
بە پەلە شوێنەکەم جێ هێشت، هەستم بە نائارامی کرد و ئارەزووی خواردنەوەی پێکێکم هەبوو، بەڵام پێم باش بوو ڕووبکەمە ژوورەکەی خۆم، خەڵکێکی زۆر لای ئەسانسێرەکە راوەستابوون، ناچار بە پەیژەکاندا سەرکەوتم، چونکە دەترسام کەسێکی هەڵقورتێنەری دیکەیان تێدا بێت.
ڕووناکیی گەرماوەکە لە درزی دەرکەوە دزەی دەکرد و گڵۆپی بەلەکۆنەکەیش لە توێی پەردەکانەوە دەهاتە ژوورەوە، ئەو تیشکە لێکتێهەڵکێشراوانە دیمەنی ئەو تابلۆیەیان بۆ ئاشکرا دەکردم:
**لۆلیتای** خۆشەویستم بەجلی نوستنەوە ناوەڕاستی سیسەمەکەی گرتبوو و پشتی لێ کردبووم، جەستە داپۆشراوەکەی بە کراسێکی نەرمەوە لوول درابوو، لاقەکانی ڕووت بوون و دوو سەرینی خستبووە ژێر سەریەوە؛ ڕووناکایی لە بنی گەردنی دەدا.
هێندە بە خێرایی جلەکانم داکەند و جلی خەوەکەم لەبەرکرد پێ دەچێت هەر هێندەی خۆگۆڕینی ئەو فیلمانە بێت کە (دەزگەی چاودێری) کاتی کورتی پێیان داوە، چونکە ڕێوشوێنی خۆگۆڕینیان لە

کن قەدەغەیە نمایش بکرێت. هێشتا ئەژنوم نەخستبووە سەر سیسەمەکە لۆلیتا ئاوڕی دایەوە و لەو تاریکییەدا بۆ ماوەیەکی زۆر سەیری کردم، هەرگیز پێشبینیی ئەوەم نەدەکرد، دەبوایە ئەو حەبە بەقوولی بیخەواندایە و ئەگەر تیمێکی سەربازی لە ژوورەکەدا تێپەر بوونایە هەستی پێنەکردایە، ئەوەتا وا بە چاوەکانی بە زەقی سەیرم دەکات و بە دەنگێکی کزەوە بانگی (باربارا) دەکات. بەدەم خەوەوە قسەی دەکرد وەکوو نیمچەخەوتوویەک بوو، لە جێی خۆم وشک بووم و دەستم کرد بە چاودێریکردنی، ئاهێکی هەڵکێشا و گەڕایەوە شێوازی پێشووی، بۆ ماوەی دووده‌قەیەک لە حاڵەتێکی توقینەردابووم، هەستم کرد لە لێواری کێشەیەکی گەورەدابووم، دواتر ورده ورده هەناسەی وەکوو خۆی ڕێک بووەوە و نیشانەی ئەوەی دەدا کە خەوی لێکەوتووەتەوە، لەسەر ئەوەندە شوێنەی کە لە سیسەمەکەدا مابوو ڕاکشام و چمکێکی بەتانییەکەم خستە سەر پێیە ساردەکانم، لۆلیتا دووبارە سەری بەرزکردەوە و چاوی خستە سەر ڕووخسارم.

دواتر لە هاوڕێیەکی دەرمانسازمەوە زانیم کە ئەو حەبە وەنەوشەییانە، کاریگەریی بەهێزی نییە، نەمدەزانی دوکتۆر رامدیل کە ئەو حەبانەی پێ دام بۆ فێڵ وای کرد یان لە گەمژەیی بوو؟ گرینگ نییە ئەگەر فێڵباز بێت یان گەمژە بێت گرینگ ئەوەیە من هەڵخەڵەتێنرام.

کاتێک لۆلیتا دووبارە چاوی کردەوە، بۆم دەرکەوت کە ئەو دڵنیاییەی بەتەمای بووم دڵنیاییەکی درۆزنانە بووە. ئایا حەبی خەوەکە کاریگەریی نەبوو یاخود دواتر کاریگەریی دەبێت.

**لۆلیتا** روویکردە ئەولاوە و سەری نوقمی سەرینەکە کرد، منیش لە لیوارەکە بەبێ جوولە مامەوە و سەیری قژ و شوێنە رووتەکانیم دەکرد، دەمویست ئاستی خەوەکەییم بۆ دەربکەوێت، ماوەیەک دۆخەکە وەکوو خۆی مایەوە و بڕیارم دا سەرەڕۆیی بکەم و لەو جەستە درەوشاوەیە نێزیک ببمەوە، هێشتا لە مەملەکەتە گەرمەکە نێزیک نەبووبوومەوە، دەنگی هەناسەی **لۆلیتا** وەستا، هەستێکی زۆر ترسناکم بۆ هات، وامزانی **لۆلیتا** بە تەواوەتی خەبەری بووەوە و ئەگەر بە جەستە پیسەکەمەوە بەر شوێنێکی بکەوم دەست بە هاوارکردن دەکات.

تکا لە خوێنەر دەکەم کە هەر بۆچوونێکی هەبێت لەسەر کەسێکی هەستیاری وەکوو من، هەرچەندە لە کەسێکی وەکوو من بێتاقەت دەبن، تکا دەکەم، وێنام بکە کاتێک لە دارستانەکانی راڕایی و نەزانینی توقینەرمدا هەوڵ دەدەم بوێری و شێلاوەی لەرزۆکم جیا بکەمەوە.

بارێکی هەستیار و نائارام بوو، جێی سەرم نەمابووەوە، بەڵام وەکوو بڵێی بەزەیی بە هەستە هەڵچووەکانمدا هاتەوە و دووبارە بە قووڵی خەوی لێکەوتەوە، بەڵام من بوێریی ئەوەم نەکرد لە گەشتە ئەفسووناوییەکەم بۆ شوێنە جوانەکان بەردەوام بم، بڕیارم دا سبەینێ، ئەو حەبانەی کە یەکەم جار تاقیم کردەوە لەسەر دایکی و وەکوو بووکەشووشەیەکی خوێن و گۆشتی لێ کرد، دانەیەکی پێ بدەم، بڕیارم دا بە شێوەیەکی کاتی هیچ جوولەیەک نەکەم، چونکە نێزیکبوونەوە لە پەرییە هارەکان پێویستی بە هونەر و ئارامی و ئاگاییەکی تەواوە.

لەو شەوەدا گوێچکەکانم هەموو دەنگێکیان وەردەگرت، هیچ شوێنێک هێندەی هۆتێلی ئەمەریکی بە شەوانەڕۆژ دەنگەدەنگی زۆر نییە.

تیشکەکانی بەرەبەیان خەریک بوو لە پەنجەرەکەوە دەهاتنە ژوورەوە، نێوان من و ئەویش تەنیا یەک بست پانتایی هەبوو، بۆ دواجار هێندێک لێواری جەستەی نێزیکم بووەوە و دەنگی جیکەی سیسەمەکە بەخەبەری نەهێنایەوە، توانیم لێ نێزیک ببمەوە و هەستم کرد شانە ڕووتە درەوشاوەکەی خەریکە ملم دەکولێنێت، لە ناکاو لە خەو هەستا و دانیشت و دەستی بە قسەکردنێکی خێرا کرد و باسی بەلەم و باسی باربارا و شارلیی کرد، هێندەی پێ نەچوو گەڕایەوە بۆ خەوە قوولەکەی، لە ناکاو و بەبێ مەبەست دەستی درێژکرد و دای بە نێو چەوانمدا و بۆ چرکەیەک قۆلیم گرت و گەرمیم لێوە وەرگرت، بەجوولەیەک ئاسایی وەکوو کەسێکی خەوتوو و بێئاگا و بەبێ توندوتیژی و بە خێرای دەستی ئازاد کرد.
دۆخەکە گەڕایەوە سەرەتا: هەمبەرت لە لێواری سیسەمەکە دەستی کردبووە ژێر سەری و **لۆلیتاش** خۆی خڕکردبووەوە و پشتی لێ کردبوو، لە کاتێکدا ئارەزوو و حەز دەیسووتاند.
ئەو دۆخە وای لێ کردم ناچار بم بڕۆم ئاوێک بەخۆمدا بکەم، هیچ شتێک وەکوو ئاوی سارد چارەسەر نییە لە دۆخی وادا، کاتێک گەڕامەوە بینیم لە خەو هەڵساوە و بەدەنگێکی دڵنیاوە داوای ئاوی لێ کردم و دەستی بۆ پەرداخەکە درێژکرد و بڕژانگە داخراوەکانی هێندەی نەمابوو بەر لێواری پەرداخەکە بکەوێت، ئاوەکەی زۆر بە تینەوە خواردەوە، بە جوولەیەکی منداڵانەوە لێم نێزیک بووەوە و لێوەکانی بە شانم سڕی، لێوسڕینەکەی زۆر بە چێژ بوو، لە دەستبازییەکی شەهوانی ئەفسوونگەرتر بوو، گەڕایەوە سەر سەرینەکەی و خەوتەوە.

بوێریی ئەوەم نەبوو لەگەڵ ئاوەکەدا حەبێکی دیکەی پێ بدەم، چونکە بێئومێد نەبووم لەوەی حەبەکانی یەکەم کاریگەریی دەبێت و زیندانی نێوان هەردوو دەستمی دەکات، بەم شێوەیە بەردەوام بووم، خۆم دەخشکاندە لایەوە و ئامادە بووم بۆ هەر شکستێک. ئارامم لێ برابوو، هەرچەندە دەمزانی کە دەبوایە چاوەڕێ بکەم، بەڵام هەر بەردەوام بووم، بە خاوی تۆزێک دەچوومە پێشەوە و تۆزێک دەگەڕامەوە، کاتێک هەستم کرد کە خەریکە دەجووڵێتەوە، هەستم بە شنەبای ئاسۆی ئەفسووناوی کرد، کە کاری کردە سەر بیرەوەرییەکانم، ئاسۆی دوورگەی خەیاڵەکانم کە پەرییە هەرزەکارەکانی تێدایە، جەستەی ماندووم جاروبار دەچووە خەو، چەند جارێکیش ئاگام لە پرخەی خەوی خۆم بووم، هەستم کرد تەمی ئارەزووەکانم لەچیاکانی سۆز و گردەکانی هەڵگیرسان لوولم دەدات، جاروبار خەیاڵی ئەوەم بۆ دەهات نێچیرە ئەفسووناوییەکە لەناوەڕاستی ڕێیەکەدا دەگاتە راوچییە ئەفسووناوییەکە، دواتر هەستم دەکرد کە بۆ هەتاهەتایە لێم دور دەکەوێتەوە و لە ناکاو سمتەکانی بەرم دەکەوێت.

ئەگەر پێتان وایە مەیلی ئەوەم هەیە وردەکارییەکانی ئەو شەوە زۆر بە وردی باس دەکەم، بۆ ئەوەیە بزانن کە هەرگیز من کەسێکی خراپ و تاوانبار نیم، هەرگیز بیرۆکە و پلانەکانم بۆ کارێکی تاوانکاری نەبووە، بەڵکوو لەسەر بنەمای لوتکەی شیعرییەتدا بوو، ئامانجی من هەستێکی باڵا بوو لە ڕێی دەستلێدانێکی نەرم، کە بە ئەستەم گەرمییەکەی پێم دەگەیەشت، تەنانەت ئەگەر بە خەبەریش بوایە ئاسایی بوو، بۆیە ئاواتەخواز بووم خەوێکی قووڵ بخەوێت بۆ ئەوەی چێژێک لە جەستە پڕچێژەکەی وەربگرم.

نووقمی ئەم خەوە بووم زەنگی کاتژمێرەکە پێنجی ڕاگەیاند و دەنگەدەنگی نێو هۆتێلەکە دەستی پێکردەوە و دەنگی ئەسانسێرەکە هات، وامدەزانی ئەوەیەک تێدەپەڕێت تا ئەو کاتەی زیکەزیکی **لۆلیتا** خەبەری دەبێتەوە و دەمبینێت لە تەنیشتییەوە خەوتووم، کاتژمێر گەیشتە شەشی بەیانی، **لۆلیتا** بە تەواوەتی خەبەری بووەوە، لەگەڵ سەعات شەشوچارەک بە شێوەیەکی هونەری بووینە دوو عاشق.

قسەکانم ئاراستەی ئەو خانمانەی دەستەی پارێزەرانی دەکەم، کە بڕیار لەسەر چارەنووسم دەدەن، ئەو ژنانەی تووشی ساردیی سێکسی بوونە، ئێستا کارێکی نامۆ ئاشکرا دەکەم؛ لە ماوەی ئەم چارەگەسەعاتەدا، من نەبووم کە **لۆلیتام** دەورووژاند، بەڵکوو **لۆلیتا** خۆی منی وروووژاند، ڕاوچییەکە بووە نێچیر، ئەمەش چیرۆکەکەیە: کاتێک گوێم لە دەنگی وەنەوزدان بوو، خۆمم وا پیشان دا کە خەوتووم، نەمدەزانی چ بکەم، لە دڵی خۆمدا پرسیاری ئەوەم دەکرد ئایا کە ئێستا دەمبینێت لە تەنیشتی ڕاکشاوم ڕاناچڵەکێت و ناترسێت؟ پرسیاری ئەوەم دەکرد ئاخۆ جلەکانی کۆناکاتەوە و ڕوو بکاتە گەرماوەکەوە و دەرکە دابخات و داوا بکات بیگەڕێنمەوە بۆ رامسدێل، بۆ ئەوەی لە تەنیشت دایکی بێت؟ بەڵام **لۆلیتای** خۆشەویستم ڕۆحێکی وەرزشیی هەبوو، هەستمکرد نیگاکانی ڕووی لێ کردووم و سڵاوی بەیانیی لێ کردم، لە ئاوازی دەنگی زانیم کە چاوەکانی پێدەکەنن، خۆی غل کردەوە بەرەو لای من و پرچەکانی بەرچاوم کەوتن و خۆمم وا نیشان دا لە خەو هەڵساوم، بۆ ماوەیەک پێکەوە بە ئارامی ڕاکشاین، هێندێک دەستم لە قژەکەی دا، هێندەی پێ نەچوو لێوەکانمان لە ماچێکی ناسک و سوزداریدا یەکیان گرت، لە شێوازی

ماچکردنەکەیدا سواغبوونێکی هەڵچوون و شێوازێکی باڵام بەدی کرد، بەڵام بۆ ئەو لەوانەیە پێکەنیناوی بێت، گومانم لا نەما کە کچێکی لیسبیانە، نێزیکی بووەتەوە و لە منداڵییەوە فێری هونەرەکانی ماچکردن و گوشینی لێوی کردووە، چونکە لەتوانای هیچ گەنجێکی نێری هەرزەکاردا نییە ئەو کارەی فێربکات، وەکوو بڵێی دەیویست تاقیم بکاتەوە کە ئایا تاچەند هەستم بە وانەکانی ماچکردنی کردووە و کەمێک دوورکەوتەوە و روومەتەکانی سوور بوونەوە و بریقە کەوتە سەر لێوە تەڕەکانی، لە کاتێکدا خەریکبوو هەستم بەو گڕانە دەکرد.

لۆلیتا بەجۆرێک هاواری کرد، لە هاوارە تایبەتمەندەکانی پەرییە هارەکان بوو، دەمی لە گوێچکەم نێزیک کردەوە و بە هەناسەیەکی گەرم و دەنگێکی کزەوە قسەی دەکرد، بۆ ماوەیەک لە قسەکانی تێنەدەگەیشتم، کەمێک پێکەنی و قژەکەی لەبەرچاوی کۆکردەوە و لایبرد و دووبارە هاتەوە و بەدەنگە ناسکەکەی قسەی دیکەی کردە گوێچکەمەوە، وامدەزانی مێشکم بۆردوومانی دەنگێکی ناسک دەکرێت، دواتر کە لە قسەکانی تێگەیشتم چوومە جیهانێکی خەوناویی نوێیە، تێگەیشتم بەو قسە ناسکانەی پێشنیاری چ دەکات.

داوای لێ دەکردم یارییەک بکەین هاوشێوەی ئەو یارییەی کە لەگەڵ چارلیی کوڕی خاوەنخێوەتگەکە کردوویەتی، کە تاکە کوڕ بووە لە خێوەتگەی کچان، وەڵامیم دایەوە و گوتم نازانم ئەو یارییە چییە، بزەیەک لێوی نەخشاند و نیشانەی باوەڕنەکردن لە ڕووخساری دەرکەوت:

- ئایا تۆ هەرگیز ئەو یارییەت نەکردووە؟

لەو کاتانەدا لیوم بەسەر شانە رووتەکانیدا دەسووڕایەوە، لە کاتێکدا بە تیژی گوتی تکایە بەسە.
شێوازێکی زۆر نامۆی هەبوو، ئەو شێوازەم بۆ ماوەی چەند مانگێک لە بیری خۆمدا هەڵگرتبوو، بەوەی سەیری هەموو دەستلێدانەکانی دەکرد، جگە لە ماچکردنی دەم و جووتبوون و (کاری نائاسایی) یاخود رۆمانتیکی، دووبارە بە شێوەیەکی جەختکردنەوە خۆی چەماندەوە سەرم و پرسیاری کردەوە:
- ئایا لەو کاتەی کە هەرزەکار بووی ئەوەت نەکردووە؟
بە ڕاستگۆییەوە وەڵامیم دایەوە و گوتم: نەمکردووە.
گوتی:
- باشە لێرەوە دەست پێدەکەین، بزانە چۆن دەکرێت.

خوێنەرەکانم بێزار ناکەم بە رۆمانێکی زۆر ورد لە بارەی **لۆلیتا**وە کە تا چەند پسپۆڕە لە بارەی سێکسەوە، پێم وابێت ئەوەندە بەسە کە بڵێم هیچ سادەییەکم لەو هەرزەکارەدا بەدی نەکرد کە بەتەواوەتی پێکهاتەی پڕ نەبووبوو، بێ سادەیی و تەواونەبوونی پێکهاتەی بێبەشی کردبوو لە زۆر شت، وەکوو خوێندنی تێکەڵاو و کردەوەی کارە لادەرەکانی هەرزەکارەکان و ترسی گورگە پێگەیشتووەکان، کە لە دەوروبەری خوێندنگە و سەربازگەی کچان دەسووڕانەوە.
لەوە تێگەیشتم کە **لۆلیتا** کاری سێکسیی وەکوو بەشێکی شاراوە و پەردەپۆش لە جیهانی هەرزەکاراندا دەبینی، ئەو جیهانەی کە گەورەکان پێی نازانن، ئەوەی گەورەکان دەیکەن لە پێناو پاراستنی جۆرێتیدا هەرگیز گرینگ نەبوو بۆ ئەو، بۆیە کە لە من نزیکەوە بوو، پێی وابوو ژیانی سێکسیی من دوور بووە لە هەست، هەرچەندە ئەو

دەگرن، پێم خۆشە تیۆری تێدا دیاری بکەم، بەڵام شکستێکی گەورەی تێدا دەکەم.

کەنیسەی جێبڕوای یاسای ڕۆمانی، ڕێ بە کچ دەدات لە تەمەنی دوازدەساڵیدا هاوسەری بکات، تا ئێستاش لە هێندێک ویلایەتەکانی ئەمەریکا ئەو یاسایە پەیڕەو دەکرێت، هەروەک یاسا لە هەموو شوێنێکدا ڕێ دەدات کچ لە تەمەنی ١٥ساڵیدا هاوسەریتی بکات.

دانەری شەرعییەتەکان، ئەگەر لە نیوەگوی ڕۆژهەلات یاخود ڕۆژئاوای توپی زەوی بێت، دەڵێن ئاساییە ئەگەر پیاوێکی چلساڵان زەواج لەگەڵ کچێکی ١٥ساڵدا بکات، بەڵێ، لاریی لەوە نییە ئەو پیاوە پیرە خۆی بهاوێتە باوەشی جوانی بووکە بچووکەکەیەوە.

لە کتێبخانە زیندانییەکەمدا گۆڤارێکم دۆزییەوە تێیدا هاتووە، کەشی چالاکی شارەکانی (کسانت لویس و شیکاگو) وا دەکات کچی دوازدەساڵ پێشوەخت پێبگات.

**لۆلیتا** لە شوێنێک لەدایک بوو، لە دووریی کەمتر لە ٣٠٠ میل لە کەشی شیکاگۆی چالاکەوە، بەڵام من شتێکی گەورەترم نەکرد، بەڵکوو من وەکوو سوننەتی سروشت لەگەڵیدا بووم و وەڵامی سروشتەکەم دایەوە، چونکە من سەگێکی بەوەفا بووم، لە سەگەکانی سروشت.

بەڵام ئەم هەموو سەرسووڕمانە چییە نووساوە بە منەوە و لێم نابێتەوە؟ ئایا من بوم گوڵی **لۆلیتام** کردەوە؟ من قسەکانم ئاراستەی ئەو ئەندامە هەستیار و نەرمانەی دەستەی دادوەران دەکەم و دەڵێم: نەخێر، من نەبووم کە گوڵەکەم کردەوە، واتا من یەکەم عاشق نەبووم کە لەگەڵ **لۆلیتادا** جووت بووم.

## ٢٩

**لۆلیتا** ئەوکاتەی لەسەر جێیەکەمان نانمان دەخوارد بۆی باس کردم کە چۆن هەتک کرا. باسی بۆ دەکردم. مۆزەکەی پاک دەکرد و مۆرەبای هەرمێی دەخوارد. بە راشکاوانە هەمووی باس کرد.

چیرۆکە نامۆیەکەی لە بارباراوە دەستی پێکرد کە لە هاوینی پێشووتردا و لە دوایین خێوەتگەی کچانیشدا پێکەوە خەوتوون. بە شێوەیەک باسی هاورێیەکەی کرد کە کچێکی زۆر مەزن و ئیمچەشێتێکە! و زۆر شتی کرداریی فێر کردووە.

باربارا کچێکی زەردە بووە و دوو ساڵ لە **لۆلیتا** گەورەتر بووە و لە هەموان باشتر بووە لە مەلەوانیدا و بەلەمێکی خێرای هەبووە. هەمیشە بانگهێشتی **لۆلیتای** کردووە کە هاوبەشی بێت، چونکە **لۆلیتا** باشترین کچ بووە لە مەلەی سەرپشتدا. هەموو بەیانییەک بەلەمێکیان هەلگرتووە و دارستانەکەیان بڕیوە. تاکەنێرینەی خێوەتگەکە ناوی چارلی هۆلمز و کوڕی بەڕێوەبەری خێوەتگەکە بووە، ١٣ ساڵان بووە، هەمیشە هاوکاریی کردوون.

هەموو بەیانییەک ئەو سێ هەرزەکارە ڕێیەکی لاوەکییان لە دارستانەکەدا گرتووەتە بەر و لە خاڵێکی دیاریکراودا لەگەڵ باربارا تەنیا بوونەتەوە و **لۆلیتاش** ئیشکگریی بۆ کردوون. لە سەرەتادا **لۆلیتا** مەسەلەکەی رەت کردووەتەوە (کە تاقی بکاتەوە)، بەڵام حەزکردن بە تاقیکردنەوە و کاریگەریی هەژموونی برادەرەکەی توانی بە سەریدا زاڵ ببێت، وای لێهات، بە سەرە لەگەڵی تەنیا دەمانەوە، چارلی کوڕێکی جوان بوو، هەرگیز بێزار نەدەبوو و کۆمەڵێک وێنەی

ئەفسوونگەر و وروووژێنەری هەبووە و کۆمەڵێک کۆندۆمی هەبوو، کە لە زەریاچەیەکی تەنیشتیان کۆیانی دەکردەوە.
هەرچەندە **لۆلیتا** پێی وابووە مەسەلەکە جۆرێک بووە لە یاریکردن، پێشی وابووە کە ئەو کارە بۆ پێست باشە، خۆشحاڵیش بووم بەوەی کە زۆری رق لە چارلی و بیرکردنەوەکانی بوو، هەرچەندە چێژی پێ بەخشیوە، هەرگیز بەو شەیتانە پیسە هارە نەدەورووژێنرا، بەڵام پێی وابوو کە ساردیی سێکسیی تێدا بڵاوکردووەتەوە.
سەعات گەیشتە ١٠، کاتێک کۆتاییی بە چیرۆکەکەی هێنا، لەو کاتەدا هەستم کرد سەرم پڕ بوو لە ئێشێکی کارەساتئامێز، بە شێوەیەک لەگەڵ زیادبوونی رووناکیی خۆر و ئاشکرابوونی لایەنە واقعییەکان، ئەو ئێشە زیاتر دەبوو.
**لۆلیتا** بە رووتی و بەجەستەیەکی ماندووەوە لەبەردەم ئاوێنەکەدا وەستابوو، دەستە سپییەکانی لا کردەوە و لەسەر سمتی دانا، لاقەکانیشی بڵاوکردەوە و سەیری خۆی دەکرد، بەسەرسوورمانێکی زۆرەوە یاریی بە تاڵەقژێکی درێژی پەلکەکانی دەکرد، کە هاتبووە نێوچەوانییەوە، لەو کاتەدا گوێمان لە دەنگی خزمەتگوزاری ژوورەکان بوو و یەکێکیان هەوڵی دا دەرکەی ژوورەکە بکاتەوە و **لۆلیتا** خۆی کرد بە گەرماوەکەدا بۆ ئەوەی دوشێکی گەرم بکات، چونکە زۆری پێویستی پێبوو.
منیش پاشماوەی خواردنی سەر سینیەکەم کۆ کردەوە و بەتانی و چەرچەفی سەر سیسەمەکەم بە شێوەیەک رێک خست کە پاکیی باوکوکچێتیی تێدا دیار بێت و هەستێکی وا نەبەخشێت کە ئەو شوێنە شانۆی پێوەندییەکی سێکسی بووە.

**لۆلیتا** بە پەلە جلەکانی لەبەر کرد، هێندێک پارەم کردە جانتاکەیەوە و پێم گوت لە هۆڵی هۆتێلەکە چاوەڕێم بکە و گۆڤارێک بۆ خۆت بکڕە و کاتەکەی پێ بەسەر بەرە تا دەگەمە پێت، ئەوەشم بیر نەچوو ئاگاداری بکەمەوە کە لەگەڵ کەسانی نامۆدا قسە نەکات.

کاتێک دابەزیم بینیم هەردوو قاچی لوول داوە بەیەکەوە و خەریکی خوێندنەوەیە، بەشێک لە سکی دەرکەوتبوو، پیاوێکیش هاوشێوەی تەمەنی من بوو بە دزییەوە سەیری سپێتیی سکی دەکرد، بە کەسوکاری خزمە سویسرییەکانم دەچوو، بە (گۆستاڤ)ی مامم دەچوو، ئەویش بە هەمان شێوە سەرەڕۆیەکی گەورە بوو و ئارەزووی دۆزینەوەی شتەکانی دەکرد و بە درۆ خۆی وا پیشان دەدات کە ڕۆژنامە دەخوێنێتەوە.

هیچ شتێک نەیدەتوانی هاوسەنگیی نێوان منداڵی و هەرزەکاریی دیمەنی **لۆلیتا** بکات، بەو لووتە بچووک و ڕووخسارە پرشنگدارە و پەڵە سوورەکانی سەر لاملی (ملی بەسفرەی خواردنێکی چەور دەچوو)، بنێشتێکیشی لە دەمدا بوو، جاروبار گلۆپێکی پێ دەکرد و دەیتەقاند.

رووم کردە نووسینگەی هۆتێلەکە، بۆ ئەوەی کۆتایی بە شانۆگەرییەکە بێنم، پرسیارم لە نووسەری هۆتێلەکە کرد کە ئایا هاوسەرەکەم تەلەفۆنی نەکردووە؟ بە نەخێر وەڵامی دامەوە و تکام لێ کرد کە ئەگەر تەلەفۆنی کرد ئەوە پێی بڵێت، ئێمە رووممان کردووەتە بێستانەکەی پوورە کلارا و پارەکەم پێی دا و دەستی **لۆلیتام** راکێشا کە هێشتا سەرقاڵی خوێندنەوەی گۆڤارەکە بوو.

لێرەدا پێویستە ئەوە بە بیری خوێنەری ئارامگر بێنمەوە کە ئاراستەکەمان بەرەو شاری (لیبیگفیل) بوو کە نێزیک بوو لە

نەخۆشخانە وەهمییەکەوە، چونکە بە **لۆلیتام** گوتبوو گوایە دایکی لەو نەخۆشخانەیەدایە.

کاتێک بە ئۆتومبێلەکە سەرکەوتین، نیشانەکانی ئازارم لە ڕووخساری **لۆلیتادا** بینی، دواتر ئەو نیشانانە هێدی هێدی روونتر بوونەوە لەو کاتەی کە **لۆلیتا** لە تەنیشتم دانیشت، بێگومان ئەو بۆ ئەوە وایکرد کە هەست بەوە بکەم کە ئازاری جەستەیی هەیە و بە گەمژانە پرسیارم لێ کرد:

- چیتە؟

گوتی:

- هیچم نییە، هەی ئەژدیها.

پرسیارم کرد:

- بۆ وا دەڵێی؟

بێ دەنگ بوو و هیچی نەگوت، بەڵام بێدەنگییەکەی جاڵجاڵۆکەکانی ترسی بە نینۆکە زبرەکانی کردە پشتمەوە، هەستم بە دۆخە واقعییەکە کرد: ئەم کچە بێ دایک و باوکە، کچێکی پارچەڵەیە و کورتەبالایە، ئەژدیهایەکی دڕندە ئەم بەیانییە سێجار جووت بوو لەگەڵی.

هەرچەندە خەونی ژیانم هاتە دی، بە شێوەیەکی زۆر لەوە جوانتر کە هیوام بۆی دەخواست، بەڵام ئەوەش ڕێگر نەبوو لەوەی کە ببێتە مۆتەکەیەکی تۆقێنەر، لەو چرکەساتەدا درکم بەوە کرد کە بێهەست و گەمژە و خراپەکارم.

ئەگەر ڕاشکاوێتی بگرمە بەر، ئەوا لەگەڵ ئەوەشدا نوقمی نێو ئەو ڕەهێڵە تۆقێنەرە بووم، بەڵام هەستم بە ئارەزوویەک دەکرد لە قوڵایی ناخمدا، بەڵێ، تا ئەو ئاستە حەزە سێکسییەکانم ترسناک و گەورە بوون- بۆ ئەو پەرییە هارە.

بە شێوەیەک تێکەڵی سەرزەنشتکردنی ویژدان و دڕکەکانی هەستکردن بە تاوان بووم... هەرچەندە ئەو شتانە ئازاری دەدام، بەڵام پێم وابوو کە بەم مەزاجەی ئێستایەوە لەوانەیە چیتر ڕێیم پێ نەدات، چێژی لێوەربگرم ئەگەر لە ڕێدا شوێنێکی چەپەک بدۆزمەوە و بتوانم ئۆتۆمبێلەکەی تێدا بشارمەوە.

دەکرێت بە شێوەکی تر گوزارشت لە دۆخەکە بکەم، کە هەمبەرتی نەگبەت بە خەمبارییەوە ئۆتۆمبێلەکەی بە خێرایی لێدەخوری بەرەو (لیبیگفیل)، مێشکیشی سەرقاڵ کردبوو بەوەی ڕێگەچارەیەک بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی لە ڕێیەوە بتوانێت نیزیک ببێتەوە لەو کەسەی کە لە تەنیشتییەوە دانیشتووە.

بۆ دواجار لۆلیتا پەتی بێدەنگی پچڕی و بە ورتەورتێکەوە گوتی:

- ئۆف، چ ئابڕووچوونێکە.

منیش بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕی پێم گوت:

- بەڵێ چ ئابڕووچوونێکە! چ عەیبەیەکە، وا نییە؟

- تکایە لە نێزیکترین وێستگەی پڕکردنی بەنزیندا ڕاوەستە. ئەمەوێت بچمە سەر ئاو.

بە دارستانێکی (سندیان)دا تێپەڕین کە سێبەری زۆری هەبوو، پێشنیاری ئەوەم کرد ڕابوەستین... هاواری کردە گیانم و گوتی، بەردەوام بە لە ڕێکردن.

لە وەڵامدا، منیش گوتم:

- فەرمانتە، بەسەر چاو، بەڵام تۆ ئارام بە.

سەیرێکی ڕووخساریم کرد، سپاس بۆ خودا بینیم پێدەکەنێت... هێندەی پێ نەچوو بە بزەیەکی پاکەوە قسەیەکی ئاراستە کردم و گوتی:

- هەی سووکی پیس. تا دوێنێ دیمەنی کچێکی پاکم هەبوو، سەیرکە چیت لێکردم، پێویستە بڕۆم بۆ پۆلیس و پێیان بڵێم کە لاقەت کردووم، هەی پیری پیس.
ئایا گاڵتەی دەکرد؟
دواتر سواغێکی هیستیری تێکەڵی قسەکانی بوو و سکاڵای ئازاری دەکرد، گوتی تاقەتی دانیشتنی نەماوە و گوایە شتێکم لە هەناویدا پچڕیوە، کاتێک ئەو قسەیەم لێ بیست، دڵۆپی عارەقێکی سارد بە قوڕگمدا هاتە خوارەوە، لەتاوا خەریک بوو بە ئۆتۆمبێلەکە لە سەگێک بدەم، بەردەوام بووم لە ڕێکردن و هاوڕێیەکەشم کە وەکوو ئاگر تووڕە بووبوو بەردەوام بوو لە جنێودان، کاتێک لە بەنزینخانەیەک وەستام و چووە سەرئاو، ماوەیەکی زۆر لە ژوورەوە مایەوە و کاتێک دەرچوو، بە زمانێکی ساردەوە گوتی:
- زۆر ئازارت داوم... هێندێک پارەم پێ بدە دەمەوێت تەلەفۆن بۆ نەخۆشخانەکە بکەم و پرسیاری دایکم بکەم... ژمارەی تەلەفۆنەکەی چەند؟
- سەرکەوە تۆ ناتوانی قسە لەگەڵ ئەو ژمارە تەلەفۆنە بکەی.
- بۆ؟
سواری ئۆتۆمبێلەکە بوو و دەرکەکەی داخست و بەرەو ڕێیەکی شاخاوی ڕۆیشتین و گوتی:
- بۆچی ناتوانم قسە لەگەڵ دایکم بکەم ئەگەر بمەوێت تەلەفۆنی بۆ بکەم؟
وەڵامیم دایەوە و گوتم:
- چونکە دایکت مردووە!

## ٣٠

لە شاری **لیبیگیفیل** چوار کتێبی وێنە و پاکەتێکی جلوبەرگ و کەرستەی جوانکاری و سەعاتی دەست و تێنس و پێلاوی پاژنەبەرز و ڕادیۆیەکی دەست و بنێشت و چاویلکە و گۆرەوی و جلی ناوەوەم بۆی کڕی. لە هۆتێلەکەیش دوو ژووری جیاوازمان گرت، بەڵام لە نیوەشەودا بە گریانەوە ڕووی کردە ژوورەکەم و زۆر بە کاوەخۆ ئەنجاممان دا. وەکوو دەبینن، هیچ شوێنێکی نەبوو ڕووی تێ بکات.

## ١

لەگەڵ پەرەسەندنی پێوەندییەکەمان، گەشتی چەندین شاری ویلایەتە یەکگرتووەکانمان کرد. هەمیشە ئارەزووی یەک جۆر هۆتێلم دەکرد، لە گوند بێت و پاک و ئارام بێت، وەکوو ئەو شوێنانەی کە عاشقان بە شێوەیەکی ناشەرعی پێوەندیی سێکسی و شەڕ و ئاشتبوونەوەی تێدا دەکەن.

لە سەرەتادا نوقمی ترس بووبووم لەوەی خەڵک هەست بە پێوەندییەکەمان بکەن، چونکە ژوورێکی گەورەم بە کرێ دەگرت، دواتر بۆم دەرکەوت کە دەتوانم دوو ژووری بچووک بگرم کە لە ژوورەوە شوێنی ئەوەی تێدا بێ هاوچۆ لە نێوانیان هەبێت، بە هۆی ئەو بیرۆکەیەوە ئەو ترسەشم لا نەما، هێندەی پێ نەچوو، تا درکم بەوە کرد کە پێوەندیی نێوان من و **لۆلیتا** مەترسیی تێدا نییە و بوێریی زیاترم لا دروست بوو، وای لێ هات هەمیشە یەک ژوور و دوو تەختەخەوم بە کرێ دەگرت.

ئەو ژوورەش وەکوو زیندانییەکی نێو بەهشت بوو بۆم، بەو پەردە زەردە داخراوانەوە، بەیانییان ڕەنگی تیشکی خۆرەکە کەشێکی ئەفسانەیی و خۆشی پێ دەبەخشین، لە سپێدەی شاری ڤینیسیا دەچوو، کەچی لە ڕاستیدا لە شاری (پەنسیلڤیا)دا بووین.

## ١

لەگەڵ پەرەسەندنی پێوەندییەکەمان، گەشتی چەندین شاری ویلایەتە یەکگرتووەکانمان کرد. هەمیشە ئارەزووی یەک جۆر هۆتێلم دەکرد، لە گوند بێت و پاک و ئارام بێت، وەکوو ئەو شوێنانەی کە عاشقان بە شێوەیەکی ناشەرعی پێوەندیی سێکسی و شەڕ و ئاشتبوونەوەی تێدا دەکەن.

لە سەرەتادا نوقمی ترس بووبووم لەوەی خەڵک هەست بە پێوەندییەکەمان بکەن، چونکە ژوورێکی گەورەم بە کرێ دەگرت، دواتر بۆم دەرکەوت کە دەتوانم دوو ژووری بچووک بگرم کە لە ژوورەوە شوێنی ئەوەی تێدا بێ هاوچۆ لە نێوانیان هەبێت، بە هۆی ئەو بیرۆکەیەوە ئەو ترسەشم لا نەما، هێندەی پێ نەچوو، تا درکم بەوە کرد کە پێوەندیی نێوان من و **لۆلیتا** مەترسیی تێدا نییە و بوێریی زیاترم لا دروست بوو، وای لێ هات هەمیشە یەک ژوور و دوو تەختەخەوم بە کرێ دەگرت.

ئەو ژوورەش وەکوو زیندانییەکی نێو بەهشت بوو بۆم، بەو پەردە زەردە داخراوانەوە، بەیانییان ڕەنگی تیشکی خۆرەکە کەشێکی ئەفسانەیی و خۆشی پێ دەبەخشین، لە سپێدەی شاری ڤینیسیا دەچوو، کەچی لە ڕاستیدا لە شاری (پەنسیلڤیا)دا بووین.

به شێوەیەکی پلەبەندی زانیمان چۆن کاتێکی خۆش لەو هوتێلە چۆلانەدا بەسەر ببەین، کە هاوشێوەی ماڵی عاشقانی (فلۆبیر و شاتۆبریان) بوون، فێر بووین چۆن گوڵی جوان و دەغڵەکانی سەر ڕێمان بەکار بێنین، جۆرەها هۆتێل و شوێنی حەوانەوەی هاوینەمان ناسی، کە چەندین گەرماوەی سەیر و نامۆی تێدا بوو، لەسەر دیوارەکانیدا ڕێنماییەکان هەڵواسرابوون و داوایان دەکرد پیسی و قوتوی بیرە و پاکەت و کۆرپەلەی مردوو فڕێ نەدەنە ئاوەدەستەکانەوە.

ئاشنای چەندین کەسی خاوەن ئەو شوێنانە بووین، کە ڕۆژانە چەندین گەشتیار ئۆتۆمبێلەکانیان لە پارکی پشتەوە دادەنێن، چەندین تاوانباری تۆبەکار و مامۆستا و بازرگانی مایەپووچمان بینی، هەر لەو شوێنانەدا ئەو ژنانەمان ناسی کە دەیانەوێت بە دیمەنێکی ئەرستوکراتی دەربکەون، هەروەها ژنانی تاوانبار و لەشفرۆشی خانەنشینیشمان بەرچاو کەوتن.

بە پێی ئەزموونەکەمان لەو هۆتێلانە دور دەکەوتینەوە کە بە (ماڵی گەشتیارەکان) ناسراو بوون، وەکوو شوێنی پرسە بوون، گەرماوەکانیان دووشی تێدا نەبوو، مێزەکانیشیان نەخشی لەسەر کرابوو، ڕەنگی جوانیش بە دیوارەکانەوە نەبوو، ڕەنگی سپیی ئەو دیوارانە مرۆڤی بێتاقەت دەکرد، لەو هۆتێلانەشدا هەمیشە وێنەی کوڕی خاوەنهۆتێلەکان بە جلی جەژنەوە هەڵواسرابوون.

هێندێک جار ناچاربووم ڕادەستی سووربوونی **لۆلیتا** بم و لەو هۆتێلانەدا بمێنمەوە، کە بە درۆ لە (مینۆ)کانیدا نووسراوە، (هۆتێلی ڕاستەقینە و خواردنی بەچێژ و جێی پێگەبەرز)، بیرم دێت جارێکیان ١٢٠ دۆلارم خەرج کرد بۆ ئەوەی دوو ڕۆژ لەو هۆتێلانەدا بین، کە

خاوەنە دزەکانیان بە قاوەیەکی بێبەرانبەر، بەیانیان دزی لە خەڵک دەکەن و ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە تەمەنی خوار ١٦سال لە هۆتێلەکەیاندا وەرناگرن (بێگومان لە ڕووی تیۆرییەوە **لۆلیتا** لەو هۆتێلانەدا، قبوولکراو نییە!)

زۆر جار لە وێستگەی پشوودانی ئۆتۆمبێلەکاندا دەوەستاین، **لۆلیتاش** بیانووی زۆری دەگرت، هەمیشە گلەیی ئەوەی دەکرد کە بۆچی ڕێی پێنادەم پیاسەیەکی ڕێیە شاخاوییەکان بکات، هێندێک جار داوای دەکرد قاوەخانەیەک بدۆزمەوە، کورسییەکانی لەژێر دارسنەوبەردا بێت و لە شێوەی شیزلۆنگ بێت، چەندەها جار بە سەعات دەپاڕایەوە و داوای بەڵێنی لێدەکردم، هەمیشە ئارەزووەکانی خۆی دەخستە پێش ئارەزووە خەماوییەکانم، پێنج دۆلاری لێ وەردەگرتم بەرانبەر بەوەی پێنج دەقەیەک قاچە ئەسمەرەکانی بخاتە بەردەستم و پارەکەی بە کرێی کابینەکان خەرج دەکرد.

**لۆلیتا** هەر کاتێک بیویستبا، دەیتوانی ببێتە یەکێک لە زۆرترین ئەو بوونەوەرانەی کە کێشە دروست دەکەن، ڕەفتارەکانی تێکەڵەیەک بوو لە بێسەروبەری و نەرمونیانی و زەلیلبوون و ناز، لە ڕاستیدا من لە ڕووی دەروونییەوە ئامادە نەبووم چارەسەری بێتاقەتی و بێزاربوونەکانی بکەم، لەڕووی عەقڵییەوە وەکوو هەرزەکارێکی پیس و بچووک و ئاسایی بوو.

موسیقای جاز و سەمای خێرا و قوتوی ساردەمەنیی پڕ لە فستقی بەستراو و گۆڤاری سینەمایی... هتد، لە لووتکەی لیستی خۆشەویسترین شتەکانی بوو، خودا هەر خۆی دەزانێت لەگەڵ هەموو ژمەنانخواردنێک، چەند پارەی ئاسنی لە باوڵە بریقەدارەکانی مۆسیقا

خەرج دەکرد، بۆ ئەوەی گوێ لە گۆرانییەکی بازاڕی و بەجۆش بگرێت.

هێشتا دەنگی ئەو گۆرانیبێژە قوڕانە لە گوێمدا ماوەتەوە، کە **لۆلیتای** خەیالاوی لەسەر ئاوازەکانیان خۆی بادەدا، هەمیشە متمانەیەکی کوێرانەی بە ڕیکلامی گۆڤاری سینەماکان هەبوو، وای دەزانی لە ئاسمانەوە بۆی هاتوونەتە خوارەوە، لەهەر ڕیکلامێکدا کە داوای سەردانی شوێنێکی بکردبایە دەبوایە سەردانی ئەو شوێنەمان بکردبایە، بۆ نموونە ئەگەر ڕیکلامێک بیگوتبایە بووکەڵەی هیندی بکڕن، دەبوایە **لۆلیتا** بووکەڵەی هیندی بکڕێت، ئەگەر ڕێکەوت بەرەو ڕیکلامێکی گلۆپداری بردباین و تێیدا نووسرابێت ساردەمەنی پێشکەش دەکەن، **لۆلیتا** هار دەبوو، هەرچەندە ساردەمەنی لە هەموو شوێنێک هەبوو، بەڵام چونکە ڕیکلام بوو، **لۆلیتا** دەبوایە بیکڕێت، **لۆلیتا** نموونەی پارەخەرجکەرێکی گەمژە بوو، ئەو ڕیکلامانەش ئامانجیان ئەو کەسانە بوو کە هاوشێوەی **لۆلیتان**.

لەو ڕۆژانەدا هیچکاممان بیرمان لەوە نەکردبووەوە بەژیرانە مامەڵە لەگەڵ بەرتیلی پارە بکەین بەرانبەر بەیەک، دواجار گەیشتین بەوەش، ئەو کارەش بۆ هێورکردنەوەی تووڕەیی من و بەرزکردنەوەی ورەی ئەو.

پشتمان بە سێ شێواز بەست، بۆ ئەوەی خولقوخووی خۆشەویستەکەم بەبێ مەترسی بمێنێتەوە و گوێڕایەڵ بێت. یەک: ئەو باسی لەوە کرد کە چەند ساڵێک بەر لە ئێستا هاوینێکی سەختی لە بێستانی لادێیەک بەسەر بردووە، مامۆستایەکی قەیرە سەرپەرشتی کردووە، لە کەشێکی ناخۆشدا بەزۆر فێری شتەکانی کردووە، بێستانەکە بیست میل لە ئاوەدانییەوە دوور بووە، کاتێک باسی ئەو

بیرەوەرییەی دەکرد، نیشانەکانی ناخۆشی و بێزاری ڕووخساری تێکدەدا.
لەسەر ئەو بنەمایە هەر کاتێک بەڕەفتارە منداڵانەکەی تووڕەی بکردابام، بەڵێنی ئەوەم پێدەدا، ئەگەر پێویست بکات و ڕێچکەی ڕەفتارەکانی نەگۆڕێت، ئەوە بۆ شوێنێکی چۆلی دەبەم و بۆ ماوەی چەند مانگێک یاخود چەند ساڵێک لەژێر سەرپەرشتیی خۆم وانەی لاتینی و فەڕەنسی پێدەڵێمەوە.
چونکە هەمیشە ڕۆحێکی سووکی هەبوو، هاواری دەکرد و ڕەتی دەکردەوە و دەستەکانی دەگرتم و دەپاڕایەوە، ئەو بەڕاستی وای دەزانی کە لە کاتی تووڕەبوونمدا من ئەو کارە دەکەم و بەرەو دوورخراوگەیەکی تاریکی دەبەم، بەڵام کاریگەریی ئەو ترساندنە هێدی هێدی لاواز دەبووەوە، لەگەڵ بەردەوامبوونی سەفەرەکەمان بەرەو ڕۆژهەڵات، دەبوایە ڕێچارەی دیکەم بگرتایە بەر بۆ ئەوەی قایلی بکەم و رادەستم بێت.
دوو: لە نێوان ئەو ڕێچارانە بیرم دێت هەستی، شەرم و ئابڕووچوون وەکوو سەرزەنشتکردنێک بوو بۆ ئاراستەکردنی.
لە سەرەتای پێوەندییە ناشرینەکەمان، بە شێوەیەک درکم بەوە کرد کە پێویستە هەماهەنگی تەواو دابین بکەم لەوەی پێوەندییەکەمان بە نهێنی بمێنێتەوە، تەنانەت هەرچەندە رقم لێی بێتەوە و هەرچەندە داوای شتی تر بکات و لە هەموو دۆخەکاندا، دەبێت پاراستنی نهێنی ببێتە یەکێک لە نەریتەکانی.
هێندێک جار تەنانەت کە تەنیاش دەبووین پێم دەگوت: (وەرە باوکە پیرەکەت ماچ بکە، چی دی ئەو شتە قۆڕانە مەکە.)

ئاهـ **لۆلیتا**، پێشتر سوارچاکی خەونەکانت بوم و لە نێوان باسکەکانتدا ئاهەکانت بوم دەژمارد، بەڵام ئێستا من تەنیا باوکە پیرەکەتم، تەنیا باوکێکی خەیاڵیم و کچە خەیاڵییەکەم دەپارێزم.

بۆ ئەوەی **لۆلیتام** لە ڕووداوی کۆڵانە تاریک و پێچە خەیاڵییەکانی نێو دارستان و دەشتاییەکانی ڕۆژانی هاوینی پاکدا بیپارێزم لە دەست مرۆڤە گورگەکان کە پەلاماری کچەکان دەدەن، ئەو کارانەم دەکرد.

بەڵێ، بڕیارم دا ببمە پاسەوان و پارێزەرت، لەوانەیە دادگە هۆکارێکی یاسایی بۆ ئەو پاسەوانییە بدۆزێتەوە.

با ئەو گوزارشتە قانوونیانە وەلاوە بنێین، سەبارەت بە شەرعییەتی نیشتەجێبوون و جووتبوونی پیاوێکی پەنجاساڵە و هەرزەکارێک کە تەمەنی پانزەساڵی تێنەپەڕاندووە، من تاوانبارێکی خراپەکار و لادەر نیم کە ڕێ بە خۆی بدات بە شێوەیەکی ناشرین لە هەرزەکارێک نیزیک ببێتەوە، کە پێشتر بەتاوانێک چارلی هۆلمزی کوڕی بەڕێوەبەرەکە کچێنیی پێ لە دەست داوە، بەڵکوو من دوکتۆری چارەسەر بووم.

بە **لۆلیتام** دەگوت: سەیرکە **لۆلیتا** ئازیزەکەم! من باوکی خۆشەویستی تۆم، سەیری ئەم کتێبە باشە بکە کە تایبەتە بە هەرزەکارەکان، دەڵێ (کچی ئاسایی - ئاگادار بە - کچی ئاسایی هەمیشە گوێڕایەڵی باوکیەتی، چونکە باوک ئەو پیاوەیە کە کچ چاوەڕێی دەکات و حەزی پێدەکات، بەڵام دایک حەکیمە و بۆ ئەوە ئەفرێنراوە کە هانی کچەکەی بدات ببێتە هاوڕێی باوکی و دڵی باوکی رازی بکات و وێنەی پیاوی خەونەکانی لە باوکیدا پێشانبدات و وەکوو جوانترین نموونە دەریبخات.

ئێستا ئەو پێوەندییە چییە کە ئەم کتێبە پێشنیاری دەکات، ئەوەی لەم کتێبە باشەدا پێشنیار کراوە، ئەوەیە:
پێوەندی سێکسیی نێوان کچ و باوک لەلایەن خەلکی سەقلییەوە کارێکی ڕێپێدراوە، بەو پێیەی ئەو کارە ڕوویداوە و کۆمەلگە لەوێدا بە شێوەی سووکایەتی سەیری ئەو کچە ناکات کە بەشداریی لەو جۆرە پێوەندییانەدا دەکات."
دوای خوێندنەوەی ئەم چەند دێرە بە **لۆلیتام** گوت: من سەرسامم بە خەلکی سەقلییە، ئەوان وەرزشوانی لێهاتوو و موزیکژەن و کەسانێکن بە شێوەیەکی جوان پەروەردە کراون.
پێویست ناکات بە نائاسایی و لادەر بانگمان بکەن، لە ڕۆژنامەکاندا ئەوەمان خوێندەوە کە چەندین پیاو دانیان بە پێشێلکاریی قانونی ڕەوشتی گشتی کردووە و لە ویلایەتێکەوە بۆ ویلایەتێکی تر دەڕۆیشتن کچی پارچەلەی نۆسالانیان دەگواستەوە بۆ ئەوەی کاری بەدڕەوشتیان پێ بکەن، ئێستا ئازیزەکەم! تۆ تەمەنت نۆ سال نییە و لە سیانزەسالی نێزیک بوویتەوە و نامەوێت وا هەست بکەی کە کۆیلەی منی، بەلام من گالتەجاڕیم بە یاسای پاراستنی ڕەوشتی گشتی دێت، چونکە خۆی بە وتەیەکی دووڕووەوە تێوەدەگلێنێت، لەڕاستیدا باس لە تۆلەکردنەوەی خواوەندێکی خەیالی دەکات لە خراپەکاران، بەلام من یاسا ناتوانێت هیچم لەگەل بکات، چونکە من باوکی تۆم و بە زمانی ئینگلیزی قسە دەکەم و خۆشمەوێی.
**لۆلیتا** گوتی:
- با بزانین چ ڕوودەدات کە ئەگەر پیاوێکی بەتەمەن هەرزەکارێک تۆمەتبار بکات، بە خراپەکاریی ڕەوشت لەنێو هۆتێلێکی باشدا؟ چ

ڕوودەدات ئەگەر ئاگاداری پۆلیس بکەیتەوە لەوەی کە من تۆم ڕفاندووە و خراپەکاریم لەگەڵت کردووە؟
گریمان پیاوانی پۆلیس بڕوایان پێت کرد:
بەرزترین سزا دەگاتە دە ساڵ بۆ هەر کەسێک کە تەمەنی لە سەرووی بیستویەک ساڵەوە بێت، لە حاڵەتێکدا ئەگەر کچە هەرزەکارێک ڕێی پێ بدات سێکسی لەگەڵ بکات، بە هەمان شێوە لەچوارچێوەی یاساوە ئەو کچە هەرزەکارە، دەبێتە هۆی ئەوەی قوربانییەکەی بە لاقەکراو و ئەنجامدەری سێکسی ناشەرعی لەقەڵەم دەدرێت، بەم شێوەیە دەچمە زیندانەوە، ئەی تۆ چیت بەسەر دێت بێ دایک و باوک، لەو حاڵەتەدا، دەبیتە بەدبەخترین کەس، بە ئامانەت ڕادەستی بەڕێوەبەرایەتیی کاروباری کۆمەڵایەتی دەکرێیت و ژنێکی توندوتیژ، سووراوەکەت لە لێو دەسڕێتەوە و بۆن و جلە تازە هەوریشمەکەشت دەبات و تەنوورەیەکی درێژت پێدەدات لەگەڵ کراسێکی قۆڵدرێژ و سینەداخراو و بۆ زیندانت دەبات.
نازانم **لۆلیتا**! یاساکانی تایبەت بە پارچەڵە لادراوەکانت بیستووە چۆنە، یان نا؟
ئەگەر هەواڵەکە بگاتە پۆلیس لە پشت دەرکە داخراوەکانەوە دادەنیشم و بەڕێوەبەرایەتیی کاروباری کۆمەڵایەتییش سەرپشکت دەکات، کە تۆی منداڵێکی دڵخۆش بۆ ئەو زیندانە بڕۆی یان ئەوەی تریان، ڕۆژگارەکەشت بە وتنەوەی سرودی ئایینی و خوێندن و کاری ناوماڵ بەسەر دەبەی، ڕۆژانی یەکشەممانیش لەتەنانێکی چەورت پێدەدرێت، لەو حاڵەتەدا ناچارت دەکەن ڕووبکەیتە یەکێک لەو زیندانانە، چونکە تۆ پارچەڵەیەکی تاوانباری و پێویستت بە چاکسازییە.

بە شێوەیەکی ڕوونتر ئەگەر پۆلیس بەم پێوەندییەمان بزانێت ڕاستەوخۆ زیندانی دەکرێی.

کە باسی زیندانی دەکەم واتا تۆ و ٢٠ پارچەڵەی دیکەی هاوشێوەی تۆ لە ژوورێکی پیسی تاریکدا دادەنرێی و لەژێر سەرپەرشتیی ژنانێکی توندوتیژ و دڵڕەقدا دەبیت.

پێت وا نییە **لۆلیتا هیز** لەگەڵ باوکە پیرەکەیدا بمێنێتەوە؟

بە دووبارەکردنەوەی ئەم قسانە و خستنەڕووی وردەکارییەکانی توانیم ترس بخەمە دڵی **لۆلیتاوە**، چونکە ئەو کچە ژیرە نەبوو کە ڕووخساری دەریدەخست، ئەم ترساندنەش ڕۆڵی هەبوو لەوەی **لۆلیتا** خۆی نەرمونیانتر بکات لەو ڕەفتارە بێسەروبەریانەی کە دەیکرد.

بەهەرحاڵ. توانیم ئەوە جێگر بکەم لە مێشکیدا کە نهێنییەکە بپارێزێت و بەشداریی بێدەنگی بکات و هەست بە تاوان و گوناحیش بکات، بەڵام لەوەدا سەرکەوتوو نەبووم کە بەردەوام مەزاجێکی باشی بۆ دروست بکەم.

هەموو بەیانییەک دەبوایە خۆم شەکەت بکردایە بۆ ئەوەی شتێک بدۆزمەوە کە هیوابەخش بوایە بۆ **لۆلیتا**، تاکوو ئەو کاتەی ڕوومان دەکردە جێی نووستن، ئەگینا پەیکەری ئەو ڕۆژەی دەڕووخاند و مەزاجی تێکدەچوو، دەبوایە بەڵێنی شتێکم پێبدایە تەنانەت ئەگەر بێبەهاش بوایە، وەکوو سەردانیکردنی منارەی (ڤیرجینیا) یاخود سەردانیکردنی ئەشکەوتە سروشتییەکانی (ئەرکنساس) کە کراوەتە قاوەخانەیەکی گشتی، بەڵام ئەو بەڵێنەی کە دەمدا، دەبوایە وەکوو ئەستێرەیەکی جێگر لەسەر ڕێمان بوایە، تاکوو هاتوهاوار و دەربڕینی خۆشیی **لۆلیتا** دەستی پێبکردایە لەو کاتانەی کە دەگەیشتینە ئەو شوێنە.

لەچەندەها کاتژمێردا کە لە ژماردن نایەن باشترین هەوڵم دەدا، تەنیا بۆ ئەوەی ئەو هەستە بە **لۆلیتا** ببەخشم کە گەشتێکی خۆش ئەنجام دەدەین، لە نێوان ناوچە جوگرافییەکانی ئەمەریکا و لەسەر ڕێی دەشتاییە جوانەکاندا و لە نێوان ٤٨ ویلایەتدا گەشتمان دەکرد، زۆربەی کاتەکانی ڕێیەکەشمان بە بێدەنگی بەڕێدەخست، **لۆلیتاش** لەو کەسانە نەبوو کە چێژ لە دیمەنە سروشتییەکان وەربگرێت، تەنانەت بێزار دەبوو لەوەی کە باسی هێندێک وردەکاریی ئەو ئەو دیمەنانەم بۆ بکردایە.

پارێزەرەکە پێشنیاری کرد کە ڕاپۆرتێکی ڕوونی پێ بدەم لە بارەی ئەو شوێنانەی کە سەردانمان کردن، بەڵام لە ڕۆمانەکەمدا پێم وایە گەیشتوومەتە قۆناغێک، پێم قورسە بەوردی ئەو شوێنانە باس بکەم، لەگەڵ ئەوەشدا بیرەوەریی ڕۆژانەکانم تۆمار نەدەکرد و تەنیا یەک تیانووسم پێ بوو و هێندێک ڕووداوی گەشتەکانمانم تێدا تۆمار کردبوو، حاڵی ئەو دەفتەرەیش لە ڕابردوویەکی وێران دەچوو.

## ٢

خوێنەری ئازیز! پێویستە ئەوە بزانی کە گەشتەکانمان سەخت بوو، هەرچەندە لایەنی خۆشیشی تێدا بوو، تاقەشت کە هۆکار بوو بۆ ئەوەی بە هاوڕێتییەکی گونجاو بمێنینەوە، ئەوە بوو، دڵی **لۆلیتام** لە نێوان ماچێکەوە بۆ ماچێکی تر قایل بکردایە.

بە جۆرەها چێشتخانەی ئەمەریکیدا تێپەڕ بووین و جۆرەها خورادنمان خوارد، سەردانی چەندین شوێنی مێژوویی ئەمەریکامان کرد، کە مێژوویەکە لە ٣٠٠ ساڵ زیاتر تێناپەڕێت.

له هەرێمی میسیسیپی سەردانی مۆزەیەکمان کرد تایبەت بوو بە هۆتێلەکانی ئەورووپا، بە هەستێکی گەرمەوە هۆتێلەکەی باوکمم دۆزییەوە کە لە ڕیڤێرا بوو، هەرچەندە ئەوەم بۆ لۆلیتا باس کرد، بە بێباکییەوە گوتی:
- جا چییە؟
لە دارستانەکانی ویلایەتی (ئەرکنساس)دا میشوولەیەک دای بە شانی لۆلیتاوە و شوێنەکەی سوور کردەوە و ئاوساندی، بەرلەوەی لێوی پێوە بنێم و لە خوێنە بۆندارەکەی بخۆمەوە بە دەستم ژەهرەکەم گووشی.
سەردانی شوێنی هیندییە سوورەکانمان کرد و چووینە سەر چیاکان و...
لە ڕێیەکەماندا جۆرەها گەشتیاری شێتمان ناسی: پیاوێکی زانا بەدوای گیانەوەر و بەردەکاندا دەگەڕا. سەربازێک بە ئارامی لە ناوەڕاستی ڕێیەکەدا وەستاوە و هەست بە سەرنجراکێشیی بەرگە خاکییەکەی دەکات. خوێندکارێک ئارەزووی گواستنەوە دەکات، پیاوکوژێک ئارەزوو دەکات لانیکەم هەزار میل دوور بکەوێتەوە، خوێندکارێکی زانکۆ شانازیی بە خۆیەوە دەکات و لەسەر کراسەکەی بە پیتی گەورە ناوی زانکۆکەی نووسیوە، خانمێکی بەدبەخت پاتریی سەیارەکەی تێکچووە، دواتر گەنجە گورگەکان بەو ڕووخسارەیانەوە، یەخەی کراسەکانیان دەکردەوە و نیگاکانیان ڕکابەریی ورووژاندنی کچێکی تەنیایان دەکرد، کە لە ڕێیەکاندا بە تەنیایی گەشت دەکات و پێویستی بە هاوڕێتییە، **لۆلیتا** بە گاڵتەجاڕییەوە ئاماژەی بۆ ئەو گەنجانە دەکرد و دەیگوت با لەگەڵ خۆماندا سەریان بخەین.

منیش بە درێژاییی ڕێیەکە بە چاوێکی ئاگاوە چاوم لە **لۆلیتا** بوو، هەمیشە دەدرەوشایەوە، پێ دەچێت ئەو درەوشانەوەیەیش بە هۆی ئەو پێوەندییە سێکسییە بەردەوامەوە بێت کە پێکەوە هەمانبوو. درەوشانەوەکەی خەیاڵی کوڕانی هۆتێل و بەنزینخانە و گەشتیاران و خاوەنئۆتومبێلەکان و گورگەکان و خاوەنقاوەخانە و شیرینیفرۆشەکانی دەورووژاند. لە ڕووخساریاندا هەستم بە هەستەکانیان دەکرد، گوزارشتی ڕووخساریان، وای لێ دەکردم لە خۆبایی ببم، لە ڕاستییشدا ئیرەکردنیشی زیاد دەکردم.

**لۆلیتا**یش درکی بە درەوشانەوەی خۆی دەکرد و زۆرجار لە ناکاو کە بەدزییەوە نیگایەکی بۆ گەنجێک دەکرد، دەمگرت، تەنانەت جاروبار هەر ئەوەندە پشتم لێدەکرد بۆ ئەوەی شیرینییەکەی بۆ بکڕم، تا ئاوڕم دەدایەوە، دەمبینی گەنجێکی دۆزیوەتەوە و گۆرانییەکی باوی خۆشەویستی دەڵێنەوە.

لە کاتی پشووەکانماندا هێندێک جار درێژەم بە خەوەکەم دەدا و ڕێم بە **لۆلیتا** دەدا، لەگەڵ منداڵی ئەو کەسانەی میوانی هۆتێلەکان بوون، سەردانی باخچە و کتێبخانەی منداڵان بکات. لە کاتی گەڕانەوەدا پێش منداڵەکان دەکەوت و لە نێوان هەرزەکارە ڕووخسارناشرینەکاندا ڕێی دەکرد و ناوەندی هاوڕێیەکانی دەگرت و داوای دەکرد کە ڕێی پێ بدەم بڕوات بۆ خلیسکانێی سەر بەفر.

بیرم دێت جارێکیان ڕێم پێی دا بە تەنیا بڕوات بۆ خلیسکانێی سەر بەفر، زۆر بە توندی پێ گوتم هاوڕێتیکردنی منی پێ خۆش نییە، چونکە بەیانیان تەنیا بۆ هەرزەکاران تەرخان کراوە، بۆیە بەتەنیا و بە ناچاری لەنێو ئۆتۆمبێلەکەمدا لەبەردەم شوێنی خلیسکانێکە چاوەڕێم کرد، دەشمبینی زیاتر لە پەنجا هەرزەکار لە کوڕ و کچ جووتجووت

خلیسکانێی سەر بەفریان دەکرد، دەستم بە چاودێریکردنی **لۆلیتا** کرد
کە بۆ ماوەیەک دیار نەما، لە ناکاو دەرکەوتەوە و لەبەردەممەوە
تێپەڕی، سێ گەنجی بەڕەڵلا دەوریان دابوو، کە بەرلەوەی بچنە
ژوورەوە سەیری ئەمکچ و ئەوکچیان دەکرد و باسی جوانیی
جەستەی کچەکانیان دەکرد و لیوی خۆیان دەکرۆشت و ئارەزووی
ئەو کچانەیان دەکرد کە بە شۆرتێکی کورتەوە بەشی زۆری لاقیان
ڕووت کردبوو. لەو کاتەوە چیتر لەگەلیدا نەڕۆیشتم بۆ ئەو شوێنە.
سەفەرەکەمان توورەبوونێکی زۆری لە خۆ گرتبوو، هێندیک جار لە
خاڵەکانی پشکنیندا سەری لە جامی ئۆتۆمبیلەکەوە دەردەکرد و
بەنیگایەکی نامۆ و سەیرەوە لە پۆلیسەکانی دەڕوانی، منیش عارەقەی
سارد لە گەردنم دەهاتە خوارەوە و دواتر پۆلیسەکە پرسیاری لە
**لۆلیتا** دەکرد:
- کچی جوان! چ کێشەیەکت هەیە؟
لەهەموو شارێکدا کە دەوەستاین بە ڕەوشتێکی ئەورووپییانەوە
پرسیاری مۆزە و شوێنە فەرهەنگییەکان و خوێندنگە و ژمارەی
خوێندکاران و چەندین پرسیاری ترمان دەکرد، بۆ ئەوەی پاکیی
**لۆلیتا** بسەلمێنم.
هەمیشە ئۆتۆمبیلەکەم لە نیزیک خوێندنگەی کچانەوە رادەگرت و
سەیری کچە هەرزەکارەکانم دەکرد و **لۆلیتاش** لە تەنیشتم دەوەستا،
دیمەنی ئەو هەرزەکارانە خۆشەویستیی دڵی من بوو، بەلام **لۆلیتا**
بێزار بوو لەو دۆخە چونکە ئارەزووی ئەوەی نەبوو لە ویستی
کەسەکانی تر تێبگات و دەستی بە جنێودان دەکرد و
هەرزەکارەکانیش لە خوێندنگەکەوە بە تەنوورەی کورت و لاقی
سپییەوە دەردەچوون.

وەکوو چارەسەرێکی ناوەند بۆ جیاوازیی میزاجمان لەسەر ئەوە رێک کەوتین هەر کاتێک دەرفەت هەبێت برۆین بۆ مەلەوانگەی کچان، چونکە **لۆلیتا** ئەو ئاوەی دەپەرست کە بریسکەوبریقەی بێت. مەلەوانێکی لێهاتوو بوو، منیش جەستەی ڕووتی ئەو هەرزەکارانەم پێ جوان بوو، لەژێر چەترێکدا دادەنیشتم و چاودێریم دەکرد، زۆر بە لێهاتوویی لەگەڵ کچانی هاوتەمەنیدا مەلەی دەکرد، منیش **لۆلیتام** لەگەڵ پەرییە هارەکانی دیکەدا بەراورد دەکرد، خۆمم بە بەختەوەر دەزانی کە **لۆلیتا** موڵکی دەستەڕاستی خۆمە.

ئەمڕۆ من لە زینداندام و دەستم دەخەمە سەر دڵی بەئازارم، ئەوەم بیر دێتەوە، کە هیچ پەرییەکی هارم نەبینی لە وروووژاندنی سێکسی لە **لۆلیتا** سەرکەوتووتر بێت، بەڵکوو کەسیش نەبوو هاوشان و یەکسانی بێت، جگە لە چەند دانەیەک نەبێت کە لە دۆخێکی ناسروشتیدا بۆنێکی خەستیان لە خۆیان دابوو و لەگەڵ تەمەنیشیان نەدەگونجا.

بێگومان بەو ئیرەییکردنە زۆرەی خۆمەوە دەبا درکم بە مەترسیی نەمانی **لۆلیتا** کردبا لە چاودێرییە ڕاستەوخۆکانمدا، چونکە **لۆلیتا** هێندەی بەس بوو کە چەند هەنگاوێک لێ دوور بکەومەوە و دەمبینی کە بەلاقەکانی لە لێواری مەلەوانگەکە شڵپەشڵپی دەکرد و کوڕێکی ئەسمەر لە تەنیشتی راکشاوە، لەوانەیە جوانیی ئەو گەنجە بۆ ماوەی چەند مانگێک ئازاری خەونەکانی **لۆلیتا** بدات.

هەوڵم دا **لۆلیتا** فێری یاریی تێنس بکەم، بەڵام سەلماندم کە مامۆستایەکی خراپم، هەرچەندە لە کاتی خۆیدا یاریزانێکی لێهاتوو بووم، بۆیە بڕیارم دا لای پاڵەوانێکی کۆن دایبنێم تاکوو فێری بکات، ئەوەش بڕەپارەیەکی زۆری پێ بە هەدەر دام، تەنیا لە پێناو ئەوەی شتێکی هاوبەشی بەچێژ و خۆشمان پێکەوە هەبێت.

بەلام **لۆلیتا** چێژی لەو یارییە نەبینی، بەرلەوەی بگەین بە کالیفۆرنیا سەلماندی کە ئەو ئارەزووی ئەوە دەکات لە پشتی یاریزانەکانەوە بوەستێت و دوای تۆپەکە بکەوێت بۆیان، دواتر هەولم دا هانی بدەم لەگەڵ کچانی هاوتەمەنی خۆیدا یاری بکات، بەلام **لۆلیتا** و هاوڕێیەکانی هەڵەی وایان دەکرد، هەرگیز بەرگەییم نەدەگرت، بۆیە ناچار بووم هاوڕێیەکی دیکەی بۆ بدۆزمەوە. ئەو کاتانەی کە دەستیانم دەگرت بۆ ئەوەی فێریان بکەم چۆن تێنسەکە بگرن، بۆنی ئەو کچانە وێرانیان دەکردم، **لۆلیتاش** لەولاوە دەسکی تێنسەکەی دەدا بە زەویدا و بێزاریی دەردەبڕی و دەستی بە پرتەوبۆڵە دەکرد، ناچار وازم لێیان دەهێنا و لە دوورەوە سەیریانم دەکرد و ئاهم هەڵدەکێشا.
هەندێ جار کە **لۆلیتا** هەڵەی دەکرد و نەیدەتوانی لە تۆپەکە بدات، لێی گیڤ دەبووەوە و جنێوی پێ دەدا، بیرم دێت ڕۆژێکیان پێشنیارم کرد دوو پەرداخ شەربەتی ئەناناس بۆ **لۆلیتا** و هاوڕێیەکەی بێنم، کە گەڕامەوە و بینیم یاریگەی تێنسەکە کەسی تێدا نییە، هەستم کرد سینەم بەتاڵ بوو، لە جووڵە کەوتم، شەربەتەکانم لەسەر کورسییەک دانان و بەهەر هۆیەکەوە بێت ڕووخساری شارلۆت بە مردوویی هاتە بەرچاوم، سەیرێکی ئەملاوئەولای خۆمم کرد، **لۆلیتام** بینی بە شۆرتە سپییەکەیەوە لەگەڵ پیاوێک بەرەو سێبەری ڕێڕەوی باخچەیەک دەڕۆیشتن، بەپەلە رووم لێیان کرد، بینیم بەدوای تۆپەکەدا دەگەڕێن و ئەو پیاوەش هاوکاریی دەکرد.
ئەو ڕووداوە بێبایەخانەم بە بیر هێنایەوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنم بۆ دادگە، کە بە هەموو شێوەیەک، گشت وزەیەکی خۆمم خستبووە گەڕ تاکوو کاتێکی خۆش بۆ **لۆلیتا** دابین بکەم.

چەندم پێخۆش بوو کە دەمبینی لەگەڵ کچێکی منداڵی هاوتەمەنیدا یەتپەتێنیان دەکرد. لەو یارییەدا زۆر لێهاتوو بوو و هاورێیەکەی سەرسام دەکرد، مەبەستم ئەو پەرییە هارە ئیسپانییەیە، کە هەمیشە هەوڵی دەدا لە لۆلیتاوە فێری ئەو جووڵە لێهاتووانە ببێت. وەکوو لۆلیتا خۆش بوو و جەستەیەکی جوان و وروووژێنەری هەبوو و چاودێرییانم دەکرد تا ئەو کاتەی کۆتاییان بە یارییەکەیان دەهێنا و لۆلیتام بەرەو ژوورەکە دەبرد و دەستی سۆزی باوکایەتیم بە سەریدا دەهێنا و دواتر دەستم دەخستە پشتی و بزەیەکیشم بۆ خزمەتکارە رەشپێستەکە دەکرد و خۆشەویستەکەم بەرەو هێلانە بچووکەکەمان دەبرد، بۆ ئەوەی بەر لە خوانی ئێوارە سەرجێییەکی بچووک بکەین.

من هەمیشە هەوڵم دەدا خۆم لە خەڵک بە دوور بگرم و لۆلیتاش هەمیشە هەوڵی دەدا زۆرترین خەڵک لە خۆی کۆبکاتەوە، وەکوو پشیلەیەکی جوان بوو، کلکە جوانەکەی با دەدا، سەرنجی خەڵکیی بۆ خۆی رادەکێشا. زۆرجاریش ڕووبەڕووی مەترسیی ئاشکرابوون دەبوومەوە و ئەو خانمانەی کە جوانییەکەم سەرنجیانی رادەکێشا، پرسیاری زۆریان لە لۆلیتا دەکرد و پێشنیاری ئەوەیان دەکرد کە لەگەڵ منداڵەکانیاندا بچێت بۆ سینەما. منیش نەمدەتوانی پێشنیارەکەیان رەت بکەمەوە، چونکە لە ئیشتیهایان دەترسام و ترسی ئەوەشم هەبوو شتێک لە زاری لۆلیتاوە بخزێت و پێمان بزانن.

هیچ ڕۆژێک ترس و نیگەران نەبووم لە ناسکیی پەردەی قەدەر، هێندەی ئەو شەوەی کە بە خۆشەویستییەکی لە رادەبەدەرەوە لۆلیتام خۆش ویست، بەڵام کۆخەیەک لە ژوورەکەی تەنیشتمان

بیدەنگییەکانی داگیر کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو شەوەمان بە ئارامی بەسەر برد.

**لۆلیتا** بەیانیان هەمیشە درەنگ خەبەری دەبووەوە و زۆرجار بە تەنیا دەچوومە خوارەوە بۆ باڕی هۆتێلەکە و نانی بەیانیم دەخوارد و کوپێک قاوەی گەرمم بۆی دەبردە سەرەوە. زۆرم پێخۆشبوو کە خەبەریم دەکردەوە قاوەکەم پێی نەدەدا تاکوو ئەرکی بەیانیانی خۆی جێبەجێ نەکات، من وەکوو هاوڕێ و چاودێر و باوک و دوکتۆرێک بووم بۆ **لۆلیتا**، هەموو پێداویستییەکانیم بۆ جەستە جوان و بچووکەکەی دابین دەکرد، تەنیا بۆ یەک شتێک رقم لە سروشت دەبووەوە، ئەوەش ئەوە بوو؛ نەمدەتوانی ناوەوەی **لۆلیتا** وەرگەڕێنم بۆ ئەوەی ناو هەناوی ماچ بکەم. چەرمی دەسکی کورسییەکەم چەند خۆش بوو، کە بە رووتی لەسەری دادەنیشتم و **لۆلیتاش** بە سەعات لە باوەشم دادەنیشت. لەو ساتانەدا **لۆلیتا** بە منداڵیک دەچوو، دەموچاوی نوقمی نێو ڕۆژنامەیەک یاخود کتێبێک دەکرد، گرینگیی بە چێژوەرگرتنی من نەدەدا، کە لە باوەشم دادەنیشت وەکوو ئەوە وا بوو کە لەسەر کەرەستەیەک دانیشتووە، وەکوو دەسکی تێنس یاخود پێڵاوێک، کە بە هۆی تەمبەڵییەوە تاقەتی ئەوەی نەبوو ئەو کەرەستەیە لەژێر خۆی لابەرێت. سەیری وێنەکانی دەکرد، بڕوای بە هەموو ئەو قسانە دەکرد کە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاو دەکرانەوە، زۆر ئارەزووی جلوبەرگی بووک و چەپکەگوڵی دەستی دەکرد.

بیرم دێت هێندێک جار ڕۆژنامەکەی لەسەر گۆشەی (زانیارییەکانت تاقی بکەرەوە) دەکردەوە و دەیگوت با چەند پرسیارێک بکەم:

ئایا تاوانە سێکسییەکان کەم دەبنەوە ئەگەر کچ گوێڕایەڵی هێندێک لە راسپاردەکان بێت، وەکوو ئەوەی نێزیک ئاودەستە گشتییەکان یاری

نەکات و شیرینی لە دەست کەسانی نامۆ وەرنەگرێت و لەگەڵ کەسانی نامۆدا سواری ئۆتۆمبێل نەبێت و ئەگەر سوار بوو ژمارەی ئۆتۆمبێلەکە تۆمار بکات... هتد.

بەم شێوەیە بەردەوام دەبوو لەم پرسیارە بێبایەخانە و لە کاتی پرسیارەکانیشدا هەمیشە رووومەتی دەلکاند بە ڕوومەتمەوە.

## ٣

**لۆلیتا** چووە نێو جیهانە ڕەشە باڵدارەکەمەوە. بە شێوەیەکی سەرشێتانە خۆی هەڵقورتاندە جیهانەکەمەوە و هەموو لایەنە تاریکەکەکانیشی بە چێژێکی ناخۆشەوە دەرخست، بەڵام هەستم کرد کە خۆی بۆ دەرچوون لەم جیهانە پیسە ئامادە دەکات.

ئەو هەرگیز لەژێر دەستلێدانەکانی من نەدەلەرزی، دەستەکانی من نەبوون کە لەرزینیان ئاراستەی جەستەی دەکرد، چونکە ئەوەی لەوەوە پێم دەگەیشت ئەو پرسیارە بوو: ئەوە چ دەکەیت؟ ئەوە چیتە؟ شێتەکەی من فیلمە بێبەهاکانی پێی خۆشتر بوو لەو گەشتە ئەفسووناوییانەی کە پێشنیارم بۆی دەکرد، لەوە ناخۆشتر نییە کە مرۆڤ کچێکی هەرزەکاری بچکۆلەی خۆش بوێت.

تکام وایە خوێنەران ڕووخساری خۆیان گرژ نەکەنەوە، چونکە بە نیاز نیم بڵێم لەگەڵ **لۆلیتادا** بەختەوەر نەبووم، بەڵکوو پێویستە خوێنەر تێبگات ئەوەی پەرییەکی هاری هەرزەکاری هەبێت و نوقمی چێژەکانی ببێت، ئەوە ڕوو دەکاتە جیهانی ئەودیوی چێژ و بەختەوەرییەوە، چونکە هیچ نیعمەتێک لە دونیادا نییە خۆشتر بێت لەوەی دەستبازی لەگەڵ پەرییەکی هار و هەرزەکار و سێکسیدا

بکەیت، ئەو نیعمەتە شتێکی نائاساییە و بە هیچ چێژێک ناپێوریت، بەڵکوو سەر بە بەشێکی دیکەی جیهانی چێژە... هەرچەندە جیاوازیی تەمەن هەیە و هەرچەندە نەشیاو و توندە و هەرچەندە کارێکی بازاڕی و پیسە و لەگەڵ هەموو مەترسییەکانیشیدا، پێوەندیگرتن لەگەڵ هەرزەکارێکدا ئایینددەی نابێت، لەگەڵ ئەوەشدا من زۆر قووڵ بوومەوە لەگەڵیدا- لەو بەهەشتەی کە هەڵمبژارد. ئەو بەهەشتێکی ئاسمانییە لە ڕەنگی بڵێسەی ئاگر، بەڵام بەهەرحاڵ هەر بەهەشتە.

پێم وایە ئەو دەروونشیکارەی لێکۆڵینەوە لە حاڵەتەکەی من دەکات، دڵنیام لەوەی تووشی هەرسهێنانێکی جوانم کردووە، گومانیشم لەوە نییە ئێستا ئەو دەروونشیکارە ئەگەر بە دەستی بوایە، منی دەبرد بۆ لای **لۆلیتا** و کەنارەکان، تاکوو خەونەکەم بێنمە دی و عەقڵی ناوەوەم ئازاد بکەم لەو گرێیەی شکستی منداڵیم بۆی خوڵقاندم. لەو ڕۆژەوەی کە دوو پیاوەکە لە زەریاکەوە دەرچوون، بوونە هۆکار بۆ ئەوەی ئەنابێل بۆ من نەبێت.

دەروونشیکاری بەڕێز! ڕێم پێ بدە بیرت بخەمەوە، من زۆر بەدوای کەنارێکدا گەڕاوم، کە هاوشێوەی کەناری ڕیڤێرا بێت، بۆ ئەوەی لەگەڵ **لۆلیتادا** گۆشەیەکی تەنیای تێدا بدۆزمەوە، بەڵام من دانی پێدا دەنێم کە کاتێک گەیشتمە تراویلکەی ئاوێکی خەست، لە گەشتەکانمدا و لە ڕێی هاوڕێتیکردنی کەسانێکەوە چێژی زۆرم دەست کەوتبوو، بە شێوەیەک گەڕان بەدوای مەملەکەتی ئەفسووناویدا (ئەو مەملەکەتەی کە لە خەونەکاندا بوو، لە کەناری زەریاکان) نەبووە هاندەرێک بۆ هاندەرەکانی عەقڵی ناوەوەم، هێندەی ئەوەی بوو بە بەدواداچوونێکی بە ئاگا و ئاشکرا بۆ چێژ، ئەوە تەنیا وەکوو چەمکی چێژ بوو.

پەرییەکانی قەدەر ئەوەیان زانی و بە پێی ویستی خۆیان دۆخەکەیان ڕێکخست.

بەم شێوەیە جارێکیان ڕووبەڕوی کەشێکی باوبۆرانی سەخت بووینەوە، ڕوومان کردە ئەشکەوتێکی سروشتی، لە کەناری زەریای ئەتڵەسی، بەڵام ئەو کەشە بە کەشی ڕێڤیرای ئارام نەدەچوو. بۆ دواجار لەسەر کەناری کالیفۆرنیا ئەشکەوتێکمان دۆزیەوە، بە شێوەیەک لە شێوەکان شوێنێکی چەپ بوو، هێندە تەمەکەی خەست بوو، وەکوو پەرتووکێکی تەڕ بوو لەسەر جیهان، نێو ئەشکەوتەکەش پڕ بوو لە وردەچەو و زۆریش خوارخێچ بوو، **لۆلیتاش** زۆر پەشۆکاو بوو، لەو شوێنەدا هەستم کرد لە هەموو تەمەنمدا هێندە بێزەوق نەبوومە.

لەوانەیە خوێنەرە ژیرەکانم تووشی شۆک بن، ئەگەر بڵێم ئەو گرێ دەروونییەم لە دوای تێپەڕبوونی کات کرایەوە، تەنانەت ئەگەر شوێنێکیشم بدۆزیبایەوە هاوشێوەی ئەو شوێنەی کە بە ئەنابێل گەیشتم، ئازاد بووم لەو گرێ کوێرەیەی زەمانێکی دوورودرێژ پێوەی دەمناڵاند، لەو کاتەدا گرێیەکەم کرایەوە کە **لۆلیتام** بە رووتی بینی، لەلای حەوزی مەلەوانەگەکەوە، لەو ڕۆژەی کە ژوورەکەم لە دایکی بە کرێ گرت، ئەوکاتە **لۆلیتا** ڕۆڵی ئەنابێلی خۆشەویستی یەکەممی دەبینی.

دەرئەنجام من و **لۆلیتا** دوور لە کەناری زەریاکە خۆمان بینییەوە، کە هەمیشە لە کەشە خراپەکاندا بێدەنگ و ناخۆشە و لە کەشە خۆشەکانیشدا پڕ خەڵکە.

پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، دەشتی ئەمەریکا هەرچەندە جوانییەکی ڕادەبەدەری هەیە، شکستی بە هیواکانم هێنا، بەڵام عاشقان و

ئارەزووەمەندانی سەرەڕۆییەکانی خۆشەویستیی بەر هەوا، بە ئاسانی ناتوانن نوقم بین و دڵنیایی و ئاسایشی تیدا بدۆزنەوە، بۆ ئەوەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کۆنترین و گەورەترین تاوانی ڕەوشتی تیدا ئەنجام بدەن، زۆرجار دەغلە ژەهراوییەکان قاچی کچە خۆشەویستەکانیان دەسوتاند و زۆرجاریش گیانلەبەری سەیر دەداتە هەر شوێنێکی ڕووتەوە، ئەژنۆی عاشقەکانیش خوێناوی دەبوو.

پی دەچێت هێندێک زیادەڕەوی بکەم، بەڵام ئەمە بەشێک بوو لەو شتانەی کە بەسەر **لۆلیتا**دا هات، لە ڕۆژانێکدا کە کەشوهەوا پاک بوو، شوێنێکی شاخاویمان دۆزییەوە و وامان زانی شوێنی ئارامە، بەو پێیەی سەد مەتر بەرزترە لەو شوێنەی کە ئۆتۆمبێلەکەمان تیدا ڕاگرت. هەتا سەرکەوتین هەناسەمان لی برا و لەژێر سێبەری دارێکدا وەستاین، پێمان وابوو لە خەڵک و لە هەتاو پەردەپۆشمان دەکات. **لۆلیتا** بە گوڵ و گەڵای دارەکان ڕاخەرێکی دروست کرد و خۆی ڕووت کردەوە. وەکوو پەیکەری ڤینۆس بوو، کە لەو نێوەندەدا پیاسەی دەکرد. پێدەچوو ناوچەیەکی ئارام بێت، بە هۆی ئەوەی ئارەزوویەکی زۆرم هەبوو لە دەرەوە و لەبەر هەوا سێکس بکەین، لەوەدا بوو بە ڕوونی ئاشکرا ببین.
چیرۆکەکەش بەو شێوەیە بوو، پرۆسەکەمان بە تەواوەتی کۆتایی هاتبوو و **لۆلیتا** خۆی فڕێ دابووە نێوان باسکەکانمەوە و ڕەهێڵەی گریان گرتبووی و دەنووزایەوە، وەکوو هەمیشە جاروبار لە ماوەی ئەو ساڵەدا گریان دەیگرت، زۆر جار ئەو گریانە کەشەکەی لی تێک دەدایْن.

لە کاتی تینوویەتییەکی کوێرانەدا بەڵێنێکی بێبایەخم دا، کاتێک هەناسەی بەتینی هەڵدەمژی، ئەو چونجورکی لەو دەستەم دەگرت کە لەسەر لەشی بوو، منیش بە دڵخۆشییەوە پێدەکەنیم و وامدەزانی ئەمەش شەپۆلێکی دیکەی گاڵتەکانی **لۆلیتایە**، هەروەکوو خاڵێکی رەش لە نێوچەوانی بەختەوەریی مندایە. کاتێک راکشابووین، هەستم بە سوپرایزێک کرد هاوشێوەی ئەو سوپرایزانەی کە دڵی خەمبارمی لە جێی خۆی لادەبرد، نیگاکانم چاوێکی رەشی بینی بە جێگری تەماشای چاوەکانی دەکردم، بینیم دوو کچی بچووکی جوان بوون، دیار بوو کە دوانە بوون، هەردووکیان گوڵیان بەدەستەوە بوو و سەیریان دەکردین، بەپەلە خۆمان داپۆشی و لە نێوان دەغڵەکانیشدا هەستم بە جووڵەیەک کرد، دواتر بۆم دەرکەوت کە دایکی دوو کچەکەیە و خەریکە گوڵیان بۆ لێ دەکاتەوە، دایکەکە لە پشتی کچەکانییەوە نیگایەکی لێمان کرد.

دوای چەندین ئەزموونی جیاواز کە ویژدانی قورس کردبووم، بە خۆمم زانی کە پیاوێکی بوێرم، بەڵام پێشتر بەوەم نەدەزانی.

لەو شوێنەدا بە شێوەیەکی بێباکانە و بە لێهاتوویی چرپاندمە گوێی **لۆلیتا** و پێم گوت هەستە سەر پێ و لە تەنیشتمەوە بکەوە رێ. زۆر بە ویقارەوە **لۆلیتا** لە تەنیشتمەوە رێی کرد و ئەو شوێنە ئابڕووبەرەمان بەجێ هێشت و لە بەرزاییەکە چووینە خوارەوە. بینیمان ئۆتۆمبێلی ئەو خێزانە لە تەنیشت ئۆتۆمبێلەکەی ئێمە راوەستاوە و پیاوێکی ریشدرێژ لە تەنیشتی وەستاوە، شێوەی بە کەسێکی زانا دەچوو. سەرقاڵی وێنەگرتنی ئەو تابلۆیە بوو کە چیایەکی ١٠ هەزار پێی لە خۆ گرتبوو، بۆمان دەرکەوت باوکی ئەو خێزانەیە کە لانەکەی لێ تێکداین، بە هەناسەی پچڕپچڕەوە

ئۆتۆمبێلەکەم پێکرد و **لۆلیتاش** هێشتا جلەکانی لەبەر دەکرد، بەزمانێک جنێوێکی پێ دەدام کە هەرگیز خەونم بەوە نەدیبوو کچانی بچووک ئەو جۆرە جنێوە بزانن، هەرگیز پێشبینیم نەدەکرد کچان بتوانن ئەو زمانە زبرە بەکار بهێنن.

جگە لەو ڕووداوە ڕووداوی دیکەی زۆر ناخۆشمان بەسەر هات، وەکوو ئەوەی لە سینەماکەدا ڕووی دا.

**لۆلیتا** سۆزێکی ڕاستەقینەی بۆ سینەما نەبوو، هەمیشە بەبێ جیاوازی سەیری فیلمەکانمان دەکرد، بیرم دێت لەماوەی ئەو ساڵەدا نێزیکەی ١٥٠ بۆ ٢٠٠ فیلممان بینی، ئەو فیلمانەی کە **لۆلیتا** ئارەزوویانی دەکرد سێ جۆر بوون، فیلمی میوزیکاڵ، دواتر فیلمی تاوانبارەکان و دواتریش فیلمە کابۆیەکان.

جۆری یەکەمیان تایبەت بوو بە ژیانی گۆرانیبێژان و سەماکەرە ڕاستەقینەکان، کە لە ژیانی ڕاستەقینەیاندا لە کەشێکی خۆش و خەمناک و کارەساتباردا دەبوون و مردنیان دەست نەدەکەوت، هەمیشە کۆتاییی فیلمەکانیش لەسەر ڕووخساری دایکی هونەرمەندەکان دەبوو، کە چەپڵەی بۆ سەرکەوتنی کچەکەی لێ دەدا، لە کاتێکدا لە سەرەتادا ڕێگر بووە لەوەی ببێتە سەماکەر لەسەر شانۆیەکی گەورەی وەکوو شانۆی برادوەی.

بەڵام بابەتی فیلمە تاوانکارییەکان، هەمیشە جیهانێکی پیشان دەدا کە ڕۆژنامەنووسەکان پاڵەوان بوون و لەژێر دەستی تاوانبارەکاندا تووشی ئەشکەنجە دەبوون، پۆلیسەکانیش بەبێ ترس ڕاوی تاوانبارەکانیان دەنا.

بەڵام فیلمە کابۆیەکان هەمیشە لە چوارچێوەی دیمەنێکی ئەفسووناویدا بوون، زۆر سادە و کلاسیک بوون، سوارچاکەکان

چاوشین و ڕووخساردڕنده بوون. مامۆستایەکیان تێدا بوو بە گالیسکەی پۆستەکان دەگەیشتە ئەو شارە و ئیتر دەنگی ئەسپ و راودوونانی سەخت و دەرهێنانی دەمانچە بە خێرایی برووسکە و مشتەکۆڵە و دەرخستنی دڕندەیی ناخەکان. شەڕی نێو بار و ڕێیەکان، هەمیشە پاڵەوانی فیلمەکە بۆکسێکی وای لێ دەدرا ئەگەر لە هێرقل بدرایە، ڕەوانەی نەخۆشخانە دەکرا، کەچی هەڵدەستایەوە و دەمانبینی هیچی لێنەهاتووە، تەنانەت جلەکەشی مێش میوانی نەبوو.

هەر لە بارەی سینەماوە، بیرم دێت جارێکیان لە سینەمایەکی قەرەباڵغ بووین، پڕ لە منداڵ و هەناسەی گەرم و بۆنی گەنمەشامی برژاو بوو. شاشەکە نمایشی دیمەنێکی دەکرد کە گۆرانیبێژێک لەژێر تریفەی مانگدا گیتارێکی بە دەستەوەیە و قاچێکی خستووەتە سەر دارێک و گۆرانییەکی سۆزداری دەگوت، دەستم لەسەر شانی **لۆلیتا** دانا و ئەویش رووومەتی لێم نێزیک کردەوە، دوو کەسی خراپەکار لە پشتمانەوە بوون، هێندێک قسەی نامۆیان کرد، لێیان تێنەگەیشتم، بۆیە دەستم کێشایەوە و لە کورسییەکەی خۆمدا بە ڕێکی دانیشتم، بێگومان لەو کاتانەدا نەمدەزانی لە شاشەکە چی نمایش دەکرێ.

هەژانێکی دیکە کە ناخی لەتوکوت کردم، بیرم دێت بە شوێنێکدا دەڕۆیشتین، شەو بوو، بەرلەوەی بگەین بە **لۆلیتام** ڕاگەیاند کە خوێندنگەی بەیانیانی لێیە و لەوێ دەبێت بخوێنێت، خوێندنگەکەش بە ناوی (بێردسلی) ناوەندی بوو، بەڵام خوێندن لەوێ تێکەڵاو نەبوو، هەروەها سیستمە نوێیە بێبایەخەکانیشی لێ نەبوو. کاتێک ئەوەم بە **لۆلیتا** گوت، هێرشێکی توند و ناخۆشی کردە سەرم و جنێوی ناشیرین و بازاڕی پێ دام و سووکایەتی پێکردم، **لۆلیتا** دەستی کرد بە راوەشاندنی پەنجەی هەڕەشە و هاواری کرد بە رووومدا:

- من گەمژەم ئەگەر راکەی تۆ بە جدی وەربگرم، هەی پیس! تو ناتوانی من کۆنترۆڵ بکەی، من رقم لێتە...

بەڵام من بەردەوام بووم لەوەی لە شەقامە نووستووەکاندا بە خێرایی ئۆتۆمبێلەکەم لێ بخورم، کاتێک پۆلیس رایگرتین، رووناکیی لایتەکانیان گرتە نێو ئۆتۆمبێلەکە و بە بزەیەکی دۆستانەوە، رووخسارە توورە و هێرشکەرەکەی **لۆلیتا** وەرگەڕایە سەر پێکەنینێکی ئەفسووناوی و بە ئاور و نیگایەکی جوانەوە وەڵامیانی دایەوە، بە شێوەیەک پێشووتر هەرگیز لەگەڵ دەستبازی و پیاوەتیی مندا ئەوەی نەکردبوو، سەیر لەوەدا بوو **لۆلیتا** لە من زیاتر لە یاسا دەترسا.

بەرانبەر بەو نیگا جوان و نەرمونیانەی **لۆلیتا**، پۆلیسەکان لێمان خۆش بوون لەوەی کە بە خێرایی ئۆتۆمبێلەکەمان لێدەخوڕی و بەردەوام بووین لە ڕێکردن، تەماشایەکیم کرد، بینیم چاوەکانی داخستووە و خۆی بە ماندوو و بێهێز و چوارپەلشکاو پیشان دەدات.

پێم وایە پێویستە دانپێدانانێکی نامۆ بخەمە ڕوو، لەوانەشە پێکەنینتان پێم بێت، لە ڕاستیدا نەمدەزانی یاسا بۆ پێوەندییەکەی نێوان من و **لۆلیتا** چ دەڵێت، تاکوو ئەمڕۆش هێشتا نازانم، هەرچەندە هێندێک بەدواداچوونم بۆ ئەو بابەتە کرد، بۆ نموونە ویلایەتی (ئالاباما) یاسا ڕێ نادات شوێنی نیشتەجێبوونی ئەو کەسە بگۆڕێت کە باوکی راسپێدراوی کچی هاوسەرە مردووەکەیەتی، بەبێ ئەوەی مۆڵەت لە دادگە وەربگرێت. قانوونی ویلایەتی (مینیسوتا) دەڵێت: دەبێت یاسا هیچ پێوەندییەکی بە پارچەڵەوە نەبێت و دەکەوێتە ئەستۆی کەسێکی نێزیکی خۆی، بۆیە من کڵاوەکەم بۆ ئەو یاسایە دادەکەنم، چونکە بە

پێی ئەو قانوونە بێت، من هیچ زیانێکم نەگەیاندووە لەوەی لەگەڵ لۆلیتادام.

ئەو کتێبە یاساییانە کە لەسەر هاوسەرگیری و تەلاق و گرتنەئەستۆی مندالان لە چەند کتێبخانەیەکی گشتیدا خوێندمنەوە، هیچ سوودێکی نەبوو، جگە لەوەی دەوڵەت باڵادەستە لەوەی منداڵی پێنەگەیشتوو دەگرێتە ئەستۆ.

ئەو کتێبانە هەرگیز باسیان لەو حاڵەتە نەکردووە کە دایکێک بمرێت و هاوسەرەکەی باوکی کچەکەی نەبێت، چ بکرێت لەگەڵ ئەو کچەدا.

هاوڕێیەکم کە لە بواری خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتیدا کار دەکات- لە شیکاگۆ، بۆی باس کردم، پێویستە هەموو پارچەلەیەک ڕاسپێردراوێکی هەبێت و دادگە هیچ دەست وەرنەداتە کاری ئەو پارچەڵەیە، تا ئەوکاتەی دۆخی لە مەترسیدا بێت.

لێکۆڵینەوەکانم کۆتایی پێ هێنا بەوەی ئەگەر سەرپەرشتیار ئارەزوویەکی زۆری هەبێت بۆ بەخێوکردنی ئەو منداڵە، دەتوانێت لە ماڵدا بەخێوی بکات، بەڵام لەوانەیە چەند مانگێکی پێ بچێت، تاکوو دادگە وادەیەک بۆ دانیشتنەکە دەستنیشان دەکات، لە ماوەی ئەو چاوەڕێکردنەشدا، لە ڕووی تەکنیکییەوە منداڵەکە سەربەخۆ دەمێنێتەوە. ئەگەر دانیشتنەکەش ئەنجام درا، ئەوکات پارێزەری سەرپەرشت بە دڵنیاییەوە وەڵام دەداتەوە و دوای چەند بزەیەک و سەرراوەشانێک دادگە بڕیاری قبووڵکردنی داواکارییەکە دەدات.

ئەم کارەش ئاسان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بوێریی ئەوەم نەبوو ئەو کارە بکەم، وەکوو مشکی تۆقیوم لێهاتبوو، لە حاڵەتێکدا ئەگەر منداڵە پێنەگەیشتووەکە میراتگەری هەبێت ڕێوشوێنەکانی دادگە زیاتر درێژە دەکێشێت، بەم شێوەیە پێم باش بوو هیچ داواکارییەک پێشکەش

نەکەم و بە درێژایی کات بیری ئەوەم دەکردەوە، کەسێکی خۆهەڵقورتێنەرم بۆ دەرنەچێت و لە ڕووی دادگەوە دەست وەربداتە کاروبارەکانمەوە، یاخود کۆمەڵەیەکی مرۆی خۆی هەڵقورتێنێتە نێو مەسەلەکەوە.

بەڵام (فارلۆ) کە پارێزەرە و دراوسێمان بوو، ئەو تەنیا بەڵێنی پێدام کە چارەسەری میراتگەرییەکەی شارلۆتم بۆ بکات. بە هۆی نەخۆشیی شێرپەنجەی هاوسەرەکەیەوە هیچی پێنەکرا. لەلایەکی تریشەوە قەناعەتێکی وام لای فارلۆ دروست کردبوو کە **لۆلیتا** کچی ناشەرعیی منە و هێندە خۆی بە یاساکانەوە سەرقاڵ نەکات.

پێویستە خوێنەر ئەوەش بزانێت کە من لەکارکردندا کەسێکی خراپ بوم، بۆیە هەمیشە داوای ڕاسپاردەی قانونیم دەکرد.

ئەوەی ڕێگریی لێم کرد لەوەی ئەو ڕێوشوێنە یاساییانە بگرمە بەر، ئەوە بوو کە هەستم دەکرد ئەگەر دەست وەربدەمە پرۆژەکانی قەدەرەوە و فەلسەفە بە بەخشینەکانییەوە لێ بدەم لەوەی کەسێکی وەکوو **لۆلیتای** پێ بەخشیوم، ئەوا قەدەر دیارییەکەیم لێ وەردەگرێتەوە.

بڕیارم دا **لۆلیتا** لە خوێندنگەی ناوەندیی (بێردسلی) دابنێم و سەرقاڵی بەدواداچوونی هێندێک سەرچاوەی یاساییش ببم، پێم وابوو ئەو خوێندنگەیە هەر زانستێک بە **لۆلیتا** ببەخشێت باشتر دەبێت لەو دەستبەتاڵییە زیانبەخشەی **لۆلیتای** تێدایە، دەمتوانی بۆ زۆر شت قەناعەت بە **لۆلیتا** بێنم، بەڵام هەمیشە شکستم دەهێنا لەوەی وا لە **لۆلیتا** بکەم کتێبێک بخوێنێتەوە، هەرچەندە بیانووم دەهێنایەوە و تووڕەش دەبووم، هەوڵی ئەوەشم دەدا کتێبێکی جیاواز لە کتێبی تاوان و گۆڤارە سینەماییەکان بخوێنێتەوە، بەڵام ئەو خوێندنەوەی

ڕۆمانی ڕەت دەکردەوە بە بیانووی ئەوەی نایەویت پشووەکەی بە خوێندنەوەی قورسەوە تێک بدات.
لە ڕاستیدا من هەڵەیەکی گەورەم کرد، کە بڕیارم دا ڕوو بکەینە ڕۆژئاوا و لە خوێندنگەی بێردسلی دایبنێم، دەبوایە ڕوومان بکردایە سنوور، بەرەو مەکسیک، ئەوکات دەمانتوانی لە بەهەشتدا بژین و لە شوێنێکی دابراودا بین، ئەو کاتە بە دڵنیاییەوە هاوسەرگیریم لەگەڵ ئازاربەخشە بچووکەکەمدا دەکرد، پێویستە ددان بەوەدا بنێم کە پشتم بە شەهوەتەکانم دەبەست، وەکوو ئەوەی بۆ ئەوە ئەفرێندرابم کە لە ڕۆژێکدا لە شێتییەکەوە بۆ شێتیەکی تر بگوازرێمەوە، ئەو شێتییەی کە دەهاتە مێشکمەوە و دەبوایە لە ساڵی ١٩٥٠دا من ئەو هەرزەکارە مێشکقورسە لەناو ببەم و تایپی پەرییەتیی تیدا بتوێنمەوە. بیرۆکەیەکی دیکەی شێتانەم بۆ دەهات کە دووگیانی بکەم و دواتر لە ساڵی ١٩٦٠دا لۆلیتایەکی دیکەم بۆ دروست دەبێت کە لە تەمەنی هەشت بۆ نۆساڵیدایە، ئەوکات دەمتوانی ڕۆڵی باپیرە ببینم لەگەڵیدا، کە ئەویش هێشتا دڵی بە تەواوەتی سەوز نەبووە.
بەڵێ ئەو بیرۆکەیەم شێتی دەکردم، ئەو ئەگەرەم لە زیندەخەونەکانمدا بە ڕوونی دەبینی، پێشبینییەکی ناعاقڵانەم تیشکی دەخستە سەر هزری ئاییندەم. گومانم لەوە نەبوو، لە گەشتە گەرموگوڕەکەماندا باوکایەتیی من بۆ ئەو جێی گاڵتەجاڕی بێت.
هەوڵی زۆرم دا وەکوو باوکێک سەرکەوتوو بم، چەندین کتێبیشم خوێندەوە وەکوو (کچەکەی خۆت بناسە) کە لە کتێبخانەیەکدا کڕیم، بۆ لۆلیتاش بە بۆنەی سیانزەیەمین یادی لەدایکبوونییەوە، کتێبی (پەریی زەریا)م کڕی.

تەنانەت لە باشترین ساتەکانی پێوەندییەکەماندا، کاتێک باران دەبوو، دادەنیشتین کتێبمان دەخوێندەوە، هەمیشە **لۆلیتا** هەستی بە بێزاری دەکرد، بە چاوێکی وەڕزەوە دەیڕوانییە پەنجەرەکە و سەعاتەکەی دەستی، یاخود دەچوو بۆ چێشتخانەکەی هۆتێلەکە بۆ نانخواردن، یاخود یاریی کۆنکانی دەکرد، ئەگەر کاتیش گونجاو بوایە دەچوو بۆ بازاڕ و بە تەنیا جێی دەهێشتم.

لە هەموو ئەو بۆنانەدا خۆمم وەکوو باوکی **لۆلیتا** دەبینی، وەکوو باوکێکی توند لەسەر کچەکەی، **لۆلیتاش** وەکوو کچێکی یاخی بوو لە باوکی، هەمیشە پرسیاری ئەوەم دەکرد، ئایا تۆ بڵێی هەستکردن بە تاوان وای لێ کردبین کە سەرکەوتن بەدەست نەهێنین، لەوەی وەکوو باوک و کچ بین، پرسیاری ئەوەم بۆ دەهات، ئایا تۆ بڵێی ئەگەر لە ماڵێکدا جێگر ببین و دۆخی **لۆلیتا** ڕێک بخرێت لەگەڵ خوێندنگەیەکدا باشتر دەبین؟!

دیاریکردنی شاری بێردسلی تەنیا ئەو ئامانجەی نەبوو کە شارێکە خوێندنگەی تایبەتیی کچانی تێدا بوو، بەڵکوو ئامانجی ئەوەشم هەبوو کە کولێژێکی تایبەتیی کچانیشی تێدا بوو کە مامۆستایەکی زمانی فەڕەنسی وانەی تێدا دەگوتەوە و پێشتریش دەمناسی، خوازیاریش بووم لە ڕێی ئەو ناسیارییەوە کەسایەتییەک بۆ خۆم دروست بکەم کە پەردەپۆشم بکات و لە ڕێی بەکارهێنانی نووسینە فەڕەنسییەکانیشمەوە چەند وانەیەک لە کۆلێژەکەدا بڵێمەوە.

بە کرداری پێم خۆش نەبوو ئەو کارە بکەم، خوێنەریش لەوە باش تێگەیشت کە حەزم بەو کچانە نییە کە تەمەنی هەرزەکارییان تێپەڕاندووە، چونکە لە دیدی مندا وەکوو مەڕ بوون، وەکوو تابووتێک زیندوو بوون کە هەرزەکارەکانی تێدا ڕاکشاوە، ئەو هەرزەکارانەی

دەسووتێم بۆیان، بەڵام ئارەزووی کەسایەتییەکم دەکرد بمپۆشێت و بمپارێزێت.

لە کۆتاییشدا لایەنی دارایی هانی دەدام بۆ ئەوەی بەشی خۆم بە دەست بێنم، چونکە هەمیشە هەولم دەدا هۆتێلە هەرزانبەهاکان بگرم، هێندێک جاریش ناچار دەبووین لە هۆتێلی گرانبەها بمێنینەوە، ئەوەش زیانی بە باری داراییم دەگەیاند، لەلایەکی تریشەوە دەبوایە جلوبەرگ بۆ لۆلیتا بکڕم و جاروباریش ئۆتۆمبێلەکەم چاک بکەمەوە.

دەسەلاتداری یەکێک لە گرتووخانەکان نەخشەیەکی پێدابووم لە کاتی گەشتەکانماندا هەمیشە پشتم پێ دەبەست. شیکارییەکم لەسەر نەخشەکە کرد، بەوەی ئەگەر لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٤٧ەوە تاکوو مانگی ئابی ١٩٤٨ بەردەوام بین لە گەشتکردن، ئەوە بۆ خۆراک و شوێنی نیشتەجێبوون پێویستیمان بە ٥٥٠٠ دۆلار دەبێت و بۆ بەنزین و پێداویستیی ئۆتۆمبێل پێویستمان بە ١٢٣٤ دۆلار دەبێت، هەروەک شیکارییەکەم ئەوەشی بۆ دەرخستم کە ماوەی ١٥٠ ڕۆژ ئێمە لە گەشتکردندا دەبین و ٢٠٠ ڕۆژیشمان بۆ پشوودان دەبێت، بەلام تێچووەکەی زیاتر لە ١٠ هەزار دۆلار بوو، چونکە زۆر شتی ترم بیر چووبوو بیژمێرم.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، هەرچەندە بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشتباین، لەبری ئەوەی شەهوەتم کپ ببێت، زیاتر گڕی دەگرت. لۆلیتاش تا دەهات جوانتر دەبووەوە، هەرچەندە باڵای بەرزتر بووبوو و کێشیشی چوار کیلۆ زیادی کردبوو، بەڵام ئەو هەوڵی دەدا دیمەنی منداڵانەی خۆی بپارێزێت.

سەردانی هەموو شوێنەکانمان کرد، بەڵام ڕاستییەکەی هیچمان نەبینی، چونکە من ئەمڕۆ بۆم دەردەکەوێت کە لەو گەشتە

دوورودرێژەماندا تەنیا هێڵێکی سێکسی هەبوو، دیمەنی سروشت و گوندە جوانەکان تەنیا هێڵی سەر نەخشەکەمان بوون ڕێنیشاندەرمان بوو بۆ دۆزینەوەی شوێنی گەشتیاری، جگە لەوەش ئەو شەوانەی کە خەوم لێدەکەوت **لۆلیتا** دەستی بە نووزەنووز دەکرد.

## ٤

کاتێک گەیشتینە کۆتاییی شەقامی ١٤ی تایر، کەنجێک پێشوازیی لێ کردین و کلیل و یادداشتێکی پێداین کە مامۆستا فەرەنسییەکە بۆی ئامادە کردبووین، کلیلەکە بۆ خانوویەک بوو- بە کری بۆی گرتبووین و یادداشتەکەش لە مامۆستا فەرەنسییەکەی کۆلێژی بێردسلییەوە بوو.

بەبێ ئەوەی گرینگیی بدات بە شوێنی نیشتەجێبوونەکەمان، **لۆلیتا** رادیۆکەی کردەوە و لەسەر قەنەفەکە راکشا و گۆڤارێکی کۆنی گرتە دەستەوە و دەستی بە خوێندنەوە کرد.

ئەوەی ڕاستی بێت گرینگ نەبوو لام لە کوێ نیشتەجێ دەبین، بەو پێیەی خۆشەویستەکەمم تێدا دیل دەکرد، بەڵام لە ڕێی گۆڕینەوەی ئەو نامانەی کە لەگەڵ گاستۆنی هاوڕێمەوە دەمانگۆڕییەوە، بۆ بەکرێگرتنی ئاپارتمانێک پێم وابوو بنمیچێکی قرمیدیی سوور و بریقەدارمان بۆ بە کرێ دەگرێت، بەڵام ئەو خانووەی بە کرێی گرتبوو هەمان شێوەی خانووە کۆنەکەی شارلۆت هێز بوو، هەمان ئەو شێوە دڵتەنگرە بوو، ڕەنگەکان تاریک، تەنانەت کەلوپەلی ماڵەکە و دانانیشی بە ماڵەکەی دایکی **لۆلیتا** دەچوو، هەرچەندە ئەم ماڵە کەرەستەکانی نوێتر و جوانتر بوون.

بۆم دەرکەوت ژووری کتێبخانەکەم لەو ماڵەدا درێژ بوو، رەفی درێژ پڕ لە کتێبی کیمیا، چونکە ئەو کرێچییەی پێش ئێمە بە کرێی گرتبوو مامۆستای فیزیا و کیمیا بوو لە کۆلێژەکەدا، بە هۆی ئەوەی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ سەفەری کردبوو ئەو ماڵەیان بە کرێ پێ دام.
خوازیار بووم خوێندنگەی کچانی شاری بێردسلی رۆشنبیرییەک بۆ خوێنکارە کچەکان دابین بکات کە تێیدا جەستەی کچەکان بە شێوەیەکی سروشتی پێبگەن، بە هۆی ئەو یارییگە فراوان و خواردنە پڕ فیتامینانەوە کە بە خوێندکارەکانی دەدەن.
بەڵام گاستۆن کە کەمجار قسەی ڕاست دەردەچوو، هۆشداریی پێ دام لەوەی کۆلێژەکە خۆیان بۆ خوێندکارەکانیان کۆلێژ دیاری دەکەن.
بۆیە منیش گوتم:
- گرینگ نییە بە باشی فێر ببی **لۆلیتا**، بەڵام گرینگ ئەوەیە گوێڕایەڵ بی.
هەرچەندە ئەمجارەیان قسەکەی گاستۆن ڕاست دەرچوو، بەڵام پێم وانەبوو ئەو کۆلێژە بتوانێت هەتا کۆتایی ئامانجەکەی بپێکێت.
بیرم دێت بەڕێوەبەری کۆلێژەکە ناوی (برات) خان بوو، لە یەکەم چرکەساتدا خۆشەویستیی خۆی بۆ چاوە شینەکانی **لۆلیتا** دەربڕی، (گاستۆن)یشی بە پیاوە ژیرە فەرەنسییەکە وەسف کرد، هێندەی پێ نەچوو **لۆلیتام** رادەستی مامۆستا (کۆرمۆران) کرد، برۆیەکی بەرز کردەوە، وەکوو ئەوەی بیەوێت شتێکم فێر بکات و دەستیکرد بە گوتنەوەی وانەیەک بۆم و گوتی:
- ئێمە لێرە گرینگی نادەین بەوەی خوێندکارەکانمان ئاڵوودەی خوێندنەوە بکەین، گرینگیش نییە لامان ناوی پایتەختی وڵاتەکان بزانن، چونکە کەس نییە هەمووی بزانێت، ئەوەشمان لا گرینگ نییە

مێژووی شەڕە لەبیرکراوەکان بزانن، بەڵکوو ئێمە گرینگی بەوە دەدەین کە ژیانێکی کۆمەڵایەتی بۆ کچان ئامادە بکەین و کار بۆ فێکردنی چوار خاڵیان دەکەین. ئەوەش بریتییە لە بوارەکانی (نواندنی شانۆ، سەما، دیالۆگ و وادەدانان.) ئێمە لە بەرنامەکانماندا ڕووبەڕووی ڕاستیەکانی ژیان دەبینەوە، بۆ نموونە کچەکەت بەم نێزیکانە دەچێتە قۆناغێکەوە کە گرینگی بە وادە دەدات و گرینگی بە جلوبەرگ دەدات لە ژوانەکاندا... هتد، بە هەمان شێوە بۆ پێوەندیی بازرگانی و سەرکەوتنی بازرگانی، لەگەڵ کارسازێکی وەکوو تۆ (بە بزەیەکەوە) بەختەوەریی خوێندکار لای من گرنگترین شتە.... **لۆلیتای** کچت لە ژیانێکی کۆمەڵایەتیی ڕێکخراودا دەژیت، بمانەوێت یان نەمانەوێت دەچێتە لەفەخانە و کۆفی شۆپ و ساردەمەنی و سینەما و دیسکۆ و سەیران و ئاهەنگەکانەوە. بێگومان ئێمەش لە کۆلێژی بێردسلی بڕیار لەسەر ئەو جۆرە چالاکییانە نادەین بەڵکوو کار بۆ ئاراستەکردنی ڕوویەکی چالاکییان دەکەین و کار بۆ بوونیاتنانیان دەکەین، بەڵام ئێمە کار بۆ ئەوەش ناکەین کە پشت لە کەوانەی خۆر بکەین و هەوڵیش نادەین چاو لە ڕاستیەکان دابخەین، بە کورتی ئێمە هونەری فێرکاری جێبەجێ دەکەین، بەر لە هەموو شتێکیش گرینگی بە پێوەندیی کۆمەڵایەتی دەدەین... بەم شێوەیە و لەگەڵ هەموو ڕێزێکمان بۆ شەکسپیر و کەسەکانی دیکە، دەمانەوێت ئازادیی ڕەها بۆ کچەکانمان دابین بکەین، لەبری ئەوەی نوقمی نێو کتێبە زەرد و کۆنەکانیان بکەین، لەوانەشە هێشتا هەنگاوەکانمان کاڵ بێت، بەڵام هاوشێوەی دوکتۆری گرێکان هەست بە ڕێیەکە دەکەین... بەڕێزم! ئێمە بیر لە پێوەری ڕێکخستن و ئەرکەکانی ئەندامێتیی سیستم دەکەین و دەستبەرداری ئەو بابەتە زیادانە بووینە، کە هەمیشە بە

هۆی خوێندنیانەوە مێشکی کچەکانمان جێی فێربوونی وانەکانی ژیانی تێدا نابێتەوە، فێری ئەو رایانەیان دەکەین کە هاوکاریی ژیانی هاوسەرێتیان دەکات... مستەر هەمبەرت دەکرێت بابەتەکە بەم شێوەیە بخەینە ڕوو: کارێکی گرینگە کە کچ رۆشنبیریی باڵای هەبێت، بەڵام گرینگییەکەی لەوەشدایە کە خاوەنماڵ بزانێت لە چ شوێنێکی متبەخەکەدا سەلاجەکەی دادەنێت. تۆ دەڵێی گرینگترین شت بۆ کچ ئەوەیە کە رۆشنبیرییەکی تەندروستی هەبێت، بەڵام پێم ناڵێی رۆشنبیری واتا چییە؟ رۆشنبیری لە جاراندا، مانای وزەیەکی زۆر بەهێز بوو بۆ خودەرخستن لەوەی کە بازنەیەکی فراوانی زانیاریی هەیە و دەتوانێت لە خوێندنگەکان زیاتر فێری شت ببێت. بەڵام دوکتۆر هەمبەرت دەتوانی درک بەوە بکەیت، کە مێژووی ڕووداوەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، بۆ کچێکی بچووکی هەرزەکار هیچ گرینگیەکی نییە، لە چاو ژوانێکیدا لەگەڵ هاوڕێیەکەی لە ڕۆژەکانی پشوودا؟... ئێمە ئەمڕۆ لەنێو جیهانێکی پڕ لە بیرکردنەوەدا ناژین، بەڵکوو لەنێو کۆمەڵێک کەرستە و وشەی بێئەزموونداد دەژین، ئەمەش لە خۆیدا بێمەعنایە، بۆ خاتری ئاسمان! دەبێت کۆشکەکانی یۆنان و وڵاتانی ڕۆژهەڵات و ژنە شۆخوشەنگەکانی چ گرینگییەکیان بۆ **لۆلیتا** هەمبەرت هەبێت؟

ئەمە ناوەرۆکی ئەو وانەیە بوو کە بەڕێوەبەرەکە لە بارەی بەرنامەی خوێندنگەکەیەوە خستییە ڕوو، ئەو بەرنامەیەش تۆقێنەر دەهاتە پێش چاوی من، هەرچەندیشم دەکرد نەمدەتوانی لە رەوشەکە دڵنیا ببمەوە، تا ئەو کاتەی کە دوو ژن باسی ئەوەیان بۆ کردم کچەکان لەو خوێندنگەیە کتێبی زۆر بەسوود دەخوێنن و چیرۆکی (گەیاندنی کچان بە ژیان بە شێوەی پراکتیکی) تەنیا پڕوپاگەندەیە بۆ ئەوەی پارەیەکی

زۆر وەربگرن، چونکە ئەو خوێندنگەیە کۆنە و دەیانەوێت دیمەنێکی نوێخوازی پێ ببەخشن.

هۆکارێکی دیکەش هەبوو بۆ ئەوەی ئەو خوێندنگەیە سەرنجم رابکێشێت، لەوانەشە بۆ خوێنەر کارێکی حەنەکئامێز بێت، بەلام لە دیدی منەوە زۆر گرینگ بوو. هۆکارەکەش ئەوە بوو لە بەردەم ماڵەکەماندا زەوییەکی پڕ لە چیمەن هەبوو، مرۆڤ لەنێو ماڵەکەی خۆیەوە دەیتوانی لایەنێکی خوێندنگەکە ببینێت، جگە لەوەش ئارامییەکی پێدەبەخشیم لەوەی لەو شوێنەوە **لۆلیتا** ببینم لە کاتی رۆیشتنی بۆ خوێندنگە، هەستیشم کرد کە چێژێکی زۆر وەردەگرم لەوەی لە ژووری نوستنەکەمدا بە دووربینێک بڕوانمە پەرییە هارەکان کە لەگەڵ **لۆلیتادا** لە کاتی پشووی نێوان وانەکاندا یاری دەکەن.

بەلام بەدبەختیی من، لە یەکەم ڕۆژی نیشتەجێبوونمدا لەو ماڵەدا، کرێکارەکان هاتن و بەربەستێکیان دانا و لەو زەوییەدا بینایەکی گەورەیان دروست کرد و ڕۆژبەڕۆژ خوێندنگەکەم لەبەر چاو ون بوو.

## ٥

لەو شەقامەدا کە ناوی تایر بوو، لە گەڕەکەکەدا هێندێک ماڵ هەبوون باخچەی سەوز و جوانیان هەبوو، ئەمەش بووبووە هۆی سەرنجڕاکێشانی ئەو کەسانەی دەهاتنە گەڕەکەکەوە. هەوڵم دا دراوسێیەکانم بە هەر شێوەیەک بێت دوور بکەونەوە لێم، بەبێ ئەوەی زمانی زبر و ڕەفتاری ناخۆشیان لەگەڵدا بەکار بهێنم.

هێندێک جار دراوسێی لای ڕۆژئاوام لە کاتی ئۆتۆمبێلشووشتندا باسی دۆخی هەنووکەیی دەکرد و منیش هەر بە ورتەورت و بە ڕەوشتەوە وەلامیم دەدایەوە، بە شێوەیەک خۆمم بۆی ڕوون نەدەکردەوە کە هاوڕام یان دژی ڕاکەی ئەوم. ماڵی بەرانبەریشمان دوو خانمەمامۆستای زمانی ئینگلیزیی لێ بوو، مسز **لیستەر** جەستەیەکی پڕ و قژێکی کورتی هەبوو، مسز **فابیان** جەستەیەکی ڕێکی هەبوو. ئەو دوو گەورەکچە زۆر بە کەمی قسەیان لەگەڵدا دەکردم، قسەی ئەوان هەمیشە لەسەر جوانیی **لۆلیتای** کچم و باشیی (گاستۆن) بوو.

بەڵام دراوسێیەکانی لای ڕۆژهەڵاتم، مەترسیدارترین دراوسێ بوو، ژنێکی خۆهەڵقورتێنەر بوو لووتی وەکوو لووتی کونەپەپوو خوار بووبوو. بیرم دێت چۆن بە نیگاکانی **لۆلیتای** دادەماڵی؛ لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە بە گەرمی چاوەڕوانی **لۆلیتای** خۆشەویستم دەکرد کە لە خوێندنگە دەگەڕایەوە، بە چاوی خۆم بینیم ئەو قەیرەژنە ناشرینە لە پاڵ پەردەی درۆ و لەژێر چەترەکەیدا شانی دابوو، (ئەمە لە کاتێکدا بارانیش خۆشی کردبووەوە)، یەخەی کراسەکەی **لۆلیتا** کرابووەوە و کتێبەکانی لە باوەش کردبوو، هەوای ساردیش قاچە ڕووتەکانی سوور کردبووەوە، ئەو سەیری **لۆلیتای** دەکرد، ئەو دراوسێ ناشرینە بە بزەیەکی شاراوەوە هەوڵی دا دەنگی خۆی نەرمونیان بکات، ڕێی لێ گرت و پرسیاری کرد:

- ئازیزەکەم کوا دایکت؟ باوکت چ کارەیە؟ پێشتر لە کوێ بوون؟

ئەمانە و چەند پرسیارێکی دیکەی لێ کرد.

جارێکیان ئەو دراوسێ نەخوازراوەم ڕێی لێ گرتم و بە بزەیەکەوە بەیانی باشی لێ کردم، بەڵام من هەڵهاتم. دوای چەند ڕۆژێک

نامەیەکی ئەوم پێگەیشت، شیرینی و چەوریی لێ دەچۆڕا و پێشنیاری ئەوەی کردبوو کە ڕۆژی یەکشەمە **لۆلیتا** سەردانی بکات و جوانانەی پێشان بدات کە لە دایکییەوە بۆی ماوەتەوە، (ئەو کتێبە بە درێژاییی ڕۆژ و تا نیوەشەو دەنگی رادیۆکە بە بەرزی بکاتەوە، باشترە لەوەی دەبوایە زۆر بە ئاگا بوایەم لە مسز هۆلیڤانی جلشۆر و چێشتلێنەر، کە گسکێکی کارەباییشی لە کرێچییەکی پێشووی بۆ مابووەوە.)

کاتێک **لۆلیتا** لە خوێندنگەدا خواردنی دەخوارد، هیچ مەترسییەکی لەوە نەبوو کە چێشتلێنەرەکە پرسیارێکی لە بارەی ژیانییەوە لێبکات، چونکە هەمان ئەو خۆراکەم بۆ **لۆلیتا** ئامادە دەکرد کە مسز هۆلیڤان لێی دەنا.

بەختەوەر بووم بەوەی ئەو چێشتلێنەرە هەستێکی ئەوتۆی نەبوو بۆ ئەوەی دیقەتی هێندێک وردەکاری بدات، منیش ئەزموونێکی باشم هەبوو بۆ شاردنەوەی شوێنەواری کردەوەکانم، سەر سیسەمەکەم بە شێوەیەک ڕێک دەخست، کە ئاسەواری تاوانە ناباوکایەتییەکانمی تێدا دەرنەکەوێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ترسی ئەوەم هەبوو ڕۆژێک پەڵەیەک لە بیر بکەم، یاخود لە بۆنەیەکدا قسە لەگەڵ **لۆلیتادا** بکات و شتێک لە زمانی **لۆلیتاوە** بخزێت.

هەمیشە وا هەستم دەکرد کە لە ماڵێکی شووشەیی و ڕووناکدا دەژیم و لە هەر کاتێکدا بێت ڕووخسارێکی خۆهەڵقورتێنەرم لە پەنجەرەیەکەوە بۆ دەردەکەوێت، کە بە ڕێکەوت پەردەکەم دانەداوەتەوە و بە ئارەزووی خۆی شتی زۆر نامۆ ببینێت، ئەو دیمەنەش بۆ ئەو کەسانەی کە خۆهەڵقورتێنەرن زۆر بەچێژە، بە شێوەیەک ئامادەن سامانێکی بچووک ببەخشن بۆ ئەوەی ئەو دیمەنە ببینن.

٦

پێویستە بە چەند وشەیەک پەسنی گاستۆن بدەم. هۆکاری سەرەکیی هاورێیەتیم بۆ گاستۆن و قەبوولکردنی و هەستکردن بە ئارامیی لەگەڵیدا، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە وەکوو سێبەرە بوو بۆ من و سەبارەت بە نهێنییەکەشم لە تەنیشتییەوە ئەرخەیان بووم. بەهەرحاڵ، خۆ ئەو نهێنییەکەی منی نەدەزانی، هیچ هۆکارێکیشم لەبەردەست نەبوو بۆ ئەوەی نهێنییەکەمی بۆ باس بکەم و دڵنیا بم لێی، کەسێکی خەیاڵاوی بوو، هەستی بە هیچ شتێک نەکرد، تاکوو لە بارەی پێوەندییەکەمەوە لەگەڵ لۆلیتادا، پرسیارێکی راشکاوانە بکات و منیش بە راشکاوی وەڵامی بدەمەوە.

گاستۆن لای خەڵک بە باشە باسی دەکردم. بەوەش ناوبانگی کەسێکی باشم بەدەستهێنا، ئەگەر ئەو مەیلە شاراوەکان و دۆخی لۆلیتای بزانییایە، گرینگی پێ نەدەدا، تەنیا ئەوە نەبێت هێندێک شتی بۆ ڕوون دەکردمەوە و دەیگوت ئەمە کارێکی دوورە لە ڕەوشت و هێندێک ئەتەکێتی دروستکەرانەی بۆ دەخستمە ڕوو، چونکە ئەو دەیزانی لە خەڵکی بێردسلی باشتر دەیناسم و لەوان باشتر لێی تێدەگەم.

پیاوێکی رۆشنبیر و رەفتارنامۆ بوو، هەمیشە جلێکی رەشی لەبەر دەکرد و بەدەگمەن خۆی دەشووشت، بەشی خوارەوەی لەشی بە شێوەیەکی بەرچاو گەورەتر بوو لەبەشی لاوازی سەرەوەی، لەگەڵ ئەوەشدا هەرچەندە رەفتاری نامۆی هەبوو، بەڵام بە کەسایەتییەکی ئەفسووناویان دەزانی. خەڵک پێی وابوو کە بۆ خۆشەویستی خوڵقێنراوە، بەم شێوەیە دراوسێیەکان زۆر نازیان پێ دەدا، تەنانەت منداڵانی گەڕەک هەموویان دەیانناسی و ئەویش ناوی سەرجەم

منداڵەکانی دەزانی و بەناوی خۆیانەوە بانگیانی دەکرد، زۆرجار منداڵەکان هاوکارییان دەکرد و باخچەکەیان بۆ پاک دەکردەوە و داریان لە دارستانەکەوە بۆی دەهێنایەوە، ئەوەیش لە بەرانبەردا شیرینیی پێیان دەدا.

ماڵەکەی ستۆدیۆیەکی فروانی تێدا بوو و وێنەی گەورەی ئەندری گید و چایکۆفیسکی و و نۆرمان دۆگلاس و نیجینسکی- "کەڵاکانی هەنجیر" و هێراڵد دی دابلنیم "پرۆفیسۆری چەپ بە چاوە تەڕەکانی لە زانکۆی میدوستروون" و مارسێل پرۆستی تێدا هەڵواسیبوو، ئەمەش بووبووە هۆکارێک بۆ ئەوەی دیمەنێکی رۆشنبیرانە بەخۆی بدات و کەشێکی جوانیشی بۆ ماڵەکەی نەخشاندبوو. بەڵام لەبەر چەند هۆکارێک حەفتانە دوو بۆ سێ جار یاریی شەترەنجم لەگەڵیدا دەکرد. جاروباریش کە نوقمی یاریکردن بووین، گوێمان لە دەنگی پێ رووتەکانی **لۆلیتا** دەبوو کە لە ژووری دانیشتنەکەدا مەشقی سەماکردنی دەکرد، بەڵام گاستۆن هەرگیز گرینگیی بەو کارە نەدەدا بەڵکوو هەموو هەستەوارەکانی دەخستە نێو یارییەکەوە و تەنانەت هەستی بە دەنگی پێی **لۆلیتاش** نەدەکرد کە بە رووتی و لەنێو کەلوپەلە ساردەکانی ماڵەکەدا خۆی هەڵدەدا و دەسووڕایەوە و دادەبەزی و لار دەبووەوە.

هێندێک جار **لۆلیتا** لێی دەڕوانین. کاتێک سەرمان خوار دەکردەوە بۆ شەترەنجەکە، سەیری گاستۆنی دەکرد کە نوقمی نێو بەردەکانی شەترەنجەکە بووبوو، لە ناکاو دەستە ساردەکەی بۆ **لۆلیتا** درێژ دەکرد بۆ تەوقەکردن، بیریشم دێت جارێک لە نێوان گواستنەوەی دوو بەردی شەترەنجدا گوتی:

- کچەکانت چۆنن؟

پێ دەچێت ئەو هێندە نوقمی یارییەکە بووبێت، وای هەست کردبێت لۆلیتا تەنیا یەک کچ نییە، چونکە هەر جارە و بەجلێکی تازەوە دەهات. هێندێک جار بە بیجامەی پیاوانەوە و هێندێک جار بە شۆرت و جاروبار بە مایۆ و هەندێ جاریش بە جلێکی هەمەچەشنەوە دەهات.
من پێم ناخۆشە درێژە بە قسەکردنم بدەم لە بارەی ئەو مەخلووقە نەگبەتەوە، کە دوای ئەوە بۆ سالێک سەفەری ئەورووپای کرد و لە ناپۆلی بە کێشەیەکی نابوتەوە تێوە گلا، بەلام کەس نەیدەزانی گاستۆن رقی لە ژیانی ئەمەریکایە و هەمیشە زمانی دایک- زمانی ئینگلیزیی- کە هیچی وایشی لێ نەدەزانی، خۆش دەویست و مامۆستایەکی خراپیش بوو، لە شوێنێکدا ژیانی بەسەر دەبرد گەورەکان نازیان دەکێشا و منداڵەکانیش خۆشیان دەویست و هەموو خەڵکی هەڵخەڵەتاندبوو، بەلام من لەو باشتر بووم و رۆشنبیرتر بووم، چونکە ئەوەم تێیدا ئاشکرا کرد.

## ٧

ئێستا ڕووبەڕووی ئەرکێکی قێزەون بوومەتەوە، ئەوەش تۆمارکردنی دابەزینی ئاستی ڕەوشتی لۆلیتایە، ئەو چێژەی کە بە منی دەبەخشی، لە ئاست ئارەزووە مەزنەکانیدا نەبوو، ئەوەی بە دەستی دەهێنا بڕە پارەیەکی کەم و حەرام بوو.
لە ئاست لۆلیتادا زۆر لاواز بووم و ژیر نەبووم، ئەو کچە قوتابی و هەرزەکارە وای لێ کردم بیپەرستم، خواستی من بۆ ئەو ڕۆژبەڕۆژ زیادی دەکرد، ئازارم کەم دەبووەوە و ڕەگەزی مرۆڤانەم لە

پێوەندییەکەدا گرژ دەبووەوە، بەلام **لۆلیتا** ئازار و خواستمی زۆر بە
خراپی دەقۆستەوە و زیادی دەکرد.
خەرجیی حەفتانەی ئەو بەرانبەر بە رازیکردنی هەستەکانم، لە
سەرەتادا کە لە بێردسلی بووین، بڕی ٢١ سەنت بوو، هێندەی پێ
نەچوو گەیشتە دۆلارێک و پێنج سەنت. پێم وا بێت ئەوەش بڕە
پارەیەکی باش بوو، چونکە جۆرەها جۆری دیاریشم بۆی دەکڕی و
گەشت و چوونە سینەما و کڕینی شیرینییش لە ئەستۆی مندا بوو،
بەلام لە بەرانبەریشدا داوای ماچێکی زیادەم لێدەکرد، یاخود هێندێک
دەستبازیی زیاتر. هەر بەڕاستی **لۆلیتا** ئاسان نەبوو، هیچ هەولێکی
نەدەدا کە کاردانەوەی بەرامبەر بە خەرجییە رۆژانەییەکانی هەبێت.
سازشی زۆر قورسی دەکرد، کاتێک دەیبینی لاوازم و بەبێ ئەو
تێکشکاوم و ئارامم لێ دەبڕێت. دەبوو بەسەریدا سەرکەوم لەو کەشە
ترسناکەی کە تێیدا دەژیاین، هەمیشە مەرج و بیانووی هەبوو بۆ
ئەوەی داواکارییەکانم جێبەجێ بکات.
جارێکیان هەستی بە ئەفسوونیی دەمە تەڕەکەی خۆی کرد، بۆیە
نرخی یەک باوەشپێاکردنی بۆ چوار دۆلار بەرز کردەوە. خوێنەری
ئازیز! پێمەکەنە، بمهێنە بەرچاوت کە لە حاڵەتی وروووژاندن و تێندا
پارەی ئاسنم لە گیرفانم دەردەهێنا و دەمکردە نێو دەستی **لۆلیتاوە**،
بۆ ئەوەی رەزامەندی بە دەست بێنم.
هەمیشە دوای ئەوەی ویستی خۆمم بەدەست دەهێنا، هەوڵم دەدا
پارەکانی بە زۆر لێوەربگرمەوە. لەنێو کتێبخانە و دەفتەرەکانیدا
بەدوای پارەکاندا دەگەڕام بۆ ئەوەی لێی بستێنمەوە. بیرم دێت
رۆژێکیان ٢٤ دۆلارم لە کونێکی هۆڵەکەدا دۆزییەوە کە **لۆلیتا**
حەشاری دابوو، کاتێک **لۆلیتا** پێی زانی پارەکەی نەماوە، مسز

هۆلیڤانی چیشتلینەری بە دزیکی قیزەون تومەتبار کرد و گوتی پارەکەی دزیوە.

بەلام **لۆلیتا** حەشارگەیەکی باشتری دۆزییەوە، کە من نەتوانم بیدۆزمەوە، منیش نرخی بەخششەکانیم بە شیوەیەکی بنەڕەتی داگرتبوو، ئەوەش لە دوای ئەوەی مۆڵەتی بەشداریکردنیم لە شانوگەرییەکی خوێندنگە پێ دا، زۆر بە قورسی مۆڵەتەکەم پێ بەخشی، چونکە ئەگەر وام نەکردبایە، ترسی ئەوەم هەبوو مایەپووچم بکات، بەڵکوو لەوەش دەترسام بڕە پارەیەکی باش کۆ بکاتەوە و دواتر لە دەستم هەڵبێت.

پێشم وا نەبوو ئەو منداڵە خاوەن نیگاتیڤە، پێی وا بێت بە پەنجا دۆلارەوە بتوانێت خۆی بگەیەنێت بە هۆلیوود، یاخود برۆدوەی و خەونەکەی سینگی، کە خەونی هەموو هەرزەکارێکە- کارکردن لە سینەما یاخود لە شانۆدا- بیهێنێتە دی، ئەگەریش کارەکەی بۆ نەچووە سەر، ئەوکات لە بارێک یاخود مەلهایەک کار دەکات، چونکە ژیان تێیدا ئاسان و خۆش دیار بوو، پێی وابوو پڕ لە پیاوی ڕەسمی و ئۆتۆمبێلی نوێ و گەشتی بەر تریفەی مانگەشەوە.

## ٨

جەنابی دادوەروان:

هەموو هەوڵێکم دا بۆ ئەوەی کێشەی منداڵە هەرزەکارەکان و کێشەی **لۆلیتاش** لەگەڵ ئەو گەنجانە چارەسەر بکەم، تەنانەت ستوونی تایبەت بە هەرزەکارەکانم لە گۆڤاری (بێردسلی ستار) دەخوێندەوە، بۆ

ئەوەی بزانم چۆن رەفتاری لەگەڵدا بکەم، بیرم دێت لە گوتارێکدا نووسرابوو:
(وشەیەک بۆ باوکان: ترس مەخەنە ڕاستگۆییی کچەکەتانەوە، زۆری لێ مەکەن و کارێکی لێ قەدەغە مەکەن کە قورس بێت، پێویستە درک بەوە بکەن کە منداڵەکانتان ئەو کارە بەجوان دەزانن، لەوانەیە بۆ ئێوە هێشتا منداڵێکی بچووک بێت، بەڵام منداڵی تر وەکوو ئەفسانە و کارێکی خۆش دەیبینن، بۆیە ئارەزووی دەکەن و داگیری دەکەن.
باوکی ئازیز! تۆ ئێستا پلەیەکی گەورەت لە کۆمپانیایەکدا هەیە، بیرت نەچێت تاکوو دوێنێ تۆ (جیمی) خوێندکاری زانکۆی بووی کە خۆبەخش کتێبی (جێنی) هاوڕێت هەڵدەگرت.
ئەوانەت بیر دێت، دواتر پێت وانییە ئێستا کاتی هاتبێت کە کچەکەت (ڕۆڵی خۆی ببینێت) و دڵخۆش بێت بەوەی کە گەنجەکانی هاوڕێی بە جوانی بزانن و دۆستایەتیی بکەن؟
بۆچی مامەڵەی میوان لەگەڵ کچە گەنجەکەتدا ناکەی؟
بۆچی بە قسەکردن دڵخۆشی ناکەی؟ بۆ لەو کۆتوبەندە ئازادی ناکەی؟ تاکوو ئارام بێت لەگەڵت.
ئەگەر کچەکەت پێشێلکاریی ڕێنماییەکانی کرد و کارێکی کرد کە ڕەوشتی تێدا بڕووشێت لە بەردەم هاوبەشی تاوانەکەیدا، شێلاوەی تووڕەبوونت مەڕژێنە بەسەریدا، تووڕەییەکەت بە تەنیا بڕشێنە بەسەریدا، باشتر وایە خۆت وا دەرخەی لای هاوڕێ گەنجەکانی، کە کچی پیاوێکی پیرە.
ئەمانە بەشێک بوو لەو ڕاسپاردانانەی کە دەمخوێندەوە، بەڵام ئەو پیاوە پیرەی کە دەبێ من بم، لیستێکی بۆ کارە قەدەغەکراوەکان و ڕێپێدراوەکانی **لۆلیتا** دیاری کردبوو.

سەرەتای لیستی شتە قەدەغەکراوەکان بریتی بوو لە ژوانی گەنجان تەنانەت ئەگەر بە تەنیا بێت، یاخود لەگەڵ کچێکی هاوڕێی، یانیش لەگەڵ یەک گەنج، یاخود دوو و سێ لە یەک کاتدا، ئەو جۆرە ژوانانە بە سەیرانێکی تەنیا دەست پێدەکات، یاخود ئاهەنگێکی بچووکی مارەکردن، لە کۆتاییدا بە هەنگی کۆیی کۆتایی دێت، بەڵام من ڕێم پێدەدا کە سەردانی دوکانی شیرینیفرۆشییش بکات، چونکە لەوێ لەگەڵ منداڵێکی بچووک قسە دەکات، منیش لە دوورییەکی گونجاوەوە چاودێریم دەکرد.

لە بارەی لەبەرکردنی جلوبەرگی سەماکردنی ڕەسمییشەوە، بەڵێنم بە لۆلیتا دا بیرێکی لێبکەمەوە، چونکە ئەو منداڵە و تەمەنی تەنیا چواردە ساڵانە و (ئەو جلانەش جۆرێکە، کچەکان وەکوو قاز دەردەخات)، بە مەرجێک دەبێت منیش بانگهێشت بکرێم و کۆمەڵێک خەڵکی نێو کۆمەڵ ئامادەی نمایشەکە ببن، جگە لەوەش ژمارەیەک خوێندکاری زانکۆی (بتڵەر) ئامادەی نمایشەکە دەبن، بەڵام من هەمیشە توندڕەو بووم و سیستمێکی سەختم بۆ لۆلیتا دانابوو و ڕێم پێ نەدەدا لەگەڵ گەنجێکدا بڕوات بۆ ئاهەنگێک، یاخود سینەمایەک و لەنێو ئۆتۆمبێلەکاندا باوەش بەیەکدا بکەن، ڕێی تەلەفۆنکردنیشم پێنەدابوو.

ئەو مەرجانەش لۆلیتای زۆر تووڕە کرد و زۆر خراپ هەڵچوو. جنێوی زۆر خراپی پێدام، دەتگوت بۆ ئەوە ئەفرێنراوم کە کۆنترۆڵی تووڕەییم لە دەست بدەم لە ئاست ئەو جنێوانەیدا، بەڵام بۆم دەرکەوت کە تووڕەیی ئەو بۆ ئەوە نەبوو کە وەکوو باوکێک هێندێک شتی لێ قەدەغە دەکەم، بەڵکوو مافێکی گشتیم لێ قەدەغە کردبوو.

بەم شێوەیە بەردەوام بووم لەسەر بەرنامەیەکی ئاسایی، ڕێم بە ڕەفتاری گونجاو دەدا و وەکوو نەریتێکی کۆن، بە پێی ئەم بەرنامەیە

کە زیاتر خۆپاریز دەبێت لە هەموو بوونەوەرەکانی دیکە، تەنانەت هەرچەندە ورووژێنەر و سێکسییش بێت.

تکایە هەڵە لێم تێمەگەن، من دڵنیا نیم لەوەی کە لە ماوەی زستاندا، پێوەندیی ناتەندروستی لەگەڵ گەنجانی پیس و نامۆدا کردبوو یان نا، هەرچەندە من چاودێریم دەکرد، بەڵام کەلێنیش دروست دەبوو، بۆ ئەوەی کاتەکەی بە شتی خراپەوە بباتە سەر، بەڵام دەتوانم سوێند بخۆم کە نەیتوانیوە کارێکی وا بکات کە جێی مەترسییەکی گەورە بێت.

هەستم بەوە دەکرد **لۆلیتا** ناپاکییەکی جددی لە من نەشاردبووەوە، بەوەم دەزانی کە گەنجێکی وا نەبوو لە ژیانیدا رکابەریم بکات، لەوانەی کە دەوروخولی **لۆلیتایان** دەدا، یاخود تووشی لاقەکەرێکی لێهاتوو نەبووبوو- لە ئۆتۆمبیلێکی وەرزشیدا. ئەوەی من هەستم پێ کرد ئەو گەنجانە **لۆلیتایان** تووشی بێتاقەتی دەکرد.

بەهەرحاڵ، هەستم بەوەکرد کە **لۆلیتا** خەریکە خۆی لەو نێوەندەدا دەگونجێنێت، بە شێوەیەک زیاتر بوو لەوەی من دەمویست. هەرچەندە من لە ژیانی ئاسایی خۆمدا لەسەر راڕاییی بەردەوام رانەهاتبووم، بەڵام وامدەزانی کە باشترین هەوڵم داوە بۆ ئەوەی رۆڵی باوک ببینم، هەموو ڕۆژێک بەر لە ڕۆیشتنی **لۆلیتا** بۆ خوێندنگە بە شەپۆلێک؛ گوێڕایەڵی و گرینگیدانم بە **لۆلیتا** پیشان دەدا، چونکە **لۆلیتا** پێی خۆش دەبوو، دوای ئەو دەچوومە سەر جێ ساردەکەی و رادەکشام و ڕووداوەکانی ڕۆژی پێشووم دەهێنایەوە بەرچاوم و تەماشای رۆڵی خۆمم دەکرد، هێندێک جار وەکوو باوکێکی ئاسایی رەفتارم لەگەڵدا دەکرد و بۆ سەیران و سینەما و چێشتخانە و کتێبخانەم دەبرد و وەکوو باوکێک لە تەنیشتییەوە رێم دەکرد.

## ٩

بە هاوڕێیەکانی ئاشنا بووم کە هەمیشە ئارەزووم دەکرد بیانناسم، بەڵام بە پێی پێشبینییەکانی من نەبوون، **ئۆبال** کچێکی شەرمن و شێوەیەکی نارێکی هەبوو و چاویلکەیەکی پزیشکیی لە چاو دەکرد. **لیندا هۆڵم** ناسی، پاڵەوانی تێنس بوو لە کۆلێژەکەدا، گومانم هەبوو کە پەرییەکی هار بێت، بەڵام لەبەر چەند هۆکارێکی نادیار سەردانی ماڵەکەی نەکردم، برادەرەکانی دیکەی **لۆلیتا** کەسانی ئاسایی بوون، جگە لە **ئێڤا ڕۆزۆن** کە دەگەیشتە ئاست پاکیی پەرییە هار و جوانەکان، پێشتریش پەنابەر بووە لە فەرەنسا و لەلایەکی تریشەوە نموونەی کچێکی باش بوو، جوانییەکی زۆر ئەوەی نەبوو، بەڵام بۆ چاوی کەسانی پسپۆڕ ئەندامە ئەفسووناوییەکانی هەرزەکاریی دەردەکەوت، ئەوەش لە ڕێی ئەو ڕووخسارە منداڵانە و چاوە خەواڵووەکانی و روومەتە بەرزەکانییەوە بوو، قژە سوورەکەی هاوشێوەی نەرمیی قژی **لۆلیتا** بوو. ڕووخساری بە کەسێکی ئاژاوەگێڕ نەدەچوو.

هێندێک جار بە فەڕەنسی قسەم لەگەڵدا دەکرد، **لۆلیتاش** توورە دەبوو، ئەوکات هێشتا **لۆلیتا** ڕەوشتی پاک بوو، بەڵام بە هۆی خوێندنگەوە فێری وشەی بازاڕی بووبوو، جاروباریش ئەو وشە بازاڕییانەی بە دەمدا دەهات. بەڵام بە داخەوە، بە هۆکارێکی نادیار، **لۆلیتا** ئەو کچە فەرەنسییەی لە لیستی هاوڕێیەکانی سڕیوە، بەرلەوەی من چێژ لە هاوڕێتیکردنی وەربگرم (مامی ئەو کچە ملیۆنێریش بوو.)

پێ دەچێت خوێنەر بزانێت بۆچی گرینگی بەوە دەدەم پەرییەکان لە دەوروبەری **لۆلیتا** بن، چونکە هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە کە

یەکێکیان وەکوو یەدەگ لە نێزیکم بن، یاخود وەکوو ئەو جۆرە خەلاتانەم دەزانی کە بە ناچاری وەری دەگرین.
بۆ ماوەیەکیش هەولم دا هەستەکانم لەگەل **مۆنا دامل**دا سەرقال بکەم، کە چەند جارێک سەردانی دەکردین، بە تایبەتی لە وەرزی بەهاردا- ئەوکاتەی **لۆلیتا** کاری نواندنی زۆر لەلا گرینگ بوو. پرسیاری ئەوەم دەکرد ئایا **لۆلیتای** فێلباز و مەکرباز تا چەند نهێنییەکانی لای مۆنا درکاندووە، چونکە بە نرخێکی زۆر گرانبەها پێوەندییەکی سۆزداریی مۆنای بە وردی بۆ ئاشکرا کردم کە لەگەل زەریاوانێکدا لە گۆشەیەکی کەناری زەریا پێکەوە دەبن.
**لۆلیتا** تایبەتمەندییەکی هەبوو، ئەو هەمیشە کەسانی نهێنیپارێزی دەگرتە خۆی، هاوشێوەی مۆنا کە جلێکی شیک و پارێزراوی لەبەر دەکرد و وەکوو مێیینەیەک ژیانی دەگوزەراند، مەزاجێکی خراپی هەبوو، جارێکیان گوێم لێ بوو بە **لۆلیتای** گوت کە تەنورەکەی، لە سوفی پاکیزە چنراوە، بەلام مەبەستی مۆنا لەو قسەیە ئەوە بوو، کە هیچ جۆرە پاکیزەیەتییەکی تێدا نییە، جگە لەو تەنوورەیە.
خاوەن دەنگێکی گڕ و وروووژێنەر بوو، چاوەکانی لە رەنگی عەنبەر بوو، قژە رەشەکەشی کرابووە پرچ، دەستەکانیشی دەلەرزین، توانیم هێندێک زانیاریی شاراوەی **لۆلیتای** لێ وەربگرم لە خوێندنگە.
ڕۆژێک لەگەڵ **لۆلیتادا** هاتبوو بۆ مەشقکردن- لەسەر شانۆگەریی (مەشقکردنی پڵنگ)ی شەکسپیر. ئەوکات **لۆلیتا** لە ماڵ نەبوو و دانیشتم و لەگەڵیدا دەستم کرد بە قسەکردن و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پرسیاری پێوەندییەکانی **لۆلیتام** کرد لەگەڵ گەنجەکاندا، بە نیگای ژنێک کە دەزانێت چۆن پیاوی پێ دەورووژێنێت وەڵامی دامەوە:

- له ڕاستیدا **لۆلیتا** گرینگی به گەنجە بچووکەکان نادات، ئەوەی ڕاستی بێت من و **لۆلیتا** ڕکابەری یەکین و هەردوکمان **ویگەریی** قەشەمان خۆش دەوێت.

زۆر پێکەنیم بەو قسەیە، چونکە قسەکانی وەکوو نوکتەیەک پێم گەیشت، ئەو پیاوەی کە باسی دەکرد پیاوێکی زۆر ناشرین بوو و چەنەی وەکوو چەنەی ئەسپ بوو، هەمیشە بە باسکردنی یادگارییەکانی سویسرا مرۆڤی بێزاری دەکرد.

مۆنا داهل خۆی ڕاست کردەوە و گوتی:

- ئۆهـ **لۆلیتا** شەکرە... جوانە!

لەگەڵ ئەو قسەیەدا جارێکی تر خۆی ڕێک خستەوە و لەسەر ڕەفی کتێبخانەکە کتێبێکی هەڵگرت و بە جددییەتێکی ساختەوە پرسیاری ڕای منی کرد، لە بارەی نووسەری ئەو کتێبەوە پرسی و بە کورسییەکەی خۆی لێ نێزیک دەکردمەوە، تا ئەو ڕادەیەی کە دەمتوانی بۆنە ناورووژێنەرەکەی لە بنێشتەکەی جیا بکەمەوە، لێرەدا و لە ناکاو بیرم لە شتێکی کردەوە: تۆ بڵێی **لۆلیتا** پیلانێکی بۆ ئامادە کردبێتم لەگەڵ مۆنادا! ئەگەر ئەو کارەی کردبێت، ئەوە سەرەتایەکی باشی بۆ نەکردووم.

لە دوای ئەو بیرکردنەوەیە خۆم لە نیگاکانی مۆنا دور گرت کە بەردەوام تیشکی دەخستە سەر ڕووخسارم، بابەتی ئاخاوتنەکەم بەرەو ئاراستەیەکی ئەدەبییانە گۆڕی، هێندەی پێ نەچوو **لۆلیتا** هاتە ژوورەوە و بە نیگایەکی سارد و تۆمەتبارکردنەوە دایماڵیین، بۆیە خۆمم کشاندەوە و بە تەنیا جێیانم هێشت.

## ١٠

هێندێک جار کە **لۆلیتا** سەرقاڵی ئامادەکردنی ئەرکەکانی خوێندن دەبوو، بە نیمچەڕووتییەکەیەوە رادەکشا و سەری قەڵەمەکەی دەمژی و لاقەکانی بەرز دەکردەوە و لەسەر جێدەستی کورسییەکان دایدەنا. لەو کاتانەدا دەستبەرداری هەموو ویقارێک دەبووم و هەموو ناکۆکییەکانم لە بیر دەکرد و غروروری خۆشمم وەکوو پیاوێک لە دەست دەدا و لەسەر چۆکەکانم دەخشکام بۆ لای کورسییەکە، ئەویش بە نیگایەک وەکوو ئەوەی نیشانەی پرسیاری لەسەر بێت تووڕە دەبوو و دەیگوت:

- ئۆهـ.. بەسە!

ئەو کە ئەو قسەیەی دەکرد هەرگیز بۆ جارێکیش تەنازوولی نەدەکرد و بڕوای بەوە نەبوو کە هەمیشە بەبێ ئەوەی پلان دابڕێژم ئارەزووی ئەوە دەکەم دەموچاوم لە توێی جلەکانیدا نوقم بکەم و باوەش بە دەستە نەرمەکانیدا بکەم و رووومەتم بدەم لە رووومەتی و چاوەکانی ماچ بکەم.

لەو ساتانەدا بە بێزاری دەربڕینەوە دەیگوت:

- تکایە لێم گەڕێ، بۆ خاتری مەسیح.

منیش لە زەوییەکە هەڵدەستامەوە و بێزاری و ناڕەزایەتیم لە ڕووخسارمدا پیشان دەدا، بەڵام من گرینگیم بەوە نەدەدا، چونکە دەمزانی وەکوو ئەژدیهایەکی دڕندە وام.

دەکرێت لەو ڕووداوانە گەڕێم و لە چیرۆکەکەم بەردەوام بم.

## ١١

لە سەرەتای مانگی دیسەمبەردا، **مسز برات** بەڕێوەبەری خوێندنگەکەی **لۆلیتا** بانگهێشتی کردم، من دەمزانی لە ماوەی رابردوودا نمرەکانی نزم بوونەتەوە، بەڵام بەرلەوەی خۆم دڵنیا بکەم کە ئەو بانگهێشتکردنە بۆ لاوازبوونی ئاستی **لۆلیتایە** لە خوێندن، جۆرەها هۆکاری دیکەی ناخۆش و مەترسیدارم هێنایە بەرچاوی خۆم، ناچار بووم بە خواردنەوەی هێندێک مەی بوێری بە خۆم بدەم و بڕۆم بۆ دیداری بەڕێوەبەرەکە، بەڵام ترس قورگمی وشک کردبوو، ئەو بەڕێوەبەرەش ژنێکی قەبەی لووتپان و چاوبچووک بوو، چاویلکەیەکی ئەستوریشی لە چاو بوو، پێشوازیی لێ کردم و ئاماژەی بۆ کورسییەکی سادە کرد بۆ ئەوەی دابنیشتم، ئەویش لەسەر کورسییەکی جوان و گرانبەها دانیشت، بە بزەیەکەوە تەماشای کردم.

کاتێک ڕووی کرد بەولاوە، هەستم کرد ئەو بەڕێوەبەرە دەیەوێت باسی شتێک بکات، بە هۆی شەرمەوە نازانێت چۆن دەست پێ بکات، چاویلکەکەی بە تەنوورەکەی سڕی، بۆ دواجار بەبێ ئەوەی سەیری من بکات گوتی:

- مستەر هیز با پرسیارێکی وشکت لێ بکەم، تۆ باوکێکی ئەورووپیی ستایل کۆنی، وایە؟

- نەخێر، ستایلی من کۆن نییە، بەڵام لەوانەیە من کەسێکی خۆپارێز بم.

خۆی ڕێک خستەوە و ئاهێکی هەڵکێشا و هەردوو دەستی لە یەک گوشی، وەکوو ئەوەی بیەوێت بابەتێکی قووڵم بە شێوەیەکی

راستەوخۆ لەگەڵدا باس بکات، چاوە شینەکانی بە تیژی ئاراستەی من کرد و گوتی:

- دوللی، منداڵیکی رۆحسووکە، بەڵام پێ دەچێت قۆناغی پێگەیشتنی سێکسی، تووشی تەنگیی کردبێت.

منیش سەرم دانەواند گوتم چی بە من دەکرێت.

مسز برات لە قسەکردن بەردەوام بوو. دەستەکانی کە چەند پەڵەیەکی پێوە بوو، لە کاتی قسەکردندا رایدەوەشاند. (پێ دەچوو پەڵەکان بە هۆی نەخۆشیی جگەرەوە تووشی بووبێت) گوتی:

- لۆلیتا هێشتا وەکوو بەکرەیەک لە نێوان پێگەیشتنی (کۆم و زێدا) دێت و دەڕوات.

- ببوورە، تێنەگەیشتم، گوتت چی؟ چ ناوچەیەک؟

- پێم وایە ئێستا لایەنە ئەورووپیە کۆنەکەت قسە دەکات، ئەوەی مەبەستمە، هەستە بایەلۆژی و بایسکۆلۆژییەکان تێکەڵ نەبووە و یەکیان نەگرتووە لە لۆلیتادا، بەڵام کچێکی جوان و ژیرە، هەرچەندە کەسێکی گوێنەدەرە، بۆیە نمرەکانی بەردەوام لە لاوازبووندایە. مستەر هێز دەمەوێت پرسیاری ئەوە بکەم...

قسەکانی بڕی و خۆی وا پیشان دا کە بیر دەکاتەوە و دووبارە گوتی:

- با بە وردی هێندێک شتت پێ بڵێم، لۆلیتا دژایەتیی مامۆستاکەی دەکات و زۆر بە توندوتیژی مامەڵە لەگەڵ مامۆستا کوڕامانتدا دەکات، راپۆرتێکم بە دەست گەیشتووە لەلایەن مامۆستای سەرپەرشتیاریەوە، تێیدا دەڵێت لۆلیتا بە هاوبەشیی لەگەڵ هاوڕێیەکانیدا گۆرانیی باش دەڵێت، بەڵام خەیاڵی دەڕوات، قاچ لەسەر قاچ دادەنێت و قاچی چەپی لەگەڵ ئاوازی گۆرانییەکاندا دەلەرێنێتەوە

و وشەی بازاڕی بەکار دەهێنێت، لە ماوەی حەفتەی رابردوودا بەردەوام وەنەوزی داوە و لەنێو پۆلدا بنێشت دەجوێت، بەڵام هێشتا دەستی نەکردووە بە کرۆشتنی نینۆکەکانی، ئەگەر ئەوەشی کردبا لەگەڵ شێوازی گشتی **لۆلیتا**دا دەگونجا، بە شێوەیەکی زانستییانە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە **لۆلیتا** لە قۆناغی سووڕی مانگانەدایە، **لۆلیتا** ئێستا سەر بە هیچ ئایین و مەزهەب و کڵێسایەک نییە.
قسەکەی لە ناکاو بڕی و گوتی ئەوەش لە پسپۆڕێتیی کەسدا نییە و کاری خودایە.
- مستەر هیز ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ بابەتی راپۆرتەکە شتی دیکەشی تێدایە، وەکوو: خەون بە هێندێک شتی تایبەتەوە دەبینێت، ئارەزووی گاڵتەکردنی هەیە و بە لێهاتوویی کەتن دەنێتەوە، لە توانایدایە لە پاڵەوانی تێنس بباتەوە، ئەگەر هێندە خەریکی کاری نابەجێ و نامۆ نەبێت، تەنانەت مامۆستا سەرپەرشتیارەکەی **لۆلیتا** ناتوانێت ئەوە بسەلمێنێت کە **لۆلیتا** خاوەن کۆنترۆڵێکی تایبەتیی هەڵچوونەکانیەتی، یان نا. مامۆستاکەی دەڵێت **لۆلیتا** ناتوانێت هەستەکانی و هەڵچوونەکانی بە کردەوە گوزارشت لێ بکات.
لە هەمووی گرینگتر ئەوەیە، رای گشتی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە **لۆلیتا** هەرچەندە تەمەنی ١٥ ساڵی تێپەڕاندووە، بەڵام گرینگی بە لایەنە سێکسییەکان نادات، بەڵکوو هەوڵ دەدات ئەو زانیارییانە بشارێتەوە، بۆ ئەوەی نەزانیی خۆی پەردەپۆش بکات.
منیش گوتم:
- مامۆستا! **لۆلیتا** تەمەنی ١٤ ساڵە.
گوتی:

- گریمان چوارده ساڵە، هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت، چونکە ئێمە لێرەدا بڕوامان بە شێوازەکانی تێگەیاندنی هەرزەکارەکان نییە لە بابەتە سێکسییەکاندا، ئێمە بڕوامان بە چۆنێتیی ئاراستەکردنی خوێندکارەکانمان هەیە لە ژیانی دایکایەتی و هاوسەرێتیی سەرکەوتوودا.
بە ڕای ئێمە **لۆلیتا** دەتوانێت پێشکەوتنێکی نایاب بە دەست بێنێت، بە مەرجێگ ئەگەر بیر و مێشکی بخاتە سەر خوێندنەکەی، چونکە **لۆلیتا** خاوەن تایبەتمەندیی خۆیەتی و گەمژە و بێئاگا نییە، ئێمە پێمان وایە دوکتۆری خێزانەکەتان وانەیەک لە بارەی ڕاستییەکانی ژیانەوە بۆ **لۆلیتا** بڵێتەوە، دووەم ڕێی پێ بدە هاوڕێیەتیی برای هاوڕێ کچەکانی بکات لە یانەی گەنجان و لە ماڵی باوکی کچەکاندا.
- دەتوانێت پێشوازی لە گەنجان بکات لە ماڵە جوانەکەماندا.
- بە هیوایین ئەو کارانە بکەی، چونکە کاتێک لێپرسینەوەمان لەگەڵیدا کرد، ڕەتی کردەوە هیچ شتێک لە بارەی ماڵەوەی خۆی ئاشکرا بکات، بەڵام ئێمە پرسیارمان لە هاوڕێیەکانی کردووە و پێمان وایە ڕێگری لێ نەکەی لە بەشداریکردنی شانۆگەریی (ڕاوەدوونانی فالچییەکان)دا، چونکە لە کاتی تاقیکردنەوەکاندا بە لێهاتوویی ڕۆڵی پەریبە بچووکەکەی بینی، خۆشحاڵیشم پێت بڵێم کە نووسەری چیرۆکەکە لە بەهاردا سەردانمان دەکات، لەوانەشە ئامادەی پرۆڤەکانیش بێت، مەبەستم ئەوەیە لەوە تێبگەی کە بەشداریکردن لەم جۆرە چالاکییانەدا هەمیشە بەشێک بووە لە یاریکردن و خۆشیی گەنجان.
- من هەمیشە باوکێکی تێگەیشتوو بوومە.
- بێگومان، بێگومان، بەڵام مامۆستای پۆلەکەی- کە منیش هاوڕام لەگەڵیدا- دەڵێت: **لۆلیتا** کۆبیرکردنەوەیەکی سێکسیی هەیە و

دەرکەیەکی دەست ناکەوێت لێ دەربچێت، ئەو گاڵتە بە هاوڕێیەکانی دەکات کاتێک ژوانی پاک لەگەڵ گەنجان ساز دەکەن.
مستەر هیز با پێکەوە بیری لێ بکەینەوە، ئەم منداڵە چییەتی؟
ـ لەبەر چاوی من کەسێکی زۆر سروشتی و بەختەوەر دیارە.
کە ئەو قسەیەم کرد، هەستم کرد ئەو قسانەی کردنی وەکوو ڕێخۆشکردنێک بوو بۆ ئەوەی پەردە لەسەر ئابڕووچوونەکە لابات، پێم وابوو ئەوان نهێنییەکەم دەزانن.
مسز برات گوتی:
ـ ئەوەی نیگەرانم دەکات، مامۆستاکانی **لۆلیتایە** و هاوڕێیەکانیشی بە شەڕانگێز و یاخی دەیبینن، ئارام نییە بە دۆخەکەی، وەکوو زیندانیکراوە، هەموان پرسیاری ئەوە دەکەن بۆچی دژایەتیی **لۆلیتا** دەکرێت لەوەی ئەو خۆشییانە ببینێت کە بۆ هاوتەمەنەکانی ڕێپێدراوە.
ـ مەبەستت ئەوەیە ڕێی پێ بدەم یاریی سێکسی بکات؟
کە ئەو قسەیەم کرد زۆر هەستم بە شەرم کرد.
ئەویش بزەیەک دەمی کردەوە و گوتی:
ـ بێگومان من پێشوازی لە چاکسازییە شارستانییەکان دەکەم، بەڵام من مەبەستم ئەوە نەبوو بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، چونکە ئاهەنگ و سەما و نواندن و بابەتە کۆمەڵایەتییەکان و چالاکییەکانی تر، لە ڕووی هونەرییەوە (یاریی سێکسی) نیین، بەتایبەتی لە کۆلێژی بێردسلی، کچان لەژێر چاودێریدا چاویان بە کوڕان دەکەوێت، ئەگەر مەبەستت ئەو کارە بێت ڕێگری لە **لۆلیتا** دەکەیت!
ـ باشە ئەوەی دەتەوێت با ببێت و بەشداری لە نواندنەکەدا بکات، بەڵام بە مەرجێک کچان ڕۆڵی کوڕان ببینن.

. من سەرسامم بە هونەری گفتوگۆکردنەکەت، بۆ دەچێت بیروکەکەت، مسز **گولد** خۆشحال بکات کە سەرپەرشتیی تواننەکە دەکات، بەلام با باسی بابەتێکی تایبەت بکەین، چونکە ئێمە لە کێشەیەکداین، من بوونەوەرێکی زۆر راشکاوم، دابونەریت هەر دابونەریتە، بەلام پێم قورسە باسی کێشەکە بکەم، بەهەرحال، تۆ دەزانی خوێندنگەکەمان کچی باشترین خانەوادەکانی تێدایە، پێمان باشە پارێزگاری لە پێوەندییەکانیان بکەین، بەلام **لۆلیتا** دۆخەکەمان قورس دەکات و وشەگەلێک بەکار دەهێنێت، تۆ بە هۆی ئەوەی بیانێت هەر لێی تێناگەی، دەتەوێت بانگی **لۆلیتا** بکەین و باسی کێشەکەی لەگەلدا بکەین، نەخێر دەزانم تۆ ئەوەت ناوێت، چیروکەکەش ئەوەیە، **لۆلیتا** چەند وشەیەکی زۆر ناشرینی نووسیوە، دوکتۆری خوێندنگەکە پێی گوتم کە ئەو وشەیە وشەیەکی مەکسیکیی بازارییە و مانای (ئامێری میزکردنە)، **لۆلیتاش** ئەو وشەیەی لەسەر چەند کورسییەک نووسی کە لەلایەن مامۆستایەکەوە بەسەر خوێندکارەکاندا دابەش کرابوو، ویستمان بۆ ماوەی یەک کاتژمێر سزای بدەین و لە دوای تەواوبوونی کاتی خوێندنگە رێی پێ نەدەین بگەرێتەوە بۆ مال، بەلام بەمەرجێک ئەگەر تۆ بتەوێت.

. نەخێر نامەوێت بخرێتە ژێر سیستمی خوێندنگەکانەوە، بەلام کە هاتەوە بۆ مال خۆم دەزانم چۆن سزای دەدەم تاکوو چیتر ئەو رەفتارانە دووبارە نەکاتەوە.

. بەلێ ئەو کارە بکە (لەوکاتەدا لەسەر کورسییەکەی هەستا) ئەگەر زانیمان دۆخی **لۆلیتا** باش نەبوو ئەوە جارێکی تر کۆ دەبینەوە و رەوانەی دوکتۆر (کاتلز)ی دەکەین بۆ ئەوەی دەروونشیکارییەکی بۆ بکات.

کاتێک گوێم لەو قسانە بوو، لە دڵی خۆمدا گوتم:
- ئایا پێویست دەکات ئەم ژنە ناشیرینە بخوازم تاکوو بیخنکێنم؟
ژنە ناشیرینەکە بەردەوام بوو لە قسەکردن و گوتی:
- لەوانەیە دوکتۆری خێزانەکەی ئێوە بە پێویستی بزانێت، پشکنینێکی جەستەییی رۆتینیی بۆ بکات، **لۆلیتا** ئێستا لەگەڵ کچە خوێندکارێکی تردا لە پۆلەکە لە سزادایە، برۆ بیبینە باشترە.
چوومە پۆلەکەوە، بینیم **لۆلیتا** دانیشتووە و کتێبێک لە بارەی نواندنەوە دەخوێنێتەوە و کچێکی ملڕووتیش لە بەردەمی دانیشتووە، ڕەنگی قژەکەی پلاتینی بوو، ئەویش سەرقاڵی خوێندنەوە بوو و زۆر قووڵ بوبووەوە لە خوێندنەوەکەیدا، ئاگای لە جیهانی دەرەوە نەمابوو. لە تەنیشت **لۆلیتادا** دانیشتم و قۆپچەی چاکەتەکەم کردەوە و پێم گوت کە ڕازیم بەشداری لە شانۆگەرییەکەدا بکات و ٦٥سەنتیشم پێ دا، تەنیا لەبەر ئەوەی ئەو دەستەیم لەژێر مێزەکەوە بۆ درێژ بکات کە دەباشیر و حبر پیسی کردبوو، هەرچەندە ئەوە کارێکی گەمژانە و سەرەڕۆییانە بوو بۆ من، بەڵام لە دوای ئەو ئازارەی لە دیداری ئەو بەڕێوەبەرە چەشتم، ناچار بووم ئەو دۆخە چاک بکەمەوە، چونکە دەمزانی جارێکی تر هەلی وام لەگەڵ **لۆلیتادا** بۆ ناڕەخسێت.

## ١٢

لە حەفتەی سەری ساڵدا **لۆلیتا** تووشی هەوکردنێکی توندی سینگ بووەوە و لە جێدا کەوت، پزیشکەکان ڕایان سپاردم حەفتەیەک لە جێدا بیهێڵمەوە. لە سەرەتادا پلەی گەرمیی زۆر بەرز بووەوە، بە شێوەیەک پێم قورس بوو بەرگری لە خۆشییە پێشبینینەکراوەکان

بکەم، خۆشی لە باوەشکردنی **لۆلیتادا** کە وەکوو ئاگر دەسووتا، تا و کۆخین و ئاهەکانیش لە نێو باوەشمدا.

کاتێک تەندروستی باش بووەوە، ئاهەنگێکم بۆی ساز کرد و هێندێک گەنجم بانگهێشت کرد بۆی و پێ دەچێت هێندێکیش سەرخۆش بووبم، کاتێک هاوڕێیەکانی هاتن و بەشدارییان لە ڕازاندنەوەی ژوورەکەدا کرد و گۆرانیی سەمایان هەڵبژارد.

دەبوایە وەکوو باوکێک خۆمم بکشاندایە و ڕێم بە کچەکەم بدابا کە یاری بکات و خۆشی ببینێت، بەڵام نەمتوانی، هەر جارناجارێک و بۆ بێبایەخترین هۆکار سەیریم دەکرد. بەهەرحاڵ، ئاهەنگەکە سەرکەوتوو نەبوو، یەکێک لە سێ برادەرەکەی ئامادە نەبوو، بەڵام دوو گەنجی زیادە هاتبوون.

دوای ڕۆیشتنی بانگهێشتکراوەکان **لۆلیتا** هاوارێکی جاڕسبوونی کرد و لەسەر کورسییەکە هەردوو قاچی درێژ کرد و ماندوویی و وەڕزبوونی دەرخست و سوێندی خوارد کە ئەو گەنجانەی هاتبوون ناشیرینترین گەنج بوون کە لە ژیانیدا ناسیونی.

ئەو قسانەی بەو گەنجانەی گوت، منی زۆر دڵخۆش کرد، لە بەرانبەردا تێنسێکم بۆی کڕی.

## ١٣

کاتێک بەهار هات، **لۆلیتا** وەکوو شێت حەزی بە نواندن و شانۆ دەکرد، منیش ڕقم لە شانۆ بوو، بە شتێکی سەرەتایی و کۆن و بۆگەنم دەزانی، پێم وابوو میراتی ڕێوشوێنەکانی سەردەمی بەردینە، تەنانەت هەرچەندە بە لێهاتووییش ئەو دەقە نووسرابا.

لەو کاتانەدا کارم بۆ ئەرکە ئەدەبییەکانم نەدەکرد، گرینگیم بە خوێندنەوەی تەواوی دەقی شانۆگەریی (ڕاوچییە ئەفسووناوییەکان) نەدا، کە شانۆگەرییەکی کۆمیدی بوو و **لۆلیتا** ڕۆڵی کچی جووتیارێکی تێدا دەبینی، زۆرترین بۆچوونی من ئەوە بوو کە تێکەڵەیەک بوو لە ئەفسانەی بێبایەخ.

**لۆلیتاش** شێوازی جوانی هەبوو بۆ پێکەوەلکاندنی دەستە درێژەکانی و چاوی دادەخست و تکای دەکرد کە ئامادەی ڕاهێنانی نواندنەکەی نەبم.

ڕۆژێکیان لە مانگی ئاداردا (لۆ)م بینی، پاسکیلەکەی لەژێر باخچەکەمان دانا و دەستی گرت بە درەختەکەوە، زۆر تێک چووم و کاری تێ کردم، بە شێوەیەک وامزانی هەموو ئازارەکانم لەناو دەچێت، گوتی: ناوی ئەو هۆتێلەت بیر دێت، بەڵێ تۆ باشی دەناسی. (لایەکی لووتی خۆی خوراند،) ئەو هۆتێلەی کە تێیدا لاقەت کردم، ناوی "ڕاوچییە ئەفسووناوییەکان نەبوو"؟ (قسەکەی لەسەر بابەتەکە لابرد و دەستێکی لە درەختەکە دا و پێکەنینێکی قووڵ و بەهارانەی کرد و بەرەو شەقامەکە ڕۆیشت.)

## ١٤

لە کاتێکدا مۆسیقاش بەشێکە لە شانۆ و مەیلەکانی **لۆلیتا**، ڕێم پێی دا لە حەفتەیەکدا دوو جار لای مامۆستایەکی گەورەکچ وانەی تایبەت بخوێنێت.

ئێوارەیەکی هەینی بوو، لە کۆتاییی مانگی (مایۆ)دا، لە ژوورەکەدا لەگەڵ گاستۆن یاریی شەترەنجم دەکرد، زەنگی تەلەفۆن لێی دا و

وەلامم دایەوە، مامۆستای پیانۆکەی **لۆلیتا** بوو، پرسیاری ئەوەی کرد ئایا **لۆلیتا** ڕۆژی سێشەممە دێت بۆ وانەکەی، یاخود وەکوو سێشەممەی ڕابردوو نایەت و ئەم ئێوارەیەش ئامادەی وانەکان نەبووە.

خوێنەر دەتوانێت وێنای حاڵم بکات، دڵم فڕی و مێشکم تێک چوو و هەوڵیشم دا لەبەردەم گاستۆن خۆم تێک نەدەم، کە ئەمجارەیان توانی لە شەترەنجەکە لێم بباتەوە. گاستۆن بە دڵخۆشییەوە ڕۆیشتەوە و منیش بەدوای **لۆلیتادا** گەڕام، بینیم لەسەر مێزی مەتبەخەکە دانیشتووە، سەرقاڵی خواردنە و چاوی بڕیوەتە دەقی شانۆگەرییەکە و کار بۆ ئەوە دەکات دەقەکەی لەبەر بکات، کە هەستی کرد من لەوێم چاوەکانی بە سۆزێکی ئاسمانییەوە بەرز کردەوە، پێم گوت بۆچی نەچوویت بۆ وانەکانت؟ دڵۆپە ئارەقەیەکی نەکرد و تەنیا ئەوەندەی گوت کە منداڵێکی خراپە و نەیتوانیوە بەرگری لە خۆشیی شانۆگەرییەکە بکات و کاتی وانەی پیانۆکەی بە ڕاهێنانی شانۆکە لە باخچەیەکی گشتیدا لەگەڵ مۆنادا تەواو کردووە.

بە پەلە تەلەفۆنم بۆ ماڵی مۆنا کرد، دایکی وەڵامی دامەوە و بە کوڕێکی هاوڕێی مۆنای زانیم و هاواری کرد:

- مۆنا! **ڕووی** لە تەلەفۆن تۆی دەوێت.

مۆنا بەبێ ئەوەی بزانێت کە ئەو نیم ، بە پەلە دەستی کرد بە گلەییکردن لە **ڕووی**، منیش خێرا قسەکەم پێی بڕی و کەسایەتیی خۆمم ناساند و پرسیارم لێ کرد ئەوەی **لۆلیتا** باسی دەکات ڕاستە، بە زمانێکی زۆر سادە و شێوازێکی سێکسییانەوە وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ بەڕێزم! تاوانی من بوو، کارێکی خراپم کرد و زۆر داوای لێبووردن دەکەم... هتد.

تەلەفۆنەکەم دانا و چوومەوە ژووری دانیشتنەکە. خۆمم دەخواردەوە، **لۆلیتاش** لەسەر کورسییە بزۆکەکە دانیشتبوو و کەزییەکانی لە یەک جیا کردبووەوە، نینۆکەکانی دەخوارد و بە نیگایەکی قورس و چاوی خەواڵوو و بێدڵەوە سەیری کردم و لاقە ڕووتەکەی خستە سەر شوێندەستی کورسییەکە و بەلای چەپ و ڕاستدا دەیهێنا و دەیبرد.

لەو چرکەیەدا بۆم دەرکەوت **لۆلیتا** چەندە گۆڕاوە، بە بەراورد لەگەڵ دوو ساڵی بەر لە ئێستا، ئاخۆ لە ماوەی ئەم دوو حەفتەیەی ڕابردوودا وا گۆڕا؟ لە ڕووخساریدا سۆزێکی ئەفسانەیی دیار بوو. بەڵام ئەو سۆزە کاری تێنەکردم، لەو کاتانەدا توورەیی و ڕاڕایی و غیرەکردنم کۆ کردبووەوە، تەمی شەهوەتم وەکوو دووکەڵ لەناو چووبوو، هیچ شتێک لەبەر چاوم نەمابوو، جگە لە ترسێکی توقێنەر.

بەڵێ **لۆلیتا** گۆڕاوە، شێوەی ئێستای لە شێوەی خوێندکارێکی ناوەندی دەچێت، جلوبەرگی فەرامۆشکارانەیە و ئارەزوویەکی بازاڕیی هەیە و مکیاژی هەرزانبەها بەکار دەهێنێت و بە پەنجەیەکی پیسەوە ڕووخساری تێکدەدات، هیچ گرینگی بەوەش نادات کە مەعجوون و بودرە بەر دەموچاوی بکەوێت.

بیرم دێت جاران وردەخاڵ ڕووخساری دەنەخشاند، کاتێک سەریم بۆ لای ئەژنۆم وەردەسووڕاند، ئێستاش سوراوێکی دەستکردی ئەستوور ڕووخسارە پاکەکەی داپۆشیوە.

کاتێک **لۆلیتا** لە ئیقاعی دەنگمدا توورەبوونەکەمی هەست پێکرد، لاقە جوانەکەی داگرت و بە کراسەکەی دایپۆشی و خۆی کۆ کردەوە، بەڵام چاوی بە جێگری بڕییە ناو چاوم، چاوەکانی سوور بووبوون بۆ ئەوەی لە دژم بوەستێتەوە، شێوەی ئەوەی پیشان دەدا کە ئەو

**لۆلیتا** بێ دایک و باوکە، ئامادەیە دەسەڵاتدارانم لێ ئاگادار بکاتەوە، بەبێ ئەوەی خۆی سزا بدرێت.

هەرچەندە لە کاتی توورەبوونەکەشمدا بەوەم دەزانی کە چەند بێمێشک و شێتم، بەڵام نەمتوانی توورەییەکەم کۆنترۆڵ بکەم، کە بینیم بەو شێوەیە ڕووبەڕووم بووەتەوە و دەموچاوی بە بۆیە داپۆشراوە و سووراویی لێوەکانی ڕەنگی ددانی سوور کردووە، بە شێوەیەک نەک بە "مۆنیک"ی سێکسفرۆش دەچوو، بەڵکوو بە قەحبەیەکی هەرزەکار دەچوو کە ماوەیەک بەر لە ئێستا لە قەحبەخانەیەکدا لەگەڵی بووم؛ کچێکی بچووک بوو، بەڵام بەرلەوەی من هەڵیبژێرم کەسێک پێش من لەگەڵیدا بوو، رێک هاوشێوەی ئەو دیمەنە هاتە بەرچاوم.

وێنەی بیرەوەرییەکانم لە مێشکی خۆمدا لابرد و **لۆلیتا** بە بێزارییەوە گوتی:

- فەرموو قسە بکە، دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەکەت بە دڵ بوو؟

- بەڵێ، بەڵام گومانم لەوەیە کە هەردووکتان ئەم پیلانەتان بۆم دارشتووە، گومانم لەوەش نییە هەموو شتێکی نێوانمانت بۆ مۆنا باس کردووە.

- ئاوا؟!

کۆنترۆڵی توورەیی خۆمم کرد و بەردەوام بووم لە قسەکردن:

- **لۆلیتا!** دەبێت سنوورێک بۆ ئەم شتانە دابنێین، من ئامادەم لە خوێندنگە دەرت بێنم و بەرەو شارێکی دی بتبەم و لە شوێنێک زیندانیت بکەم کە جگە لەو خودایە کەس پێی نەزانێت، بەڵام پێویستە سنوورێک بۆ ئەم مەترسییانە دابنێین، من ئامادەم بە ماوەی کەمتر لە

ئامادەکردنی جلەکانت، ڕۆحت ئازار بدەم و لەناوی بەرم، پێویست واز بێنی لەم پێشێلکارییانە، ئەگینا کەس نازانێت چیت بەسەر دێت.
- کەس نازانێت چیم بەسەر دێت! ئاوا؟!
کورسییە بزۆکەکەم لەژێر لاقەکانی لابرد، کە دەیهەژاند، هاوارێکی کرد:
- هێێی... لەسەر خۆ.
منیش هاوارم کرد و گوتم بەر لە هەموو شتێک برۆ سەرەوە بۆ ژوورەکەی خۆت، دەستیم گرت و دەستمان بە هاوار کرد و قسەگەلێکی ناخۆشی پێ گوتم. گوتی رقم لێتە و چەندین جار هەوڵت داوە لاقەم بکەی کە کرێچیی دایکم بوویت، گومانیشم لەوە نییە تۆ دایکی منت کوشتووە، ئارەزووم لە سێکسکردن بێت لەگەڵ هەرکەسێدا بێت، تۆ بۆت نییە ڕێم لێ بگری.
پێم گوت برۆ ژوورەکەی خۆت و شتە شاراوەکانتم بۆ ئاشکرا بکە، دەستە لاوازەکانیم گرت، بەڵام ئەو بەرگرییەکی توندی کرد، تەنانەت هەستم بەوە کرد کە خەریکە دەستی دەشکێت، لەگەڵ ئەوەشدا دڵم لەوەدا بوو بتوێتەوە بۆی.
بە نیگایەک سەیری دەکردم کە هەرگیز ئەو نیگایەم بیر ناچێت، نیگای تووڕەبوونێکی سارد و فرمێسکی گەرم بە ڕوومەتیدا دەهاتە خوارەوە، لەو کاتەدا زەنگی تەلەفۆنەکە بە توندی لێی دەدا، بەڵام دەنگەدەنگی شەڕەکەمان زەنگی تەلەفۆنەکەی پۆشیبوو، ئەو تەلەفۆنە لە کاتێکی دراماتیکیدا خۆی هەڵقورتاندە نێو مەسەلەکەوە.
لەو کاتەدا بڕوام بۆ ئەو فیلمانە لا دروست بوو، کە لە کاتێکی ناکاودا تەلەفۆنیان لێ دەدا، بەڵام تەلەفۆنەکە لە یەکێک لە دراوسێکانەوە بوو، گلەیی لە دەنگمان دەکرد، منیش داوای لێبوردنم کرد و گوتم **لۆلیتا** و

هاوڕێیەکانی، هێندە بێباکن ڕێز لە هەستی دراوسێکان ناگرن، هێشتا سەرقاڵی تەلەفۆنەکە بووم، گوێم لە دەنگی داخستنی دەرکەکە بوو، کوا **لۆ**؟ هەڵهات؟

لە پەنجەرەکەوە وەکوو بڵێی فریشتەیەکم بینی بە پەلە لەنێو باخچەکەوە سواری پاسکیلەکە بوو و بەرەو تاریکی هەڵهات.

لەو کاتەشدا ئۆتۆمبێلەکەم تێک شکابوو و لای وەستایەک دامنابوو، ناچار بووم بە ڕاکرن دوای بکەوم و مەترسیی ئابڕووچوونیشم هەبوو.

تا ئێستاش کە سێ ساڵ تێپەڕیوە ناتوانم دیمەنە ناشرینەکەی ئەو شەقامە، بەبێ ترس وێنا بکەم، لەو شەوەدا کە شەوێکی بەهار بوو، هێندێک لە دراوسێکان لە دەرەوە بوون، ناچار بووم لەبەردەم ئەو دراوسێیانەدا ڕاکردنەکەم ڕابگرم، تاکوو گومانیان لا دروست نەکەم، پاشان بەردەوام بووم لە ڕاکرن و هەستم دەکرد کە بە چاوێکی پشکنەرانەی گوماناوییەوە ڕادەکەم، ئەوە دۆزیمەوە؛ گەنجێک لە نیوەی ڕێیەکەدا هاوکاریی دەکات، لەسەر پەرژینە ئاسنەکەدا باوەشی پێدا کردووە- شوکر بۆ خوا هەو نەبوو.

لە کۆتاییدا و دوای نیو میل ڕاکردن، پاسکیلەکەی **لۆلیتام** لەبەردەم دوکانێکی فرۆشتنی ساردەمەنیدا بینی، خۆمم کرد بە دوکانەکەدا، بینیم **لۆلیتا** لە نێوان کابینەکانی تەلەفۆنەکاندا تەلەفۆنی دەکرد، کە منی بینی تەلەفۆنەکەی داخست و بە نازکردنەوە بەرەو من هات و گوتی:

- ویستم تەلەفۆنت بۆ بکەم بۆ ماڵ، بڕیارێکی مەزنم داوە، بەڵام باوکە دەبێت ساردەمەنیم بۆ بکڕی، بەرلەوەی پێت بڵێم.

بۆ کچە خۆشەویستەکەم هەموو ئەو شیرینی و ساردەمەنییانەم کڕی کە داوای کرد، گوێشمان لە قسە خۆشەکانی خاوەن ساردەمەنییەکە گرت، کە بە لۆلیتای گوت جوانە و ڕۆحسووکە.

گەڕاینەوە بۆ ماڵ، بارانیش بەخوڕ دەباری، ئەو لەسەر پاسکیلەکەی بوو، منیش لە تەنیشتییەوە ڕێم دەکرد، گوتی:

- گوێ بگرە، بڕیاری شتێکم داوە، من دەمەوێت دەستبەرداری خوێندن بیم، دووپاتیشی دەکەمەوە ئەو شانۆیەی ڕۆڵی تێدا دەبینم ناگەڕێمەوە سەری، پێویستە ئەم شارەش بەجێ بهێڵین و گەشتێکی دووروودرێژ بکەین، ئەمجارە بۆ شوێنێک دەڕۆین، من دەستنیشانی دەکەم، باشە؟

منیش بە سەرلەقاندنێکەوە وەڵامی بەڵێم پێی دا.

- مافی دەستنیشانکردنی شوێنەکان، دەکەوێتە ئەستۆی من؟

- باشە.

زۆری پێ خۆش بوو، لە خۆشیدا پاسکیلەکەی زۆر بە خێرایی لێدەخوڕی و ڕکابەریی ڕەشەبای دەکرد، لەژێر دارێکدا وەستا و چاوەڕوانی کردم و بە هەموو دەنگێکییەوە هاواری کرد و گوتی:

- هەرچیت بوێت بۆتی دەکەم، ئەو شانۆگەرییەشم هەر نەویست، تێدەگەی لێم؟

هەر کە گەیشتینەوە ماڵەوە لۆلیتا بلووزەکەی داکەند و قژە تەڕەکەی تەکاند و دەستەکانی درێژ کرد و لاقەکانی بەرز کردەوە و گوتی:

- هەڵمگرە و بمبە سەرەوە، حەزم لە سێکسە.

لەوانەیە زانایانی دەروونناسی لەوە باش تێبگەن، لەو کاتەدا بە من بوایە بەشی ڕووبارێک فرمێسک بڕێژم و بگریم.

ئۆتۆمبێلەکەمان لای وەستا هێنایەوە و ماڵئاواییمان لە خوێندنگەی بێردسلی کرد و بە بیانووی ئەوەی گرێبەستێکم لەگەڵ کۆمپانیایەکی سینەمایی بەستووە- لە هۆڵیوود، ناچارین لە ناکاو لەگەڵ **لۆلیتادا** سەفەر بکەین.

بیرۆکەی تێپەڕاندنی سنوور بەرەو مەکسیک ختووکەی دەدام، ئەمڕۆکە من ئازاترم لە ساڵی پار، لەوێ خۆم بڕیار لەسەر خۆشەویستەکەم دەدەم کە ئێستا باڵای ١٦ پێ دەبێت و کێشی ٤١ کیلۆگرامە. **لۆ** زۆر بە تینەوە پلانێکی بۆ گەشتەکەمان کێشابوو.

ئاخۆ ئەو مەزاج و بێباکی و منداڵییەی بە هۆی شانۆوە لە دەست دا و وای لێهاتووە لە ڕێی دۆزینەوەی پەرجووەکانی ژیانەوە پەنجەرەی ئارامیی بدۆزێتەوە؟

لە یەکێک لە ترافیکلایتەکاندا، ئۆتۆمبێلێک لە تەنیشتمان وەستا، ژنێکی باڵاجوانی تێدا بوو (نازانم لە کوێ ئەو ژنەم بینیبوو) سڵاوی لە **لۆلیتا** کرد و ئاوڕێکی لێ دامەوە و جەختی لەسەر قسەیەک دەکردەوە و دەیگوت (بەداخەوە **دۆللی** دەستبەرداری ڕۆڵەکەی بوو، خۆزگە پیرۆزبایی و سەرسووڕمانی نووسەرەکەت دەبینی کە بۆ **لۆلیتای** دەکرد لە کاتی ڕاهێنانەکاندا.)

**لۆلیتا** لەو کاتانەدا گوتی: ئەوە گڵۆپی سەوز هەڵبوو. گەمژە! بەڕێ کەوە.

- کێ ئەو شانۆگەرییەی **لێ ناوە؟**

- ئۆهـ ئەوە ژنێکی پیرە و زۆر ژنێکی باشە، وابزانم ناوی (کلار کیلکشۆز)ە.

- ئەو بوو کە پیرۆزبایی لێ کردیت؟

- بەڵێ چاوەکەم! ماچێکی نێوچەوانە پاکەکەی کردم.
هاوشێوەی هاوارکردنی شانوگەرییەکان بە پێکەنینەوە هاوارم کرد و گوتم:
- **لۆلیتا!** تۆ مەخلووقێکی زۆر سەیری، زۆریش خۆشحاڵم کە حەفتەیەک بەر لە دەستپێکردنی شانۆکە دەستبەرداری بووی. **لۆلیتا!** ئاگادار بە گۆڕانکاریی ناکاو لە پرۆژەکانت ڕووی داوە، پێویستە زیاتر ڕووت لەگەڵم خۆش بێت، پێویستە ئاگاداری خواردنەکەشت بی، چونکە من و تۆ دەستمان بە گەشتێکی درێژخایەن کردووە.

## ١٦

سەرلەنوێ دەستمان بە گەشتێکی تر کرد و لە هۆتێلێکەوە بۆ هۆتێلێکی دی دەڕۆیشتین. لە هەر شوێنێک وەستابایەن، تابلۆیەک بەخێرهاتنی دەکردین، بە شێوەیەک سەرنجی مرۆڤی بۆ خۆی ڕادەکێشا، شێوازێکی تایبەت بوو بە ئەمەریکییەکان.
بەخێر بێن، ژمارەی ئۆتۆمبێلەکەمان تۆمار کردووە، (ئاگاداری میوانەکان دەکەینەوە کە بەبێ پێدانی پارە هەڵنەیەن)، دەتوانن بە ئارەزووی خۆتان ئاوی گەرم بەکار بهێنن، مافی ئەوەمان هەیە هەر میوانێکی نەشیاو دەربکەینە دەرەوە، بە بێ ئەوەی ئاگاداری بکەینەوە، چونکە میوانەکانی ئێمە میوانی بەڕێزن و لە زۆربەی وڵاتانی جیهانەوە سەردانمان دەکەن... هتد.
لەوشوێنە ترسناکانەدا هەمیشە (١٠) دۆلارمان دەدا بۆ ژوورێک- بە تەختەخەوێکی دووکەسییەوە، لەسەر پەنجەرەکانیش مێشەکان ڕیزیان گرتبوو و بە هەموو شێوەیەک هەوڵی ئەوەیان دەدا بێنە ژوورەوە،

سەرینەکانیش هێشتا قژ و قژبەستی ئەو کەسانەی پێوەبوو کە شەوی پێشووتر لەسەری خەوتووبوون.

لەگەڵ ئەوەشدا مەترسیی دزیکردنمان لەسەر نەبوو، چونکە هەمیشە دەمانچەیەکم پێبوو کە لە دایکی **لۆلیتا**وە بۆم مابووەوە، کۆمەڵێک ڕاسپاردەشی لەخۆ گرتبوو سەبارەت بە چۆنێتیی بەکارهێنانی و نووسرابوو ئەم دەمانچەیە بۆ بەکارهێنانی ناوماڵ و ئۆتۆمبێل دەشێت و دەکرێت مرۆڤ لەگەڵ خۆی هەڵی بگرێت.

ڕاهێنانم لەسەر دەمانچەکە کردبوو و دەمتوانی هەر ئامانجێکی بزۆکیش بپێکم.

## ١٧

گەشتەکەمان بەرەو ڕۆژئاوای ویلایەتە یەکگرتووەکان دەست پێ کرد، بەڵام کەشی گەشتەکەمان بە پێی ویستی من نەبوو، چونکە دڵنیا نەبووم، هەستم کرد **لۆلیتا** لە دوو بۆنەدا دوو پێوەندیی تەلەفۆنی بۆ کەسانی نەناسراو کرد و لەوانەشە باسی لە پێوەندییەکەی نێوانمان کردبێت.

جارێکیان ڕۆنی ئۆتۆمبێلەکەم دەگۆڕی و بەنزینم تێدەکرد، **لۆلیتا** بە بیانووی چوونە سەرئاو بەجێی هێشتم و ماوەیەکی زۆری پێچوو و بیرم هەر لای بوو، بەڵام ئەوەشیان یەکەم و دواجاری نەبوو کە وا بکات، هەمیشە بە نیگەرانی و ڕاڕاییەکی زۆرەوە سەیری چەپۆڕاستی خۆمم دەکرد، بەڵام **لۆلیتا** وا دەردەکەوت وەکوو بڵێی کەسێک لە ناوچەی (چیستنات کورت)ەوە بە دواوەیەتی.

لۆلیتا ویستی ڕێیەکەمان لە شاری (کاسبیم)ەوە تێپەڕ ببێت، چونکە تەنیا ٣٠ کیلۆمەتری نێوان بوو لەگەڵ زێدی خۆیدا، ڕازی بووم و ڕۆیشتم لەگەڵی، بۆ بەیانییەکەی هەستم کرد نیگەرانە و دۆخی جێگیر نییە و ئارەزووی نییە شوێنی یاریکردنی منداڵی خۆی ببینێت، کە ماوەی پێنج ساڵە نەیبینیوە.

بە هۆی هێندێک هۆکاری ڕوونەوە هەستم کرد ترسێک لە دڵی لۆلیتادا هەیە لەو سەردانە ناکاوەدا، پێشتریش بڕیاری ئەوەمان دابوو کە کار بۆ ئەوە بکەین، کەس نەمانبینێت و بە شوێن هاوڕێ کۆنەکاندا نەگەڕێین. بەڵام ئەو بڕیارەکەی گۆڕی و منیش خۆشحاڵ بووم بە بڕیارەکەی، گوتی دەیەوێت لەناو جێدا بمێنێتەوە لەگەڵ گۆڤارەکانی دا بێت، چونکە هەست بە ناساغی دەکات، داوای کرد میوەی بۆ بکڕم، بۆیە بڕیارم دا بڕۆمە بازاڕ.

لە شارەکەدا سەرم چاک کرد و هێندێک پێداویستیم کڕی و دوای سەعاتونیوێک گەڕامەوە بینیم کارگوزارەکان ڕێڕەوەکان پاک دەکەنەوە، هۆتێلەکەش هۆتێلێکی لادێیی بوو، بریتی بوو لە هێندێک ژووری بچووک، لە نێزیک ژوورەکەمانەوە کوڕێکی لووتبەرزم بینی، کەرەستەیەکی بەرەو ئۆتۆمبێلێک دەبرد و بە بزەوە سڵاوێکی بۆ کردم و هەستم بە نائارامی کرد.

چوومە ژوورەکەی خۆمان و لۆلیتام بینی تووشی شۆک بووم، لەسەر لێواری جێخەوەکەدا دانیشتبوو و کراسە تەسکەکەی، جوانییەکانی سینگی دەرخستبوو، هەرچەندە هێشتا خۆی نەشووشتبوو، بەڵام لێوی سوور کردبوو و ددانەکانی بەو سووراوە سوور بووبوون، دەستی خستبووە باوەشی- بە بریقەیەکی

شەیتانییەوە، نیگایەکی هیوابەخشانەی بۆ ئاراستە کردم، بەڵام ئەو نیگایە بۆ من نەبوو.

زەرفی میوەکەم دانا و بینیم قاچەکانی بە قوڕەوەیە، پێم گوت:

. لە دوای من چوویتە دەرەوە؟

. ئێستا لە خەو هەستاوم لە دەرکەکەوە سەیرم دەکرد، وامزانی تۆ هاتیتەوە.

زەرفی میوەکەی بینی، ڕووی کردە مێزەکە، بەڵام نێچیری گومانەکانم تەمومژاوی بوو، سەیری قوڕی نەعلەکانیم کرد، بەبێ ئەوەی وشەیەک بڵێم، پرسیاری ئەوەم بۆ هات ئایا خیانەتی لێ کردووم، بزەی گەنجەکەم بیر کەوتەوە کە کەرەستەکەی بەرەو ئۆتۆمبێلەکە دەبرد، بە پەلە چومە دەرەوە، بەڵام کوڕەکە و ئۆتۆمبێلەکەش دیار نەمابوون.

**لۆلیتا** لە ژوورەوە هاوری کرد و گوتی:

. ئەوە چیتە بۆ کوێ دەڕۆی؟

هیچم پێ نەگوت، دەستیم گرت و قەمیس و تەنوورەکەم لەبەری داکەند ڕووتم کردەوە و بەدوای شوێنەواری خیانەتەکەی گەڕام، بەڵام ئەوەی بە دوایدا دەگەڕام بە کەسێکی وەکوو من ئاشکرا نەدەبوو.

## ١٨

ئۆتۆمبێلێکی سووری بانکراوەم بەدی کرد، دوامان کەوتبوو. زۆر بە هەڵچوون و مەترسییەوە تێبینیم دەکرد. لە سەرەتادا هەستم کرد عاشقی **لۆلیتا** بووە و دوامان کەوتووە بۆ ئەوەی ئەو کاتانەی کە

دوورم لە **لۆلیتاوە** هەلێک بقۆزێتەوە. مەترسی و بیرکردنەوەکان ناخی دەهەژاندم، لەوانەیە ئەوە پۆلیس بێت و بیەوێت لێکۆڵینەوە لە بارەی رەفتارەکانمەوە بکات لەگەڵ ئەم هەرزەکارەدا.

جارێک گومانی ئەوەم لا دروست کە هەردووکیان، یاخود **لۆلیتا** بەتەنیا، مادەیەکی سڕکەری کردووەتە نێو خواردنەکەمەوە، چونکە سەرم قورس بوو و خەوم لێکەوت، بەڵام لە نیوەشەودا بە دەنگی دەرکە خەبەرم بووەوە. بە رووتی رامکرد و **لۆلیتام** بینی نیمچەڕووت بوو و لەسەر جێیەکەی بوو، لە تاریکییەکەشدا پیاوێک ماسکێکی چینی لە ڕووخساری بەستوو و پێکەنینێکی ناشرینی بۆ کردم، بەڵام بۆم دەرکەوت ئەو شەوە بۆنەیەکی تایبەت بوو، ئەو ماسکەیان لە دەموچاویان دەکرد، بەڵام من گومانم نەبوو لەوەی سڕ کرابووم.

هەرچەندە بەم هزرە لاوازەمەوە ناتوانم ئەو ڕۆژە دیاری بکەم، کە دڵنیا بووم لەوەی ئۆتۆمبێلە سوورەکە دوامان کەوتووە، بەڵام بیرم دێت کە یەکەم جار ڕووخساری شۆفێرەکەم بە ڕوونی بینی.

ئۆتۆمبێلەکەم لێ دەخوڕی و باران بە خوڕ دەباری و فریشتە سوورەکەش دوامان کەوتبوو، بە شێوەیەک هیچ هەلێکی بۆ هەڵهاتن نەدەدا، وەکوو نەخۆشیی شێرپەنجەی جەرگ بوو، لە یەکێک لە ویستگەکانی بەنزیندا وەستام بۆ پڕکردنی بەنزین و چاویلکەیەکی بەرهەتاویشم کڕی، بینیم ئەو کەسەی دوامان کەوتووە ئۆتۆمبێلەکەی لە نێزیک قاوەخانەیەک ڕاگرتووە. کاتێک چوومە گەنجینەی ویستگەکەوە- بۆ کڕینی چاویلکەیەک- تەماشایەکی پشتەوەم کرد، دیمەنێکی زۆر ترسناکم بینی، ئەو کەسەی دوامان کەوتووە بە دەموچاوێکی پان و جەستەیەکی پیر و سمێڵێکی ئەستوورەوە، پانتۆڵێکی قاوەییی تۆخی لەبەر بوو، گوێی لە **لۆلیتا** دەگرت و ئەویش

سینگی لە جامەکەوە دەرکردبوو و بە پەلە قسەی بۆ دەکرد و دەستیان هاوبەش بووبوو لەگەڵ قسەکردنی زمانیان. **لۆلیتا** زۆر بە جددییەوە قسەی دەکرد، بەڵام ئەوەی تووشی سەرسوورمانی دەکردم شێوەی قسەکردنی بوو لەگەڵ ئەو پیاوەدا، وا بۆی دەدوا کە کەسێکی نیزیکی بێت؛ ئولفەتێکی نامۆیان لە نێواندا هەبوو، وەکوو بڵێی چەند حەفتەیەکە یەکدی دەناسن.

دواتر بینیم چەنەی خوراند و سەری بۆ لار کردەوە و گەڕایەوە بۆ ناو ئۆتۆمبێلەکەی خۆی، پیاوەکە لە تەمەندا هاوتەمەنی من دەبوو، شێوەی بە (گۆستاف تراب) دەچوو، کە ناسیاوێکی باوکمە لە سویسرا، کاتێک گەڕامەوە بۆ لای ئۆتۆمبێلەکەم، **لۆلیتا** سەرقاڵی نەخشەکە بوو بۆ دۆزینەوەی ڕێیەکە.

پرسیارم لێی کرد:

- ئەو پیاوە پرسیاری چی لێت کرد؟

- کامە پیاو؟ ئەها ئەو پیاوە، نازانم پرسیاری نەخشەی کرد، پێم وابێت ڕێی ون کردبوو.

دواتر کە بەڕێ کەوتین، لە ناکاو گوتم:

- گوێ بگرە **لۆلیتا**، نازانم درۆ دەکەی یان ڕاست، گرینگ نییە لام، بەڵام ئەو پیاوە بە درێژایی ئەمڕۆ بەدوامانەوەیە، ئۆتۆمبێلەکەی لە حەوشی پشتەوەی هۆتێلەکە ڕاگرتبوو، پێم وابێت پۆلیسە، خۆت دەزانی چی ڕوو دەدات و چیت بەسەر دێت ئەگەر پێمان بزانن، بۆیە بۆ بەرژەوەندیی خۆت و بەرژەوەندیی من دەمەوێت بزانم چی پێت گوت و چیت پێی گوت.

- ئەگەر پۆلیس بوایە خراپترین شت ئەوەیە کە ترسی خۆمانی پێ پیشان بدەین، لێگەڕێ باوکە.

- پرسیاری لێت کرد بۆ کوێ دەڕۆین؟
بە گاڵتەجارییەوە گوتی:
- خۆی دەزانێت بۆ کوێ دەڕۆین.
ناچار بووم قایل بم بە دۆخەکە و گوتم:
- ڕووخساریم بینی بە کورەمامێکم دەچێت ناوی (تراب).
- لەوانەیە (تراب) بێت، سەیری پێوەری ئۆتۆمبێلەکە بکە لە ژمارە ٩ەوە دەگەڕێتەوە بۆ سفر، کە منداڵ بووم وامدەزانی چەرخەکان لە ژمارە ٩ دەوەستن.
ئەوە یەکەم جاری بوو، باسی منداڵیی خۆی بکات، لەوانەشە ئەوە فێڵێک بێت و لە ڕاهێنانەکانی شانۆگەرییەکەدا فێری بووبێت بۆ ئەوەی بابەتەکە بگۆڕێت.
ئەو ڕۆژەمان بەبێ راوەدوونان بەڕێ کرد، بەڵام راوەدوونان لە ڕۆژی دواتردا دەستی پێ کردەوە، وەکوو پەتای نەخۆشییەک هاتەوە، جووڵەی هاتوچۆ لەسەر ڕێ شاخاوییەکان لەو ڕۆژەدا کز بوو. لە دوورەوە دوامان کەوتبوو، هیچ ئۆتۆمبێلێکیش نەکەوتە نێوانمان، لە ئاوێنەکەوە سەیری ڕووخسارە ساردەکەیم دەکرد، وەکوو پەیکەر بوو، بە شێوەیەک ئۆتۆمبێلەکەی لێدەخوڕی وەکوو ئەوەی بەنێکی ئاوریشمیی نادیار ئۆتۆمبێلەکەمانی پێکەوە گرێ دابێت، بە درێژاییی کاتەکە هەستم بە ڕووناکییەک دەکرد لەلای ڕاستمەوە کە لە **لۆلیتاوە** پێم دەگەیشت، ڕوومەتەکانی سوور هەڵدەگەڕان و چاوەکانی بریقەی شادییان دەبەخشی.
بە شارێکی قەرەباڵغدا تێپەڕبووین. کاتێک لە شارەکە دەرچووین لەبەر چاوم ون بوو، هێندەی پێ نەچوو، **لۆلیتا** بە بێزارییەوە گوتی:

- کارێکی گەمژانەیە ئەگەر گومانەکەت ڕاست بێت و هەوڵ بدەی هەڵبێی لە دەست ئەو کوڕە مامەت.
- من لە ڕوویەکی ترەوە بیری لێدەکەمەوە.
کاتێک نیگاکانی منی بینی کە پڕە لە مەبەست، گوتی:
- تۆ کەسێکی زۆر خراپی، ئەگەر دەتوانی، لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر بکە.
ئەو گەشتەمان بە شەوێکی ناخۆش بەڕێ خست، لە هۆتێلێکی خراپ و ساردا ماینەوە، باران و زریانیش لە دەرەوە هاژەهاژیان دەهات. **لۆلیتاش** لە دەنگی هەورەبرووسکە دەترسا، ئەو ترسەش بۆ من خۆشی و ئارامیی دەبەخشی.

## ١٩

لە کاتی گەشتەکەماندا بە پۆستی شاری (ویس)دا تێپەڕ بووین، بۆ ئەوەی نامەکانمان لە پەنجەرەی پۆستەکانەوە وەربگرین، چونکە پێشتر نووسینگەی پۆستی ویسمان وەکوو ئەدرەسی خۆمان دیاری کردبوو، دوو نامەمان بۆ هاتبوو، یەکێکیان بڕوانامەکەی **لۆلیتا** بوو، ئەوی دیکەشیان لە زەرفێکدا بوو، دیمەنێکی تایبەتی هەبوو، کردمەوە و تەماشای ناوەڕۆکەکەیم کرد، وام لە خۆم کرد کە من کارێک دەکەم **لۆلیتا** پێی ئاساییە و شانم نا بە کۆشکی ڕۆژنامەفرۆشەکەوە و نامەکەم خوێندەوە.
نامەکە لە کچێکی هاوڕێی **لۆلیتاوە** هاتبوو، باسی لە سەرکەوتنی شانۆکە دەکرد و تێیدا باسی لەوەش کردبوو کە نووسەری شانۆکە ئامادە نەبوو، باسی لە خۆی کردبوو، گوایە دوو ڕۆژی تر دەڕوات بۆ نیویۆرک و کەسوکاریشی گەشتی ئەورووپا دەکەن، لە کۆتاییی

نامەکەشدا باسی لەوە کردبوو کە جارێکی دی ناگەڕێتەوە بۆ بێردسلی، چونکە دایکوباوکی بە نیازن لە خوێندنگەیەکی شاری پاریس ناونووسی بکەن.

کاتێک تەواو بووم لە خوێندنەوەی نامەکە، ویستم لە **لۆلیتا** بپرسم کێ خاوەن ئەم نامەیەیە، شانێکی هەڵتەکاند و دیار نەما.

لە کارگوزارێکی پشتکۆمم پرسی، گوتی وابزانم ئەو کچە هاوڕێکەی بینی و بەڕاکردن ڕۆشت بۆ لای و منیش بەو لایەنەدا ڕامکرد کە کارگوزارەکە ئاماژەی بۆ کرد، بەڵام **لۆلیتا** دیار نەبوو.

تۆ بڵێی بۆ هەتاهەتایە بزر بێت؟

لە دوای ئەو ڕووداوە بۆ چەند ساڵێک تووشی سەرسووڕمان بووم، **لۆلیتا** لەو ڕۆژەدا بۆچی بۆ هەتاهەتایە هەڵنەهات، ئایا هۆکارەکەی بۆ کراسی مەلەوانییەکی بوو دەگەڕێتەوە، کە لە سندووقە هەمیشەکڵۆمدراوەکەی ئۆتومبێلەکەدا هەڵمدەگرت، یاخود هەڵهاتنەکەی بەشێک بوو لە پلانێکی گشتی.

لەو کاتەدا هەستم بە هیچ شتێک نەکرد جگە لەوەی کە بۆ هەتاهەتایە جێی هێشتم، وا هەستم دەکرد چیاکانی دەوری شارەکە لار دەبنەوە و پێکەنینیان بە ڕووخسارم دێت، بەردەکان شێوەی **لۆلیتایان** وەردەگرت و لەناو دەچوون و دەبوونەوە بەرد.

لە هەموو شوێنێک بۆی گەڕام؛ لە قاوەخانەکە، چێشتخانەکە، ئارایشتگەکە، ساردەمەنیفرۆشییەکە، دوکانە بچووکەکە، تاوێک لە ئۆتومبێلەکەمدا دانیشتم و چوومە باخچە گشتییەکە، لە ناکاو گوتم هەمبەرت تۆ زۆر گەمژەی، **لۆلیتا** لە ماوەی یەک خولەکدا دەگەڕێتەوە. دواتر بینیم بەڕاستی هاتەوە.

- ئەو کولای خوارد و منیش تەنیا ئاوم خوارد.
- باشە هەردووکتان لەو شوێنە بوون؟
- بێگومان.
- باشە با بڕۆینەوە بۆ ئەوێ و شتێکی تر بخۆینەوە.
- ڕاوەستە شوێنەکە لێرەوە زۆر دوورە.
- کێشەیەک نییە، سەر بە هەموو دوکانەکاندا دەکەین تاکوو ئەو دوکانە دەدۆزینەوە.
- نەفرەتت لێ بێت.
- گوێ بگرە **لۆلیتا**، زماندرێژییەکەت دادت نادات.
- باشە بەڵام تۆش ناتوانی بە داوێک بمگری، بۆیە ئێمە هیچمان نەخواردەوە، تەنیا پێکەوە قسەمان دەکرد و سەیری جلوبەرگی نێو دوکانەکانمان کرد.
- لە چ دوکانێک سەیرتان دەکرد؟
- بۆ نموونە ئا ئەو دوکانە.
- با بچین لە نزیکەوە سەیری بکەین، ئەم پێچوپەنایەی بۆ چییە پێویستە باش بزانی کە ژمارەی ئەو ئۆتۆمبێلەم نووسیوە کە دوامان کەوتووە، ئەوەتا لە دەفتەری تەلەفۆنەکاندا تۆمارم کردووە.
دەفتەرەکەم کردەوە، ئای چ کەرێکم، ژمارەکەم نەنووسیبوو و تەنیا دوو ژمارەشیم لەبیر مابوو، دەرئەنجام دەفتەرەکەم داخست و بە ئۆتۆمبێلەکەم زۆر بە خێرایی لە شاری ویس دەرچووم و دوای چوار میل لە شوێنێکدا وەستام و سەیرێکی **لۆلیتام** کرد، ئەویش بزەیەکی کرد، بەبێ ئەوەی ورتەم لێوە بێت، شەپازلەیەکی بەهێزم لێ دا و شوێندەستم پەڵەیەکی ڕەشی لەسەر ڕوومەتی دروست کرد.

بەردەوام بووم لە ڕێیەکەم، ئەویش هەنسکی دەدا، منیش هەستم بە ئازاری ناوەوەی خۆم دەکرد، کاتێک کە گەیشتینە میرانا، نوقمی خۆشەویستیم کرد، تەنیا لە پێناو ئەوەی ئاشتی بکەمەوە، تەنانەت گەیشتە ئەو ئاستەی کە نینۆکە زەردە درێژەکانی پێیشیم ماچ کرد، بەڵام بێسوود بوو، قەدەر حوکمی ئەوەی کردبوو کە کۆتاییمان پێی بێت، قەدەر بڕیاری ئەوەی دابوو بکەومە ڕەهێڵەیەکەوە لە ئازار و ئەشکەنجە.

بیرم چوو باسی ئەوە بکەم، کاتێک لە شەقامەکانی شاری ویسدا بووین، وەک چۆن بڵێی ئەو ئۆتۆمبێلە سوورەم بینی، بەڵام چوار گەنجی تێدا بوو، نەک (تراب)ی خاوەنی.

لە دوای شاری ویس حاڵەتێکی باشم تووش بوو، بۆ ماوەی دوو ڕۆژ هەستم بەوە کرد کە کەس دوامان نەکەوتووە، بەڵام هێندەی پێ نەچوو، هەستم کرد (تراب) پلانەکەی گۆڕیوە و بە ئۆتۆمبێلێکی دیکەوە، کە بە کرێ گرتوویەتی، دوامان کەوتووە.

ئەو پیاوەی دوامان کەوتبوو ئەژدیهایەک بوو بۆ خۆی، هەر جارناجارێک ئۆتۆمبێلەکەی دەگۆڕی، بۆیە وام لێهاتبوو سامم لە هەموو ئۆتۆمبێلێک دەکرد کە بەشوێنمانەوە بوایە، پێویست بوو بەئاگابم لەو پیاوە سمێڵدار و کەچەڵی سوورە، وای لێ کردم چاودێریی هەموو ئۆتۆمبێلێک بکەم، ئەگەر لە پاشمان بوایە یاخود لە پشتمەوە بوایە.

کاتێک گەیشتینە ڕێیەکی شاخاوی، لە نێوان (سفۆ) و (چامپیۆن)دا، دیمەنێکی ڕوونی ئۆتۆمبێلێکی شین هاتە بەرچاوم، (تراب) لەنێو ئەو ئۆتۆمبێلە بوو، بە پێی ئیقاعی دڵم ئۆتۆمبێلەکەم لێدەخوڕی، بۆیە

ئۆتۆمبێلەکەم چەپوڕاستی زۆر دەکرد، **لۆلیتا** بە ڕووخسارێکی خۆشەوە گوتی:

- هیی تۆ، یەکێک لە تایەکانت پەنچەر بووە.

کە وەستام **لۆلیتاش** هاوسەنگیی تێک چوو و لەگەڵ وەستانەکەدا تەکانی پێ دا، دابەزیم و تایەکانم پشکنی، بینیم یەکێک لە تایەکانم پەنچەر بووە، لێرەدا (تراب)م بینی بە دووریی ٥٠ یاردە وەستابوو، ڕووخسارە ئەسمەرەکەی لەو ڕۆژی نیوەڕۆیەدا وەکوو نوختەیەکی عەنبەر بوو.

ئەوەم بە هەل زانی، بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی ببمەوە، ڕووم لێی کرد و بەنیاز بووم داوای جەگی لێ بکەم، هەرچەندە جەگیشم پێبوو، بەڵام ئەو بەرەو دواوە ڕۆیشت، لەو کاتەشدا ئۆتۆمبێلێک زۆر بە خێرایی تێپەڕی، هەتا تۆزوخۆڵی ئەو ئۆتۆمبێلە نیشتەوە، گوێم لێبوو ئۆتۆمبێلەکەی منیش بەرەو دواوە دەڕوات و هاند برێکەکەیم ڕانەکێشابوو، بەخێرایی بۆ ئۆتۆمبێلەکەم ڕۆیشتم، ئاواتی ئەوەشم دەخواست کە بەڵکوو **لۆلیتا** لە ماوەی ئەم دوو ساڵەدا شتێک لە ئۆتۆمبێل فێر بووبێت و ڕایبگرێت، هەتا پێی گەیشتم، ئۆتۆمبێلەکە وەستا، هەستم کرد **لۆلیتا** بە فێڵ ئۆتۆمبێلەکەی جووڵاندەوە بۆ ئەوەی دوای (تراب) نەکەوم، بەڵام (تراب) پێش ئەو ڕووداوە پێچی کردەوە و ڕۆیشت و لەبەر چاو ون بوو.

لە گەشتە مەترسیدارەکەمان بەردەوام بووین، جۆرەها بیرۆکەی خراپم بۆ دەهات، هەستێکی وام لا دروست بووبوو، کە من بۆ ئەوە خوڵقاوم تاوانێکی کوشتن ئەنجام بدەم، هەستەکان بەرەو شێتییان دەبردم. بیرم لەوە کردەوە دەمانچەکەم لەنێو دەشبولەکە دەربکەم و بەردەوام لە گیرفانم دایبنێم، بۆ ئەوەی هەرکاتێک شێتییەکەم گرتمی، سودوی لێ وەربگرم.

## ٢٠

بێگومان من زۆر گەمژە بووم کە ڕێم بە **لۆلیتا** دا لە بواری نواندندا بخوێنێت، چونکە ئەوە وای لێ کرد فرتوفێڵی زۆرم لەگەڵدا بکات و بە خێرایی درۆ و بیانوو ئامادە بکات.

هەرچەندە **لۆلیتا** تەمەنی گەورە بوو، بەڵام هێشتا وەکوو پەرییەک لە جاران لەبەردڵانتر بوو، دەست و پەنجە ڕەنگقەیسییەکانی دەدرەوشایەوە، هێشتا قەشەنگ و ڕۆحسووک و بزاوتی ورووژێنەر بوو، هێشتا وەکوو هەرزەکار بیری دەکردەوە و ئارەزووی نواندنی زیاتر لە مەلەکردن و یاریی تێنس بوو، تا ئەوکاتیش ڕکابەرێکی بەهێز بوو، هەمیشە هەوڵی دەدا لە یارییەکانی تێنسدا لێم بباتەوە، زۆر بە سادەییەوە یاریی دەکرد، بە شێوەیەک هەر یاریزانێک هەبوایە دەیتوانی لێی بباتەوە.

بیرم دێت لە بۆنەیەکدا کە لە یاریگەی تێنسی هۆتێلێک بووین، یاریی تێنسم لەگەڵی دەکرد و چێژم لە هێڵەکانی جەستەی وەردەگرت کە یاریی دەکرد، کاتێک ئاوی دەخواردەوە سەیریم کرد و هەستم بە سۆزێک کرد، لەو کاتەدا گەنجێک بە کراسێکی سوورەوە نێزیکم بووەوە و خۆی بە (بێڵ) ناساند و هاوڕێ (ڤای بیچی) هونەرمەند بوو و پێشنیاری ئەوەی کرد پێکێک ویسکی بخۆینەوە و ئاماژەیەکی بۆ هاوڕێیەکەی کرد کە لەگەڵ **لۆلیتا** قسەی دەکرد.

لەوەدا بوو داوای لێبووردن بکەم، گوێم لە دەنگی گەنجێک بوو لەنێو هۆتێلەکەوە بانگی کردم و گوتی: پێوەندیەکی تەلەفۆنی زۆر بەپەلەت بۆ هاتووە لە دەرەوەی وڵاتەوە، چاکەتەکەم لەبەر کرد و دەمانچەکەی گیرفانم پشکنی و بە **لۆلیتام** گوت ئێستا دێمەوە، ئەویش بە بزەیەکەوە وەڵامی دامەوە.

لەو کاتەدا کە دوای ئەو گەنجە کەوتم بۆ تەلەفۆنەکە، ئارامییەکی تۆقێنەر دڵی داپۆشیم، پرسیاری ئەوەم دەکرد، ئایا ئاشکرا بووین و کۆتاییمان پێ هات، بەلام بەردەوام دەبم و رێ نادەم ئازیزەکەمم لە دەست بدەن، بیرم لەوە دەکردەوە کە خۆم بیکوژم باشترە لەوەی بکەوێتە دەست کەسێکی ترەوە.
کە گەیشتمە نووسەری هۆتێلەکە، گوتی، ئەو کەسەی کە تەلەفۆنی بۆ کردم هێلەکەی پچڕی و داوای کردووە کە من تەلەفۆنی بۆ بکەمەوە و ئەو پێوەندیەش لەلایەن بەڕێوەبەری خوێندنگەی بێردسلیەوە بووە و ژمارە ٦٨٢٨٢ی پێ داوە و گوتوویەتی کارێکی زۆر بەپەلە و گرینگی بە من بووە.
رووم کردە کابینەی تەلەفۆنەکە و ژمارەکەم داوا کرد و چاوەڕێم کرد، لە رێرەوەکەدا دەهاتم و دەچووم، لە ناکاو بیرم کەوتەوە کە بەڕێوەبەرەکە ئێستا لە ئەورووپایە و هیچ مەخلووقێک لە بێردسلی نازانێت من لەم شوێنەدام، داوام لە نووسەرەکە کرد لێکۆڵینەوەیەکم بۆ بکات، ئایا ئەو پێوەندییە بەڕاستی لە بێردسلییەوە بووە، دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەکە زۆر بە خێرایی هاتەوە و دەرکەوت کە ڕاست نییە، واتا ئەمە فێڵە و لە من دەکرێت، چونکە پێوەندییەکە ناوخۆ بووە و لە دەرەوەی وڵاتەوە نەبووە.
بە هەنگاوی قورسەوە ڕووم کردەوە یاریگەکە و لە یەکەم پەیژەدا چاوم بە **لۆلیتا** کەوت لەگەڵ گەنجێکدا یاریی دەکرد و بە تێنسەکەی لەنێو لەپی خۆی دەدا و بە زمانی خۆش لەگەڵ **لۆلیتا** قسەی دەکرد، ئەو گەنجە سەری لاکێشەیی وەکوو هێلکەیی بوو و شۆرتێکی خاکی لەبەر کردبوو، کە چاوی بە من کەوت تێنسەکەی دەستی فڕێ دا و

بەرەو ئۆتۆمبێلەکەی هەڵهات، زۆر بە خێرایی خۆی و ئۆتۆمبێلەکە لەبەرچاوم ون بوون.
کە گەیشتمە نێو یاریگەکە، پرسیارم لە مستەر (مید) کرد، ئەو گەنجە کێ بوو؟
مید سەری لەراندەوە و گوتی:
- ئەوە کەسێکی خۆهەڵقورتێنەر بوو و خۆی هەڵقورتاندە نێو یارییەکەوە و دواتر ڕۆیشت.
تێنسەکەم بە دەستمەوە گرت، هێشتا گەرمیی دەستی ئەو گەنجە بۆگەنە بە تێنسەکەوە مابوو. **لۆلیتام** بەرەو هۆتێلەکە بردەوە. لە ڕێڕەوەکەدا هێندێک درەخت هەبوو، خەریک بوو لە پاڵ ئەو درەختەدا شەپۆلی گریان بە سینگی **لۆلیتادا** بتەقێنم و داوای لێبکەم ئەو ڕووداوانەم بۆ ڕوون بکاتەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو کردەوەیەم هێندەی تر ببێتە مایەی گاڵتەجاریی ئەو و زیاتر توندوتیژ بێت لە ئاستم و ببێتە هاندەرێک کە زیاتر یاریم پێ بکات، لەوەدابووم ئەو کردەوەیە بکەم، بەڵام چەند کەسێکم بەرچاو کەوتن لە پاڵ درەختەکان دانیشتبوون، لەوێدا (بێل) و (فای) پێشم کەوتبوون و پێدەکەنین، کە ئێمە گەیشتین، ئەوان کۆتاییان بە نوکتەیەک هێنابوو!
گرینگ نییە، ئەم کارە بۆ جارێکی دی دوا دەخەم.
هەر کە گەیشتینە ژوورەکەمان **لۆلیتا** گوتی دەمەوێت ڕۆژەکەم لە مەلەوانگە تەواو بکەم.
- بەڵێ باشە، جوانییەکەت ڕکابەریی جوانیی ڕۆژەکە دەکات.

## ٢١

ـ لۆ... لۆلا... **لۆلیتا.**

گوێم لە دەنگی خۆم بوو لە دەرکەی هۆتێلەکەوە بە ترس و ئازار و ڕاڕاییەکی زۆرەوە بە ناوییەوە هاوارم دەکرد، بۆ دواجار لەنێو ئاوی مەلەوانگەکەوە دەرچوو، پێش ئەوەی جلی مەلەکردن لەبەر بکەم، ئەو دەرچوو و لەبری ئەوەی یاریی لەگەڵ مندا بکات، یاریی لەگەڵ سەگێکدا دەکرد.

بە ڕۆبەکەوە چوومە دەرەوە، تەنیا مەبەستم ئەوە بوو شوێنەکەی بزانم، چونکە بەم حاڵەوەتوانای مەلەکردنم نەبوو. لە هاوارکردن وەستام و دەستم کرد بە سەیرکردنی، ئەویش بە مایۆیەکی سوورەوە ڕای دەکرد و خۆی لار دەکردەوە، لە جووڵەکانیدا سروشتێکی خۆشی و شێتیم بەدی دەکرد، بە شێوەیەک لە کچێکی بچووکی دڵخۆش زیاتر بوو، تەنانەت سەگەکەش سەرسام دیار بوو لە جووڵەکانی، کە ئارەزووەکانی دەردەخست.

دەستی ماندووم خستە سەر سینگم و چاودێریی دۆخەکەم دەکرد و وامزانی مەلەوانگە شینەکە بووەتە بەشێک لە بوونی من، وامدەزانی ئەندامەکانی جەستەم وەکوو سەدەفی سەر زەریای ڕیڤێرای فەڕەنسی مەلە دەکەن.

کەسێکم بینی لەوانەی کە لە مەلەوانگەکەوە دەرچوون، لە سێبەرێکدا بە نیمچەخۆشاردنێکەوە سەیری **لۆلیتای** دەکرد، لە پشت پەردەی ڕووناکی و سێبەردا وەستابوو، پەردەیەک بوو شێوەی خۆی تێدا تەمومژاوی کردبوو، قژی سەریشی تەنیا لە تەنیشتەکانییەوە هەبوو، تەماشای ڕووخساری ئەو کەسەم کرد کە بەچێژەوە دیڕوانییە کچەکەم، هەستەکانی ماندووی کردبوو و شانی نا بە ستوونێکەوە،

**لۆلیتاش** هەر بەردەوام بوو لە یاریکردن لەگەڵ سەگەکەدا و لاقەکانی لە حەوا کردبوو.

بە درێژاییی کاتەکە ترسم لەو گەنجانە بوو کە گریان لە خەیاڵی **لۆلیتا** داگیرساندبوو، بەڵام کاتێک خۆرەکە کز بوو بینیم کەسێکی مەترسیدار نەبوو، تەنیا مەخلووقێکی بێبەها بوو، شێوەی بە (تراب)ی ئامۆزام دەچوو کە لە سوێسرایە. بە ماستەوە بیرەی دەخواردەوە.

لە ناکاو **لۆلیتا** لە یاریکردن وەستا، هەستم کرد سەگەکەش دڵی شکا کە ئەو وەستا.

ڕووم کردە **لۆلیتا** بۆ ئەوەی شتێکی پێ بڵێم، بەڵام لەنێو چیمەنەکە ڕاکشام. هەستم بە ئازارێکی زۆر توند دەکرد، هێندەی پێ نەچوو ڕشامەوە، نەمزانی کەی ئەو خواردنەم خواردبوو، کە هێنامەوە. لەوکاتەدا چاوەکانی **لۆلیتام** بینی، بە کەسێک دەچوو کە زۆرترین هەستی بۆم هەیە و زۆر لە دیمەنەکەی من ترسا، گوێم لێبوو بە پیرەژنێکی گوت فریای باوکم بکەوە دڵی تێک دەئاڵێت.

بە ماندووبوونەوە خۆم هەڵکشاندە سەر کورسییەک و تا پێم کرا (جن)م خواردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ڕۆژی دوایی کە ڕۆژ بووەوە، هەستم کرد وزەی ئەوەم هەیە ئۆتۆمبێل لێ بخوڕم و بەردەوامیی بە گەشتەکەمان بدەم.

## ٢٢

بۆم دەرکەوت ئەو کەسەی من بە پۆلیسم دەزانی، هیچ نییە؛ کۆترسێکە و سوار سەرم بووە. هێندێک دۆخیش یاریدەدەری ئەوە بوو کە تووشی ئەو وەهمانەم بکات، بەم شێوەیە ترسم لە دڵی خۆم

کردمەوە ئەو پەتایە دەرکەوتووە و لە سەرەتای ئەو وەرزەوە ٤٠ حاڵەتی لەو شێوەیەی چارەسەر کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆم دەرکەوت ئەزموونە پزیشکییەکەی لە ئاست ناوبانگەکەیدا کەمترە.

بەهەرحاڵ، هیچ ڕێچارەیەکی ترم لەبەر دەستدا نەبوو و لای سکرتێرە قژزەردەکە گوتم تەمەنی ١٦ ساڵە و هەوڵی زۆرمدا لە نەخۆشخانەکە لەلای بمێنمەوە، بەڵام بێسوود بوو. ناچار بووم نەخۆشخانەکە جێ بهێڵم و **لۆلیتام** لەژێر دەستی کەسانێک بەجێ هێشت، کە هەرگیز متمانەم پێیان نەبوو، هەرچەندە پەرستاری تایبەتییش سەرپەرشتیی دەکرد.

لە کاتی گەڕانەوەمدا بۆ هۆتێلەکە، بیرم لەوە دەکردەوە لەوانەیە نەخۆشییەکە هەنگاوێکی دیکەی پلانەکەیان بێت، لە ناخی خۆمدا زۆرم گومان کرد، ئەو گومانانەش بە درێژاییی ئەو شەوە ئازاریان دام، وێنای ئەوەم دەکرد پۆلیسێکی نهێنی، یاخود عاشقێکی خۆحەشاردەر، مەسەلەی ئەم نەخۆشییەی ڕێک خستبێت، تاکوو بۆ هەتاهەتایە لە **لۆلیتا** دوورم بخاتەوە. بۆیە هیچ چارێکم نەما جگە لەوەی ڕوو بکەمە بارەکە و مەترسییەکان و خەیاڵەکانم نوقمی مەیخواردنەوە بکەم.

دوای سێ ڕۆژ باری تەندروستی **لۆلیتا** بە شێوەیەکی بەرچاو باش بوو، پزیشکەکەش گوتی لە ماوەی دوو ڕۆژی تردا بە تەواوەتی چاک دەبێتەوە. لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەشدا هەشت جار سەردانیم کرد، زۆربەی سەردانەکانیشم پێچەوانەی یاسا بوو، چونکە سەردانەکانم لە کاتی دیاریکراوی سیستمی نەخۆشخانەکەدا نەبوون. هیچ لە ڕووداوەکانی ئەو سەردانانەم بیر نایەت جگە لە یەکێکیان کە بە شێوەیەکی ڕوون لە ناخمدا نەخشێندرا. ٦٠ میلم بڕی بۆ ئەوەی چەند

کتێبێکی بە نرخی بۆ بکڕم، کاتێک لە ژوورکەی نێزیک بوومەوە، ماری لۆری پەرستارم بینی، لە ژوورکەوە دەرچوو، ئەو پەرستارە لە یەکەم ڕۆژەوە رقی لێم هەلگرتبوو، منیش وەکوو ئاژەلێک دەهاتە بەرچاوم، بینیم سینیی خواردنی بەیانیانی لەسەر کورسییەکی نێو ڕێڕەوەکەدا دانا، هەر کە منی بینی بە پەلە چووەوە ژوورەوە، وەکوو بڵێی بیەوێت **لۆلیتا** ئاگادار بکاتەوە لە هاتنی باوکە زۆردارەکەی- بە کتێب و گوڵەوە.

بەرلەوەی بچمە ژوورەوە سەیری خواردنی نێو سینییەکەم کرد، تاکوو بزانم خواردنەکەی **لۆلیتا** باشە یان نا، لە نێوان چەند پەڕەیەکدا زەرفێکم بینی، ناوی یەکێک لە هۆتێلەکانی تێدا نووسرابوو، بەڵام هیچ شتێکی لەسەر نەنووسرابوو، هەر کە زەرفەکەم هەڵگرت، ماری لۆر لە ناکاو لە ژوورەکەوە دەرچوو و بە گاڵتەجارییەکەوە گوتی:

- باشتر وایە دەست لە هیچ نەدەی، تاکوو دەستت نەسووتێت.

منیش بەهەمان گاڵتەجارییەوە گوتم:

- پێم وا بوو لیستی تێچووی نەخۆشخانەکە بێ، نەمزانی کە نامەیەکی سۆزدارییە.

دوای ئەوەی ئەو قسەیەم کرد، ڕووم کردە ژوورەکەی **لۆلیتا** و پەرستارەکەش دوام کەوت و گوتی:

- **لۆلیتا!** گوێ بگرە، باوکت وا دەزانێت لە دەزگیرانەکەی منەوە نامەی سۆزداریت پێ دەگات، نەخێر، مستەر هەمبەرت ئەو نامەیە بۆ **لۆلیتا** نییە، بەڵکوو بۆ منە.

دوای ئەوەی ئەو قسەیەی کرد، چووە دەرەوە. **لۆلیتاش** تەماشای... یاخود دەکرێت بڵێم تەماشای هیچ شوێنێکی نەدەکرد، نیگایەکی

خراپی هەبوو، ڕوومەتەکانی سوور بووبوونەوە و قژەکەی هاتبووە سەر چاو و شانە ڕووتەکانی و گەیشتبووە چەرچەفەکانیش.
**لۆلیتا** گوتی:
- ئەم گوڵانە چییە! بە گوڵی پرسە دەچێت. بەهەرحاڵ. سپاس بۆ تۆ، دەکرێت هێندێک قسەکانت لە وشەی فەرەنسی پاک بکەیتەوە، ئەو کارە هەموو کەسەکانت بێزار دەکات.
دووبارە پەرستارە ئاژەڵەکە هاتەوە، بۆنی سیر و میزی لێ دەهات، ڕۆژنامەیەکی بە دەستەوە گرتبوو، منیش بە زمانی فەرەنسی لەگەڵ **لۆلیتادا** قسەم کرد.
- چیتر خۆشت ناوێم **کارمن**؟
هەمیشە بە مەبەستی نازکێشانی ڕاهاتبووم پێی بڵێم **کارمن**، دەشمزانی خۆی و پەرستارەکە لە دژی خۆشەویستییە بێورەکەم پیلانیان دەگێڕا. بگرە لەوە دوورتر دەڕۆم و دەڵێم لە دوای ئەوە، بۆم دەرکەوت **لۆلیتا** ماریی هەڵدەخەڵەتاند، یارییەکی دووڕووی دەکرد، لای ئەو دەیگوت کە دەیەوێت لای ماڵی مامی بژیت و لای من نەژیت، چونکە من باوکێکی درندەم، پەرستارەکەش پێی وا بوو ڕێگری لە **لۆلیتا** دەکەم مامی خۆش بوێت. (گوایە برای من.)
کاتێک پەرستارەکە دەرچوو، گرێک لە قورگم دروست بوو، زۆرترین هەوڵم دا بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبم.
- کارمن! گوێ بگرە، هەر لە نەخۆشییەکەت باش بووی ئەم شارە پیسە بەجێ دەهێڵین.
- بەڵێ، بەڕاست دەمەوێت هەموو جلوبەرگەکانم بۆ بێنی.
بەردەوام بووم لە قسەکەم و گوتم:
- پێویستە بڕۆین هیچ هۆکارێک بۆ مانەوەم لێرەدا نییە.

. هیچ هۆکاریک بۆ مانەوەم لە هیچ شوێنێکدا نییە.
دواتر پەرستارەکە هات و گوتی کاتی سەردانیکردن کۆتایی هات و منیش بە قسەیم کرد و لە ژوورەکە دەرچووم و **لۆلیتا** بیری هێنامەوە کە سبەی جلەکانی بۆ بێنمەوە. بەڵام من بۆ ڕۆژی دوایی کۆکەم گرت، لە ناکاو پەتایەکم تووش بوو، بۆیە خۆم نەڕۆیشتم و بە کوڕی خاوەنهۆتێلەکەدا دوو جانتای جلەکانی **لۆلیتام** نارد، هەموو بڕوایەکم وابوو کە **لۆلیتا** دەیەوێت جلە بەنرخەکانی پیشانی پەرستارەکە بدات، بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بە هۆی پەتایەکەوە لەنێو جێدا وڕێنەم کرد.
دوای نیوەڕۆ یەکێک لە دەرکەی ژوورەکەی دام، بینیم کوڕی خاوەنهۆتێلەکە بوو، هەواڵی ئەوەی پێ گەیاندم کە ماریی پەرستار تەلەفۆنی کردووە و پرسیار دەکات کە ئەمڕۆ دەچێت بۆ نەخۆشخانە، یان نا؟ پێم گوت کە ئەمڕۆش لە جێ دەبم و ئەگەر کچەکەم تەندروستی باش بووە، ئەوا سبەینێ دەچم بۆ لای.
کاتێک ئەو لە ژوورەکە دەرچوو، دەستم بە مەیخواردنەوە کرد تاکوو خەوم لێکەوت، بۆ ڕۆژی دواتر تەندروستیم زۆر باش بوو، یەکەم شت کە کردم لە نووسینگەی هۆتێلەکەوە دەرچووم بۆ نەخۆشخانە، تا پرسیاری **لۆلیتا** بکەم. لە وەڵامدا گوتیان هەموو شتێک باشە و کچەکەم تەندروستی باش بووە و دوکتۆرەکانیش دڵنیایان کردمەوە نەخۆشییەکەی نەماوە و بە هۆی ئەوەوە کە من نەخۆش بوومە، مستەر گۆستاڤی مامی هاتووە بە ئۆتۆمبێلێکی کادیلاکەوە بردوویەتی و تێچووی نەخۆشخانەکەشی داوە و پێیان وتووە کە پێم بڵێن ئاگاداری خۆم بم و خۆم گەرم بکەمەوە، بە پێی ڕێکەوتنەکەمان لەگەڵ **لۆلیتادا** بەرەو بێستانی داپیرەی ڕۆیشتوون.

ڕاستەوخۆ چووم بۆ نەخۆشخانەکە، خۆشبەختانە پەرستارەکەی لێ نەبوو، چونکە هێندە تووڕە بووبووم بەشی ئەوەی دەکرد ئابڕووی خۆم بەرم، نەمدەتوانی بڵێم کە برام نییە ناوی گۆستاف بێت، من برام نییە، **لۆلیتاش** کچی من نییە.

لە کۆتاییدا بۆ دڵدانەوەی خۆم گوتم باشترین کار لە ئێستادا ئەوەیە بە ئازادی بمێنمەوە، باشترین کار ئەوەیە بێدەنگ بم، چونکە بچووکترین وشە، لە زمانم بترازێت، دەبێتە هۆی ئەوەی تاوانێکم پێوە بلکێت، بە فرمێسکەکانی چاوم لەبەر چاوی دوکتۆر بلۆ وا خۆم دەرخست کە خەم و پەژارەی زۆرم هەیە، هەرچەندە نەخۆشیی دڵیشم هەیە، بەڵام ئالوودەی خواردنەوەی مەی بوومە، داوای لێبووردنم لە هەموویان کرد و بە هێمنی بە خۆمم گوت کە هێشتا دەمانچەکەم ماوەتەوە و هێشتا پیاوێکی ئازادم، بەڵێ دەتوانم دوای ئەو کچە هەڵهاتووە بکەوم. ئازادییەکەم دەتوانێت، ئەو برایەم- گۆستاف- لە بووندا نەهێڵێتەوە.

## ٢٣

چەند ڕۆژێکم بە گەڕان بە دوای هەڵهاتووەکاندا لە ڕێیەکاندا بەسەر برد. خوێنەریش دەتوانێت وێنام بکات کە چەند بەویقار بووم، ڕووخساری خۆمم بە دڵخۆش پیشان دەدا و لە پشتی ماسکی ئارامیمەوە خەمێکی زۆر گەورەم شاردبووەوە. هەمیشە بە بزەیەکەوە ڕووخسارمم دەنەخشاند و دەفتەری هۆتێلەکانم دەپشکنی. خۆمم وا پیشان دەدا بە دوای کەسێکی نێزیکدا دەگەڕێم و ئەگەری هەیە لەو هۆتێلەدا بێت.

دواتر ناچار بووم زۆر بە ئاگاییيەوە لێکۆڵینەوەکانم بکەم، ناچار بووم لەو هۆتێلانەدا بمێنمەوە، بەم شێوەیە ۲۰۰ هۆتێل و ماڵم پشکنی- لە ۲۰ شوێندا بۆم دەرکەوت ئەو ئەژدیهایەی **لۆلیتای** رفاند؛ لە کوێوە بۆ کوێ دەڕوات. هێندێک جار لەو ژوورانەشدا دەمانەوە کە پێشتر من و **لۆلیتای** تێدا بووینە. دواتر بەوەمزانی کە ئەو لە لێکۆڵینەوەکانم بەئاگایە، بۆیە هێندێک ناوی خوازراوی بەکار دەهێنا کە تەنیا خۆم لێی تێدەگەیشتم، جارێکیان ناوی شانۆیەکی ئیتاڵیی کۆمیدیی هەڵبژاردبوو.

خاوەن یەکێک لە خانووەکان گوتی، ماوەی پێنج ڕۆژ لای بوونە و پیاوەکە زۆر نەخۆش بووە و **ئان لۆریی** کچی لەگەڵیدا بووە. بەبێ ئەوەی وەسفی کچەکەم بۆ بکات، راستەوخۆ زانیم **لۆلیتایە**.

راوەدوونانەکەم بەردەوام بوو، دەرکەوت کە گوستاف زۆرزانێکی لێهاتووە. هەمیشە سەرکەوتووانە گێچەڵی پێ دەکردم، بەڵام هەمیشە هیوایەکی بۆ جێدەهێشتم کە جاری داهاتوو ئاشکرای بکەم، یارییەکی شەیتانانە بوو، هەردەسی بە تووڕەیی دەهێنا، بەڵام هەرگیز خۆی ئاشکرا نەدەکرد، هەرچەندە جارێکیان لەوەدا بوو بیگرم، بەڵام ئەو شوێنەوارەی گوستاف بەجێ دەهێشت بەس نەبوو بۆ ئەوەی کەسایەتییەکەی بناسمەوە، کەسایەتییەکی بەهێزی هەبوو، دەیتوانی زمانی بە جۆرەها زاراوە بگۆڕێت و لە زەریای رۆشنبیری و هونەر و سێکسدا مەلە بکات، بەڵام لێهاتوو نەبوو لە شاردنەوەی شوێندەستی، چونکە خەتی نووسینەکەی کچانە بوو و هێندێک پیت هەبوو هەرگیز نەیدەتوانی بیگۆڕێت.

که گەڕامەوە بۆ بێردسلی و دوای ئەوەی سەدان میلم بڕی بە گەڕان بە دوایاندا و سەدان ئەگەری مەترسیدارم هێنایە بەر چاوم، لە ناخی خۆمدا وێنەیەکی تەواوم لەسەر گۆستاف دروست کردبوو. بیرم لەوە کردەوە کە مامۆستاکەی بێردسلی **لۆلیتای** ڕفاندبێت، چونکە جگە لە گاستۆن و ریفۆر مورتیس تەنیا ئەو پیاوە مامۆستا بوو لە بێردسلی، بیرم کەوتەوە **لۆلیتا** پێی خۆش نەبوو لە وانەکانی ئەو مامۆستایەدا ئامادە بم، ئەوەشم بیر هاتەوە کە گاستۆن هەمیشە بە مامۆستایەکی لێهاتوو باسی دەکرد.

کاتێک گەیشتمە بێردسلی، بۆم دەرکەوت ریفێر مامۆستای ناوبراو کەسێکی عازەبە و لە هۆڵەکەدا وانەیەک دەڵێتەوە، لە گۆشەیەکی هۆڵەکەدا دانیشتم و دەستم لەسەر دەمانچەکەی گیرفانم بوو، لە ناکاو هەستم کرد من کاتەکەم دەکوژم، چونکە کارێکی نارەوایە ئەو مامۆستایە رفێنەری **لۆلیتا** بێت.

چەندین هەوڵی نەزۆکم دا بۆ دۆزینەوەی شوێنی **لۆلیتا** و پێوەندیکردن پێوەی، تەنانەت لە ڕێی ریکلامی ئەو گۆڤارانەشەوە ریکلامێکم بڵاو کردەوە کە **لۆلیتا** دەیانی خوێندەوە، دواتر بوێریی ئەوەم کرد پێوەندی بە لێکۆڵەرێکی تایبەتەوە بکەم و هەموو ئەو ناوانەم پێی دا کە گۆستاف بەکاریانی هێنابوو، داوام لێی کرد پشت بەو ناوانە ببەستێت لە لێکۆڵینەوەکانی، بەڵام ئەو حەیوانە دوو ساڵی خایاند، دوای ئەوەی پارەکەم لێی بڕی، هاتەوە بۆ لام، بە بزەیەکەوە گوتی پیاوێکی هیندیی دۆزیوەتەوە تەمەنی هەشتا ساڵە و ناوی بیل برادنە لە شاری دۆلۆریس، بیل برادنیش یەکێک بوو لەو ناوانەی کە گۆستاف بەکاری هێنابوو.

## ٢٥

ئەم کتێبەم لە بارەی **لۆلیتاوە** نووسی، هەرچەندە گەیشتوومەتە ئەم قۆناغە و دەکرێت ناوی لێ بنێم: کتێبێک لە بارەی **لۆلیتای** ون و شاراوەوە.

نامۆترین ماوەی ژیانم ئەو ماوەیە بوو کە **لۆلیتام** بۆ ماوەی سێ ساڵ لێ ون بوو. لە زۆرترین وێنە بینراوەکانی ئەو کاتەم، ئەوە بوو، کە هەرگیز **لۆلیتام** لە خەوندا نەدەبینی، بەڵام هەمیشە لە زیندەخەونەکانمدا ئامادە بوو، هەمیشە لە شەوە درێژەکاندا ئامادەی خەیاڵم دەبوو، بەڵام لە خەونەکانمدا لەسەر شێوەی **ڤالێریای** هاوسەرم دەهاتە بەرچاوم، یاخود لەسەر شێوەی شارلۆت، یاخود شێوەیەکی تێکەڵ لە **ڤالێریا** و شارلۆت بوو. لەو خەونانەمدا هەمیشە لەبەردەمم لەسەر چۆک دەکەوت و هەوڵی دەدا بەزییم پێیدا بێتەوە.

ئەوەی لەو ماوەیەدا بووبووە هۆی پاراستنی سۆزم بۆی، هێندێک لە جلەکانی **لۆلیتا** بوو، زۆرجار تێر ماچم دەکردن و دەمگوشینە سینگم، بۆنەکەی پشووی بە سینگی تەنگم دەدا، دوای ئەوە هەستم کرد ئەو کەرەستانە خەریکن مێشکم تێک دەدەن، هەموویم کۆ کردنەوە و بەناوی خێرخوازێک ناردمن بۆ لانەیەکی بێسەرپەرشتان لەسەر سنووری کەنەدا.

ئەگەر لەو ماوەیەدا سەردانی کەسێکی لێهاتووم بکردبایە لەوانەی کە بە موگناتیسی خەڵک دەخەوێنن، لەوانەیە لەم شێتییە و لەم یادگارییانە رزگاری بکردبام، چونکە هەمیشە لە زیندەخەونەکانمدا لەگەڵ رابردوومدا بووم، بگرە لەو ماوەیەدا پێوەندیم لەگەڵ واقیعدا نەمابوو. لە ڕاستیدا سەردانی نەخۆشخانەیەکی دەروونیم کرد و وەرزی بەهارم تێدا بەسەر برد، دواتر هێندێک کارم لە نیو یۆرک

جێبەجێ کرد و بڕیارم دا بەرەو کالیفۆرنیا بڕۆم، بۆ ئەوەی بە دوای **لۆلیتا** و ڕفێنەرەکەیدا بگەڕێم، لەو ماوەیەدا چەند شیعر و قەسیدەیەکم لە تەنیاییی خۆمدا ڕێک خستن، هێندێکیانم تا ئێستا بیر ماون:

وێنێکی ناواکرا: **لۆلیتا** هیز
قژێکی قاوەیی، لێو لێوی سوور
تەمەنی پێنجهەزاروسێسەد ڕۆژ
لە کوێ خۆت حەشار داوە **لۆلیتا** هیز؟
بۆ خۆت حەشار داوە خۆشەویستەکەم.
لە دوای جودابوونەوەت
دڵشکاو و نیگاتەماوی
چ فەرشێکی فڕین هەڵدەگرێت؟
لەم ساتە ئەفسووناوییانەدا لە کوێ دەخەویت؟
خۆشەویستە بچکۆلەکەم ئێستاش هەر سەما دەکەیت؟
ئاهـ، چەند خۆش بوو ئێوارانی جاران.
باوەشە درێژەکانمان لە نێزیک ئاگردانەکەوە، خۆشەویستەکەم
ئەوەی ئێستا لەگەڵتدایە بەختەوەرە؟
**لۆلیتا** خۆشەویستەکەم... **لۆلیتا** شێتەکەم
چاوە خەواڵووەکانم
ئەی ئەو کەسەی چاوەکانی دانەدەخست لە کاتی ماچکردندا
ئازارەکان دەمخۆن...
خەریکە لە خۆشەویستی و غیرەکردندا دەمرم
**لۆلیتا** تۆ لە کوێیت؟
من بەبێ تۆ دەمرم تۆ... "هتد"

کاتێک شیعرەکانم شی دەکردنەوە، هەستم دەکرد لەدایکبووی خەیالی پیاوێکی شێتن، ئەو هاوسەنگییانە کە لە شیعرەکانمدا بوو دەیهەژاندم، هەڵچوون و خەیاڵ و بیرەوەرییە گەرمەکانم لەگەڵ **لۆلیتادا** دەگونجان، نوقمی نێو شیعر بووم، شیعرێکی زۆرم خوێندەوە و شیعری زۆریشم نووسی، بەڵام بۆ چرکەیەکیش گوشاری تۆڵەسەندنەوەم لە بیر نەکرد، ئەو هەستە ناخی داگیر کردبووم.

درۆزن دەبم ئەگەر بڵێم (ئەگەر خوێنەر بڕوا بکات، ئەوا شێتە)، لە دەستدانی **لۆلیتا** لە هەستە لادەرییەکانم سارێژی کردبێتمەوە، ئەو تایپە نەفرەتلێکراوەی من هەرگیز گۆڕانکاریی بەسەردا نایەت، تەنانەت ئەگەر گۆڕانکاری لە خۆشەویستییەکەشمدا ڕوو بدات.

هەمیشە سەردانی یاریگە و باخچەکانم دەکرد کە کچە بچووکەکان یارییان تێدا دەکرد و تەماشای جەستەیانم دەکرد، بۆ ئەوەی لێچووەکانی **لۆلیتا** بدۆزمەوە، بە دوای جەستەیەکدا دەگەڕام لە چوارچێوەیەکی منداڵانەوە بێت و سیمبولی جەستەی ئەوی تێدا بێت.

جیاوازییەکی تازەم لا دروست بووبوو، بۆ یەک چرکەساتیش لەگەڵ پاکیزەیەکی بچووکدا بیرم لە وەرگرتنی چێژ نەدەکردەوە، تەنانەت ئەگەر پەرییەکی ڕەسەن بوایە یاخود ساختە، بەڵێ، خەونەکانم ڕاوەدووی لێچووەکانی **لۆلیتای** نەدەنا، هەرگیز کەسێکی ترم لە خەیاڵەکانمدا نەدۆزییەوە کە جێنشینی ئەو دوورگەیە بێت، دوورگەی پەرییە ئەفسووناوییەکان، لەم کاتانەدا پێوەندیم لەگەڵ کەسانی تردا پچڕا، تەنیا **لۆلیتا** نەبێت.

بەڵام دوو ساڵی بەردەوام لە گەڕان و هەوڵدان و ترس، بە دوای فریشتەکی هەڵهاتوودا، وای لێ کردم لەگەڵ هەستە تێرنەبووەکانمدا ڕابێم. هەمیشە هەوڵم دەدا ئەو هەستانەم کپ بکەمەوە، بۆ ئەوەی لە

دەست بۆشاییی ئەم ژیانە تووشی شێتی نەبم، دەترسام بە هۆی ئەو هەستانەمەوە ئەگەر کچەهەرزەکارێک بێتە ڕێم میشکم تێک بدات.
ئەم تەنیاییە وای لێ کردم پێویستم بە کەسێک بێت لەگەڵم بێت، دڵم ئامادەباش بوو بۆ ئەوەی تووشی هیستیریا ببێت، لەم حاڵەدا بووم **ڕیتا** هاتە ژیانمەوە.

## ٢٦

**ڕیتا** لەسەر تەختەی شانۆی ژیانم دەرکەوت، تەمەنی دووهێندەی تەمەنی **لۆلیتا** بوو و سێ لەسەر چواری تەمەنی من بوو. کچێکی جەستەلاواز و قژڕەش و ڕووخسارزەرد بوو. چاوەکانی لاکێشەیی بوون، ڕووخساری هێڵی ڕوونی هەبوو، کۆی دڵی دەبرد.
گڕکانێکی زیندوو بوو، پێم وا بێت خوێنێکی ئیسپانی، یاخود بابلی، لە نێوچەوانیدا هاتوچۆی دەکرد.
ڕۆژێکی بەهار بوو، لە بارێکی تاریکدا بۆ یەکەم جار بینیم، زۆر سەرخۆش بوو، کە منی بینی جەختی لەوە دەکردەوە هاوڕێی بوومە لە سەردەمی خوێندندا. دەستە لاوازەکەی خستە سەر دەستە تووکن و زبرەکەم، هەرچەندە هەستەکانمی وروروژاند، بەڵام بڕیارم دا هەلێکی پێ بدەم کە خۆشەویستیی خۆیم بۆ بسەلمێنێت، بەو شێوەیە بۆم دەرکەوت هاوڕێ و خۆشەویستە.
**ڕیتا** زۆر ڕووخۆش بوو، ڕۆحێکی وەرزشییشی هەبوو، بە شێوەیەک خۆی ڕادەستی هەموو مەخلووقێکی خەمگین دەکرد بەبێ ئەوەی گوێ بە هیچ بدات، تەنانەت هەرکەسێک بە درۆش خۆی خەمناک

بکردایە ئەو ئامادە بوو بۆ دڵناواییکردنی؛ لەو ڕووانەوە زۆر دڵی نەرم بوو.
کاتێک بۆ یەکەم جار چاوم پێی کەوت، بۆم دەرکەوت هاوسەری سێیەمی خیانەتی لێ دەکات، عاشقی حەوتەمیشی بەجێی هێشتووە، بەڵام ئەوانی وەکوو تێپەڕبوونی هەورێک دەزانی، گرینگییشی پێیان نەدەدا، بەوەشم زانی کە برایەکی هەیە هەژموونی سیاسی هەیە و گەورەی شارۆچکەیەکە، مانگانە چەند سەددۆلارێک دەداتە خوشکە بچووکە میهرەبانەکەی، بۆ ئەوەی هەرگیز نەگەڕێتەوە بۆ شارۆچکەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا عاشقەکانی هەمیشە بۆ ئەو شارۆچکەیەیان دەبرد بۆ پیاسەی شەوان، ئەویش زۆر دەترسا لەوەی براکەی ئەو پارەیەی لێ ببڕێت.
ئۆتۆمبێلەکەی ڕیتام بەکار هێنا بۆ گەشتکردن بەرەو کالیفۆرنیا، بۆ ئەوەی پشوو بە ئۆتۆمبێلە ماندووەکەم بدەم، ڕیتاش بۆ ماوەی دوو ساڵ هاوڕێتیی کردم، لە هاوینی ساڵی ١٩٥٠وە بۆ هاوینی ساڵی ١٩٥٢، لەو گەشتانەشدا، ناسکترین و نەرمونیاترین و سادەترین کچم لەگەڵدا بوو، زۆر دڵنەوایی کردم و هەستی ئارامیی پێ بەخشیم، هەر بە هۆی ئەویشەوە نەچوومەوە بۆ نەخۆشخانەی دەروونی.
کاتێک باسی ئەوەم بۆی کرد کە دوای کچێکی تایبەت کەوتووم بۆ ئەوەی سکی کون بکەم، ڕاستەوخۆ ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر پلانەکەم، بەڵکوو هێندێک پشکنینی تایبەتی کرد و کەوتە ژێر دەستی کەسێکی خراپەوە، شەوێکیان کە هاتەوە بۆ ماڵ جانتاکەی بەتاڵ بووبوو لە پارە و چەندین لەکەش بە دەموچاوی و جەستەیەوە بوو.
کچێکی بوێر بوو، ئارەزووی سەرەڕۆیی دەکرد و یاریی مەترسیداری دەکرد، تەنانەت جارێکیان پێشنیاری ئەوەی کرد بە دەمانچە ڕۆلێتە

رووسییەکەم یاری بکات (ئەو یارییەش بەو شێوەیە بوو، کە تەنیا یەک فیشەک لە دەمانچەکەدا بمێنێت و رۆڵەکەی بە خێرایی بسووڕێنی و دواتر دەمانچەکە ڕوو بکاتە مێشکی یاریزانی بەرانبەر، ئەگەر هات و ئەو فیشەکە ڕێکی دەرزی دەمانچەکە هات، ئەوە یاریزانی بەرانبەرت دەکوژێت.)
جارێکیان ئەو یارییەمان کرد، بەڵام دەمانچەکەمان ڕوو لە ئۆتۆمبێلەکە کرد، تەنانەت فیشەکێکیش بەر ئۆتۆمبێلەکە کەوت، بیرم دێت قاقای لێ دا.

هەرچەندە مەکرەکانی لە ماچکردندا جۆرێک لە ناز و لێهاتوویی تێدا بوو، توانی لە کردەوەی خراپ دوورم بخاتەوە، هاوڕێتییەکەی وای لێ کردم لە ڕاوەدوونانی کچە هەڵهاتووەکە بوەستم، بیرۆکەی ئەوەشی خستە مێشکمەوە کە ڕفێنەرەکەی پیاوێکی دڕندەیە، هاوشێوەی مرۆڤە سەرەتاییەکانە و چێژی لێ دەبینێت.
دواتر بڕیارم دا بە **ڕیتا** قایل ببم، بە ڕێکەوت لە ڕێی گەڕانەوەدا چووین بۆ شارۆچکەیەکی بچووک، کە پێشتر بارەگەی گونگرەیەکی گشتیی تایبەت بوو بە کشتوکاڵ و ئاژەڵ، شوێنی ئەو گونگرانە بوو کە پیاوە قەڵەوەکان بە بەراز دەچن و بە هەموو توانا و وزەیەکیانەوە بیرە و وێسکی دەخۆنەوە و دەستی سڵاو لە خەڵک بەرز دەکەنەوە و ڕوویان بۆ هەموو کەسێک خۆش دەکەن.
لە شەوەکەیدا من و **ڕیتای** ئازیز خەبەرمان بووەوە، دیقەتمان دا کەسێکی تر لە ژوورەکەماندایە، گەنجێکی زەردتاڵ بوو، دوو گوێچکەی ناسکی هەبوو، من و **ڕیتاش** بیرمان نەدەهاتەوە کە پێشتر لە هیچ شوێنێکدا بنیبیتمان، لەشی عارەقەیەکی زۆری کردبوو، بەڵام هێندە قووڵ خەوتبوو پرخەی دەهات و تەنیا جلی ژێرەوەی لەبەر

بوو. لە نێزیک **ڕیتا**وە ڕاکشابوو. **ڕیتا** دەستی برد یەکەم شت کە بەردەستی کەوت چاکەتەکەی من بوو، بە خێرایی خۆی بە چاکەتەکەم داپۆشی، هەوڵمان دا خەبەری بکەینەوە و ئاومان کرد بە سەروچاویدا، سوودی نەبوو، دواتر بۆمان دەرکەوت دەرکەکەمان دانەخستووە بۆیە هاتووەتە ژوورەوە، ناچار بە زەبرێک خەبەرمان کردەوە، دەرکەوت هۆشی لە دەست داوە و نەمانتوانی هیچ شتێک لە بارەی پێناسەیەوە بزانین، بەڵام **ڕیتا** لە قسەکانی وا تێگەیشت کە خەڵکی برۆکلین بێت. بە پەلە جلەکانمان لەبەر کرد و بەرەو نێزیکترین نەخۆشخانەمان برد.

دوای شەش مانگ **ڕیتا** نامەیەکی بۆ ئەو نەخۆشخانەیە نارد و پرسیاری ئەو کوڕەی کرد، وەڵامی نەخۆشخانەکەی بۆ هاتەوە کە هێشتا هۆشی نەهاتووەتەوە سەر خۆی و هیچ شتێک لە بارەی ڕابردوویەوە نایەتەوە یاد.

پێم وا نەبوو ئەو ڕووداوەم بە بیر بێتەوە، بەڵام بە هۆی ئەوەی توێژینەوەیەکم لە گۆڤارێکدا بڵاو کردەوە- لە بارەی هۆش و چۆنێتیی لەدەستدانی و تێیدا باسم لەوە کرد کە هەستکردن بە کات پشت بە ڕێژەوی خوێن دەبەستێت و دەبێتە هۆی هەستکردن بە خود و درککردن پێی، بەم شێوەیە عەقڵ لە نێوان دوو جەمسەردا دابەش دەبێت، جەمسەرێکیان ڕووداوەکانی ڕابردوو عەمبار دەکات و جەمسەرەکەی دیکەشیان ڕووداوەکانی ئایندە کە توانای تێهزرینی دەبێت.

لە دەرئەنجامی ئەو توێژینەوە زانستییەوە، بانگهێشت کرام بۆ کۆلێژی (کانتریپ) بۆ ماوەی ساڵێک، شوێنی نیشتەجێشیان بۆ دابین کردنم بە هەموو کەرەستەکانی ناوماڵەوە، ئەو شوێنەش وەکوو بڵێی بۆ

بەهەرحاڵ نامەکەم کردەوە، بینیم بە دەستخەتیکی کچانەوە نووسراوە و زمانیکی زۆر جددیی لە خۆ گرتوە:

**باوکی ئازیزم!**

حاڵت چۆنە؟ من زەواجم کردووە و بەم نێزیکانە دەبمە دایک، پێشم وایە کوڕێکم دەبێت، لەوانەیە بۆ جەژنی سەری ساڵ لە دایک ببێت، زۆرم پێ قورس بوو کە ئەم نامەیەت بۆ بنووسم، خەریکە شێت دەبم، چونکە ئەوەندەمان نییە قەرزەکانمان بدەینەوە و لەم شارە ناخۆشەدا دەربچین. دیکی هاوسەرم بەڵێنی کارێکی گەورەیان پێی داوە لە ئالاسکا، بە پێی بوارەکەی خۆی کارێکی پێ دەدەن. لێم ببوورە کە تاکوو ئێستا ناونیشانی خۆمم پێت نەگوتووە. دەیشزانم کە ئێستا ڕقت لێمە، ئەمە جگە لەوەی زۆر بەئاگا بوومە لەوەی دیک بە هیچ شتێک نەزانێت.

تکا دەکەم باوکە، حەواڵەیەکی خێرامان بۆ ڕەوانە بکە، ئێمە بە بڕی سێسەد بۆ چوارسەد دۆلار دەتوانین کارەکانمان جێبەجێ بکەین، هەرچەندێک بێت ئەو بڕەپارەیەی بۆمان دەنێری دەبێتە هۆی هاوکاریکردنمان، ئەگەر بگەینە ئالاسکا پارەمان بۆ هەڵدەقوڵێت، دواتر تۆ دەتوانی خانووە کۆنەکەیشمان بفرۆشێت- ئەگەر پێویستی کرد.

تکا دەکەم وەڵامی نامەکەم بدەرەوە، چونکە بە دەست قورسی و سەختیی ژیانەوە دەردەسەریی زۆرم بینیوە.

سڵاوی کچە دووگیانەکەت قەبووڵ بفەرموو.

دووباره گەڕامەوە ڕێوبانەکان. بە تەنیا لەگەڵ ئۆتۆمبێلە شینەکەمدا، ئۆتۆمبێلەکەی دایکی **لۆلیتا**. دووبارە سەفەرەکەم دەست پێ کردەوە. **ڕیتاش** لە خەوێکی قووڵ و دنیایەکی دیکەدا بوو، کاتێک ئەو نامەیەم دەخوێندەوە و ململانێم لەگەڵ شەپۆلەکانی ئازارمدا دەکرد، کە ناخی هەژاندبووم.

سەیرێکی **ڕیتام** کرد، لەنێو خەوەکەیدا بزەی دەکرد و نێوچەوانیم ماچ کرد، ئارەقەی کردبوو، نامەیەکی ماڵئاوایی بەسۆزم بۆی نووسی و نووساندمە نێوچەوانییەوە، چونکە تاکە ڕێچارە بوو بۆ ئەوەی دڵنیا بم دەیخوێنێتەوە و ئیتر بۆ هەتاهەتایە بەجێم هێشت.

کاتێک ئۆتۆمبێلەکەم لێخوڕی گوتم:

- ئەوە دیسان تەنیام.

بەڵام تەنیاش نەبووم، دەمانچە ڕەشەکەم لەگەڵ بوو. بەردەوام دەستم لێ دەدا، هەر کە گەیشتمە شوێنێکی چۆڵ و شیاو، یەکەم هەنگاوم بۆ ئەوە بوو مەشق لەسەر ئەوە بکەم، کە **مسز ریچارد شیلر** چۆن مردنێکی سەخت بمرێت.

کراسێکی کۆنم لە ئۆتۆمبێلەکەمدا دۆزییەوە و بە دارێکەوە هەڵمواسی و بە خەیاڵی خۆم کردم بە **لۆلیتا** و ڕاهێنانم لەسەر کرد و سزای لە سێدارەدانم دا. هەستم بە بێزاری دەکرد، وامدەزانی بەلەپیتکەی دەمانچەکە ڕەق بووە، بیرم لەوە کردەوە تۆ بڵێی پێویست بەوە بکات چەوری بکەم، بەڵام بیرم کەوتەوە کە کاتی ئەوەم نییە و چوومەوە بۆ ئۆتۆمبێلەکەم و گەشتەکەم لەگەڵ دەمانچە ڕەشەکەدا دەست پێ کرد و کراسە کونکونەکەشم بە دارەکەوە بەجێ هێشت.

مێژووی نامەکەی **لۆلیتا** ١٨ی ئاب بوو، ئەو شارەی نامەکەی لێوە هاتبوو، شاری (کولمنت) بوو، کە لە کەنارێکی پیشەسازیدایە و نێزیکەی ٨٠٠ میل لە نیو یۆرکەوە دوورە.

لە سەرەتادا بیرم لەوە کردەوە کە بە شەوانەڕۆژ بەردەوام بم لە ڕێکردن، بەڵام دواتر بڕیارم دا بۆ چەند سەعاتێک لە هۆتێلێکی لادێیی سەر ڕێیەکەمدا پشوو بدەم.

بە درێژایی کاتەکە بیرم دەکردەوە. کە کۆتاییم بە بیرکردنەوە هێنا و گەیشتمە ئەوەی ئەو ئەژدیهایەی **لۆلیتای** ڕفاند، ئۆتۆمبێلفرۆش نییە، لەوانەیە لە بیردسلی **لۆلیتای** ناسیبێت، کاتێک کە تایەی پاسکیلەکەی تەقیوە و بە ئۆتۆمبێلەکەی بەرەو ماڵی مامۆستای پیانۆکەی بردووە و لەو کاتەوە وابەستەی بووە، تاکوو لێی کردمەوە.

زەنگی کاتژمێرەکەم بۆ کاتژمێر شەشی بەیانی ڕێک خست، تاکوو بەڕێ بکەومەوە. بە شێوەیەکی تایبەت خۆم بۆ ئەو بۆنەیە ڕێکپۆش کرد، هاوشێوەی ئەو پیاوچاکەی ئامادەی ڕکابەرییەک دەبێت، کاغەزەکانم ڕێک خست و خۆمم شووشت و بۆنم لە جەستە بوودڵەکەم دا و ریشم تاشی و کراسێکی ئاوریشمی و قاتێکی تازەم لەبەر کرد.

بەداخەوە نەمتوانی نانی بەیانی بخۆم، بەڵام بە دەستەسڕەکەم دەمم سڕی و پێم وابوو کە دڵم نانی نەبرد شتێکی لاوەکییە، چونکە دڵم تەنگە و زاریشم زۆر تاڵ بووبوو.

دوای پشکنینێکی زۆر، ماڵەکەم دۆزییەوە، ماڵێکی زۆر خراپ بوو، دەنگی تەقەوڕەقەی لە پشتەوە دەهات، ئۆتۆمبێلەکەم ڕاگرت، ماوەی دەقیقەیەک بە ئارامی لەو نێوەندەدا بیرم کردەوە، بەڵێ، گەیشتمە کۆتایی گەشتەکەم. هاوڕێیان گەیشتمە کۆتایی ئەو گەشتە گەرمەم،

هەستم کرد لێدانی دڵم تەواو نییە؛ ٤٠ جار لە خولەکێکدا لێی دەدا و هێندەی پێ نەدەچوو لە خولەکێکدا ١٠٠ جار لێی دەدا، دەمانچەکەم کردە گیرفانی لای ڕاستی پانتۆڵەکەوە.

لە پشتمەوە سەگێکم بۆ دەرچوو، بۆ چرکەساتێک وەستا و لێی ڕوانیم، بە چاوە بڵەکانی و سکی قوڕاوییەوە دەستی بە وەڕین کرد. هێندەی پێ نەچوو دوور کەوتەوە و لە دوورەوە ڕووەو من دەستی بە وەڕین کردەوە.

## ٢٩

لە ئۆتۆمبێلەکەم دابەزیم و دەرکەکەم پێکدا دا، بە شێوەیەک بۆشاییی ئەو ناوەم بە دەنگەکەی پڕ کردەوە. سەگەکەش بۆ دەنگی دەرکەکە سەرلەنوێ دەستی بە وەڕین کردەوە. کاتێک دەستم خستە سەر زەنگی دەرکەکە، هەستم کرد لەرزینێک هەموو بوونی منی دەلەرزاند، بۆ ماوەیەک چاوەڕێم کرد، دووبارە دەستم پێیدا نایەوە و گوێم لە دەنگی پێی کەسێک بوو، بە ئاهێکەوە لە پشت دەرکەکەوە هات و کردییەوە؛

دوو بست درێژتر بوو، چاویلکەیەکی لە چاو بوو، قژی بە باشی بەستبوو، دەمێکی تازەشی هەبوو، چەند سادەیە وێنەی ئەم بوونەوەرە کە ماوەی ساڵانێک لەژێر دەستمدا وەکوو مردوو بوو، سکی گەلێ ئاوسابوو، هێندە ئاوسابوو وا دەردەکەوت کە سەری لە جاران بچووکترە، ئەسمەرییەکەی لە دەست دابوو و مووی دەستیشی هاتبووەوە.

کە بینیمی بە پەرۆش و پێشوازییەوە گوتی:

- یاااااااه...
بە دەنگێکی کزەوە- دەستم لەسەر دەرکەکە بوو- گوتم:
- هاوسەرەکەت لەماڵە؟
لەو کاتەدا نەمدەتوانی بیکوژم، چونکە خۆشم دەویست، خۆشەویستییەک بوو لە یەکەمین و دوایین نیگادا، نیگای هەمیشەیی، نیگای هەتاهەتایی.
بە نەغمەی پێشوازیکردنەوە گوتی:
- فەرموو وەرە ژوورەوە.
دوای ئەوەی ئەو قسەیەی کرد، سکە بەرزەکەی لابرد بۆ ئەوەی ڕێم بۆ بکاتەوە. بەبێ ئەوەی بەر منداڵەکەی بکەوم تێپەڕیم، بەڵام هەستم بە بوونی تێکەڵەیەک لە بۆنی ئارەق و مەتبەخ کرد، وەکوو گەمژە ددانەکانم جیڕ کردنەوە، دوای ئەوەی هاتمە ژوورەوە دەرکەی داخست و سەگەکەی لابرد و بە سکە گەورەکەیەوە دوام کەوت.
بە دەستی ئاماژەی کرد و گوتی:
- ئەوە هاوسەرەکەمە.
لە پەنجەرەی مەتبخەکەوە سەرم دانەواند، گەنجێکی قژڕەشم بینی، سەری خستبووە نێو مەکینەیەکەوە و گەنجێکی دیکەشی لە تەنیشت بوو- بە یەک باسکەوە- سەریان خستبووە سەر مەکینەکە.
لۆلیتا گوتی:
- بانگی بکەم؟
کە بە نەخێر وەڵامیم دایەوە، وەکوو سەماکەرە هیندییەکان دەستی پان کردەوە، بۆ ئەوەی بڵێت حەزم لە دانیشتنە لەسەر کورسییە بزۆکەکە، یاخود لەسەر قەنەفەکە، کە دەبێتە جێخەوی هاوسەریش.

پێکەوە دانیشتین و دەستم بە ئاگاییەوە بەرەو دەمانچەکەم برد، کە بە دەستەسڕێک پێچابووم، دووبارە پێشنیاری کرد بانگی هاوسەرەکەی بکات بۆ ئەوەی یەک بناسین، پێم گوت:
- نەخێر. ئەوەی دەمەوێت بیزانم ئەو نییە، دەمەوێت شتێکی تر بزانم.
لەو کاتەدا نیگای پێشوازیکردن لە ڕووخساریدا ئاوا بوو و نێوچەوانی دا بە یەکدا، هاوشێوەی ئەو کاتە تاڵانەی کە پێشتر لەگەڵیدا بەسەرم دەبرد:
- ئۆهـ
- بەڵێ کوا، خێرا وەڵامم بەرەوە.
سەرێکی بادا و گوتی
- گوێ بگرە نابێت ئەو باسە بکەیتەوە.
- نەخێر دەیکەمەوە.
وەکوو ژنێکی عاقڵ توورەییەکی قەتیس کرد و گوتی دیک هیچ نازانێت لە باری رابردوویەوە و وا دەزانێت من باوکی **لۆلیتام** و کچی خێزانێکی ئەرەستوکراتییە و بە ئارەزووی خۆی لە ژیانێکی خۆشەوە هەڵهاتووە، بۆ ئەوەی قاپ بشوات و بە پارەی خۆی بژیت، ئەو باوەڕی بە هەموو درۆکانی **لۆلیتا** کردووە، ئیتر بۆچی ڕابردوو هەڵبدەمەوە و کێشەی زیاتری بۆ دروست بکەم؟
پێم گوت دەبێت بە شێوەیەکی باش بیر بکاتەوە و درک بەوە بکات کە پێویستە بزانم چی ڕووی دا، ئەگەر بیەوێت هاوکاریی بکەم، زۆرم لێی کرد:
- دەی ناوێکم پێ بدە.
ئەو وای دەزانی من دەمێکە ناوی ئەو کەسەم زانیوە.

(ناوێکی سەیرە.) باسی لەوە کرد کە خۆشی بڕوای بەو ڕووداوانە نەکردووە، بڕوای بەوەش نەدەکرد کە خاوەن ئەو ناوە بتوانێت لە دەست من ڕزگاری بکات، بەڵام دووبارە پێشنیاری کرد لە بیری بکەم، چونکە چیدی ناوی ئەو گرینگ نییە و ئەم شووی کردووە و هەوڵی دا بابەتی قسەکردنەکە بگۆڕێت و پێشنیاری کرد جگەرەیەک بکێشم، لە وەڵامدا گوتم:

- نەخێر ناوەکەیم دەوێت.

کاتێک سەری بە نەخێر راوەشاند، گوتی:

- کات بۆ گلەیی تێپەڕی. بڕوا بە هیچ شتێک ناکەم کە شایەنی بڕواپێکردن نەبێت.

پێم گوت:

- باشتر وایە بڕۆم، هەر ئەوەندە بەسە کە تۆم بینی.

لێرەدا درکی بە کەللەڕەقییەکەم کرد و گوتی:

- بەڕاست دەتەوێت ناوی بزانی.

دەنگی تەواو نەرم کرد و لێوی خۆی بە نەرمی گەست و ناوێکی درکاند، پێویستە خوێنەر پێشتر بەو ناوەی زانیبێت. پێم وا بوو کە منیش ناوەکەم زانی کێیە، بەبێ ئەوەی بیناسم! تووشی شۆک نەبووم و نەشیهەژاندم. شتەکان لە مێشکمدا بە ریزبەندی هاتنەوە بەرچاوم، کاتێک قسەی بۆ دەکردم منیش لەنێو ئارامیدا دەتوامەوە، چونکە بۆ دواجار ڕزگاری کردم لە تەمومژی بیرکردنەوەکانم.

گوتی تاکە پیاو بوو کە خۆشی ویستووە. پرسیارم کرد، ئەی (دیک)ت خۆشت ناوێت؟ گوتی ئۆۆ! نا بەرخێکی باشە، پێکەوە بە بەختەوەری دەژین. بەڵام ئەو مەبەستی خۆشەویستی بوو لە شتێکی تردا، بەڵام

من هەرگیز نەچوومە دڵیەوە و بێبەش بوومە لە خۆشەویستیی ڕاستەقینەی.

بە قسەکانی وا دەردەکەوت ئەو پیاوەی لە منی ڕفاند، هەموو تاڵە مووەکانی جەستە جوانەکەی بە باشی دەناسێت، چاوەکانی بریقەیەکی ڕفێنەری تێدا بوو، تێکەڵی تاڵی بووە، بەڵام لە ئارەزووویەکی قووڵەوە نەدەهات، پێوەندییەکەی لەگەڵ مندا وەکوو ئاهەنگێکی درێژ و سێبەرقورس و بێزارکەر دەزانی و پارچەیەک بوو لە ڕاهێنان.

دەستم کێشا بە ڕانی خۆمدا، داوای لێ کردم تووڕە نەبم، ئەوەی ڕابردوو تازە ڕۆیشت، ئەو پێی وایە من باوکێکی بەسۆز بووم بۆی. **لۆلیتا** بەردەوام بوو لە گێڕانەوەی چیرۆکەکەی. چۆن نەمزانی کە پێشتر دایکی دەناسێت؟ بە شێوەیەک هاوڕێیەکی کۆن بوو لە هاوڕێیەکانی خێزانەکەی، ڕۆژێک سەردانی رامسدڵی کردووە و میوانداریی مامی کردووە و لە یانەکەی دایکیدا وانەیەکی گوتووەتەوە و پێشتر لەگەڵیدا دەستبازیی کردووە و باوەشی پێدا کردووە و لەبەردەم هەموان ماچی کردووە و **لۆلیتا** لیی تووڕە بووە. لەو کاتەدا تەمەنی (١٠) ساڵان بووە، واتا بەر لە دوو ساڵ لە ناسینی من، گوتیشی لە یەکێک لە هۆتێلەکاندا منی بینیوە لەگەڵ **لۆلیتادا**، لەو کاتەدا سەرقاڵی نووسینی شانۆگەرییەک بووە، کە بڕیار بوو **لۆلیتا** لە خوێندنگەی بێردسلی ڕۆڵی تێدا ببینێت. بەڵی (کلێر) نووسەری شانۆگەرییەکە، کە وەکوو ژنێکی تەمەن گەورە ناساندی، بەڵی، ژیان درۆ بوو لە دوای درۆ. ئەگەر هەرکەسێک ژیاننامەی **لۆلیتای** بنووسیبایەوە، کەس بڕوای پێ نەدەکرد.

کاتێک گەیشتم بەم ئاستە لە چیرۆکەکەی، دەنگەدەنگێک لە مەتبەخەکەوە هات، (دیک) و هاوڕێیەکەی هاتنە ژوورەوە، بە دوای بیرەدا دەگەڕان، کاتێک منیان بینی (بێل) چووە هۆڵەکەوە. **لۆلیتا** بە دەنگێکی بەرزەوە هاواری کرد، دەنگی **لۆلیتا** چووە نێو گوێچکەکانم، دەنگی وەکوو بڵێی خۆشییەکی تێدا دەرخستبوو و خەمێکی تێدا لە چاڵ نابوو.

- دیک ئەمە باوکمە.

دیک، گوێی گران بوو، چونکە لە جەنگدا تووشی پێکانێک بووبوو، تەوقەم لەگەڵ ئەو گەنجەدا کرد، کە لەگەڵ بەخێرهاتنکردنمدا قتوویەک بیرەی هێنا، لە ڕووخساریدا وا دەردەکەوت کە من بۆ ئەوە هاتووم، ماوەیەک لە ماڵەکەیدا بمێنمەوە، بۆیە پێشنیاری ئەوەی کرد خۆی و **لۆلیتا** لەسەر ڕاخەرێکی تردا بخەون لە مەتبەخەکەدا، بە دەستم ئاماژەی نەخێرم بۆی کرد و بە **لۆلیتام** گوت کە تەنیا بۆ سەردانی هاتووم و ڕاستەوخۆ ڕوو دەکەمە (ڕێد سپۆرج) بۆ ئەوەی بە دەم داوای هاوڕێیەکمەوە بڕۆم، **لۆلیتا** بە دەنگێکی بەرزەوە هاوری کردە گوێی گەنجەکە و قسەکانمی پێ گوتەوە، بۆیە دیک بە بزەیەکەوە خۆی کشاندەوە و گوتی دەڕۆم کار لەسەر ئەو مەکینەیە دەکەم، پێی وا بوو هەواڵی زۆرم هەیە بۆ ئەوەی بیگەیەنمە **لۆلیتا**، تاکوو دوو بە دوو قسە بکەین پێکەوە، هیوای خواست کە بەر لە ڕۆیشتنم بمبینێت.

لەگەڵ دەرچوونی ئەودا منیش هەڵسام و **لۆلیتا** دیسان لەسەر کورسییە بزۆکەکە دانیشاندمەوە، خۆمم پێ ڕانەگیرا، دەستم کرد بە پرسیارکردن:

- کەواتە خیانەتتان لێ کردم، بۆ کوێ ڕۆیشتن؟ ئێستا ئەو لە کوێیە؟

جگەرەیەکی پێشکەش کردم، رەتم کردەوە و جگەرەکەی بۆ خۆی داگیرساند. بۆ یەکەم جار بوو **لۆلیتام** بینی جگەرە بکێشێت، چونکە ئەو سەردەمەی لای من بوو، جگەرەکێشان قەدەغە بوو، لە ڕێی هەوری دووکەڵە شینەکەوە، **لۆلیتا** وەکوو شارلۆتی دایکی هاتە پێش چاوی من، دەتگوت لە گۆڕەکەیەوە دەرچووە. **لۆلیتا** بێدەنگییە ناخۆشەکەی شکاند و گوتی:

. نەخێر. خیانەتم لێ نەکردیت، هاوڕێیەکی کۆن بوو، ڕاستە هاوڕێیەکم ئاگاداری کردمەوە لێی، کە ئەو کچە بچووکەکانی خۆش دەوێت، تەنانەت جارێکیان لە نیو یۆرک بە هۆی شەرمفرۆشتنییەوە بە کچێکی هەرزکار زیندانی کراوە، بەڵام ئەو وەکوو من نەبوو، یاخود وەکوو ئەو نەبوو، کە مەخلووقێکی ئاسایی بێت، بەڵکوو زۆر ژیر بوو.

**لۆلیتا** پێی گوتم کە هەموو ئەو شتانەی نێوانمانی بۆ باس کردووە و زۆر پێکەنیوە و گوتویەتی ئەو پێوەندییە نارەوشتیی لەگەڵ ئەویشدا هەیە. گوتی جاری یەکەمیان بردمی بۆ بێستانێک، ئیتر بێستانەکە سووتا و منیش گرینگیم پێی نەدا، جارێکیشیان تەلەفۆنی بۆ کردووە کە یاریی تێنسی دەکرد لەگەڵم، گڕی بە خەیاڵەکانی بەرداوە و پێی گوتوە لە مانگی سێپتەمبەردا دەڕوات بۆ هۆلیۆد، بۆ ئەوەی ئەزموونێکی سینەمایی بۆ ئامادە بکات و ڕۆڵێکی پێبدات لە فیلمە سینەمایییەکەیدا، بەڵام بەدبەختی دۆخەکە نەگونجا بۆ ئەوەی بیرۆکەکە بەجێ بهێنین.

- ئەو بەرازی فیلبازە ئێستا لە کوێیە؟

- ئەو بەراز نییە، لە زۆر ڕووەوە پیاوێکی باش بوو، بەڵام مەی و مادەی هۆشبەر تێکیان دا، بێگومان کەسێکی بەئەزموون بوو لە

بواری سیکسدا و زەوقێکی خۆشی هەبوو، هەموو کچێکی هاوڕێی دەکردە کۆیلەیەکی گوێڕایەڵ.

لۆلیتا باسی لەوەش کرد کە لەو بێستانەدا شتی وای بینیوە کە هەرگیز وێنا ناکرێت، بەڵێ، وێنای ناکەی کە خۆی و برادەرەکانی چییان دەکرد لەوێ، چونکە من بە تەنیا ئەوم خۆش دەویست و ئامادە نەبووم بەشدارییان بکەم، بۆیە دەریان کردم.

- چییان دەکرد؟

- ئۆوهـ شتی زۆر پیس و ناشرین، شتگەلێک بوون تەنانەت بە خەیاڵیش بڕوای پێناکەی، دوو گەنج و دوو کچ و سێ پیاو بوون، بە ڕووتی تێکەڵی یەک دەبوون، پیرەژنێکیش گرتەی سینەمایی بۆیان دەگرت.

دواتر لۆلیتا ئامادە نەبوو وردەکاریی زیاتر بورووژێنێت، ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە ئێستا زەواجی کردووە و منداڵێک لە سکیدایە. بەڵام دواتر بەردەوام بوو لە چیرۆکەکەی:

- ناچار بووم منیش لەگەڵیان بم، چونکە دەمویست تەنیا بۆ ئەو بم، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو و دەریکردم، دوای ئەوە هیچ شتێکی گرینگ ڕووی نەدا، لە زستانی ١٩٤٩دا کارێکم لە چێشتخانەیەکدا دۆزییەوە بۆ ماوەی دوو ساڵ کارم کرد و دواتر چاوم بە (دیک) کەوت.

پرسیاری ئەوەم لێ کرد کە ئایا لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا هیچ پێوەندییەکی تەلەفۆنی کردووە لەگەڵیدا، گوتی نەخێر، چونکە جێ و شوێنی نەدەزانی، بەڵام ئەگەر بیویستایە شوێنی بزانیبایە، کارێکی ئاسان بوو، چونکە ئەو کەسێکی ناسراو بوو.

ئەوەی پێویست بوو زانیاریم لەسەری وەرگرت، چیتر پرسیاری ترم لێی نەکرد، هیچ نیازێکیشم نەبوو بۆ ئازاردانی خۆشەویستەکەم.

لەو کاتانەدا دەنگی رادیۆیەک لە مەتبەخەکەوە بەرز بووەوە، گۆرانییەکی لە بارەی شێتیی ژیان و قەدەرەوە دەگوتەوە. **لۆلیتا** چاوەکانی نوقاند و دەمی داخست و سەری خستە سەر سەرینەکە، وا هاتە پێش چاوی من کە ژنێکە بێتاقەتە لە ژیان و تەمەنیشی زۆر لە حەڤدە سالی تێپەڕاندووە.

سەیریم کرد و تێر لێیم ڕوانی، چۆن دڵنیا بووم لەوەی کە دەمرم، ئاوا دڵنیا بووم لەوەی کە لە هەموو ئەو شتانەی کە بینیومن و بە خەیاڵم هاتوون و خەونم پێیانەوە بینیوە، زۆرتر خۆشم دەویست.

لەو چرکەساتانەدا جگە لە دەنگدانەوەیەکی کزی ئەو پەرییە، کە ڕۆژانێک باوەشم پێیدا دەکرد، هیچی تر نەبوو. هێشتا لەنێو خۆشییەکانی ڕابردوومدا گێرە دەکەم. بە گوڵێکی وەریو دەچوو، بەڵام هێشتا ڕەونەق و دڵۆپی ئاونگی هەر تێدا مابوو، سپاسی خودا دەکەم کە ئەو دەنگدانەوەیە ئەو شتە نەبوو کە من خۆشم دەویست و دەمپەرست.

هەرچەندە گومانم لەوەدا نەبوو کە توانای ئەوەم هەبوو بیگەڕێنمەوە وەکوو جاران، کە ئەم قسەیە دەکەم، دەمەوێت هەموو جیهان ئەوە بزانێت کە تا چەند **لۆلیتام** خۆش ویست، بەڵێ، هێشتا ئەو **لۆلیتایەی** کە بە پیاوێکی تر دووگیان و ڕووخساری ئاڵۆزاوە، هەر خۆشەویستە لەلام، لەو کاتەدا بیرم لەوە کردەوە کە دەتوانین بگەڕێینەوە وەکوو جاران، پێم گوت:

- گوێ بگرە، لەوانەیە قسەکەم لە جێی خۆی نەبێت، بەڵام ئەوەی پێویستە بیڵێم دەیڵێم، ژیان کورتە و لە نێوان ئەم هۆڵە و ئۆتۆمبێلەکەدا تەنیا بیستوپێنج هەنگاو هەیە، پانتاییەکی زۆر کورتە،

دەتوانین بیبڕین، با پێکەوە بیبڕین، ئێستا وەرەوە لەگەڵم، بەم شێوەیەی ئێستات، بۆ هەتاهەتایە بە بەختەوەری دەژین.
چاوەکانی کردەوە و خۆی کۆ کردەوە، وەکوو مارێک کە خۆی بۆ ئەوە ئامادە کردبێت کە بە یەکێکەوە بدات، گوتی:
- مەبەستت ئەوەیە کە تۆ هاوکاریم ناکەی، ئەگەر بۆ هۆتێلێک نەیەم لەگەڵت؟ مەبەستت ئەوەیە؟
- نەخێر، بە هەڵە لێم گەیشتی، دەمەوێت دیک بەجێ بێڵی و لەگەڵم بژی و بمری و بەشداریی هەموو شتێکم بکەی.
ڕەنگی ڕووخساری گۆڕا و بە تووڕەییەوە گوتی:
- تۆ شێتی.
- باش بیر بکەرەوە، هیچ مەرجێکت بۆ دانانرێت، بەڵام ئەگەر نەیەیتیش ئەوا ئەوەی پێویستە هەر پێتی دەدەم.
کاتێک گومانی خۆی دەرخست، زەرفێکم پێی دا، چوارسەد دۆلاری تێدا بوو، لەگەڵ چەکێکی بانک بە بڕی سێهەزاروشەشسەد دۆلار.
دیارییەکەمی بە دڵێکی خۆشەوە وەرگرت و لە خۆشیدا نێوچەوانی پڕ بوو لە خوێن و سوور بووەوە و ئیقاعی هەناسەی تێک چوو:
- مەبەستت ئەوەیە کە چوارهەزار دۆلارمان پێ دەبەخشی؟
دەستم خستە سەر ڕووخسارم و دامە قوڵپی گریان. لەو کاتانەدا فرمێسکێکم ڕشت کە لە هەموو ژیانمدا بەو گەرمییەوە نەمڕشتبوو. دڵۆپی فرمێسکەکانم لەسەر ڕوومەتمەوە هاتنە خوارەوە و لە چەنەمەوە دەتکان، نەمتوانی گریانەکەم بگرم، کاتێک بە بەزەییەوە دەستی گرتم، پێم گوت:
- ئەگەر دەستم لێ بدەی دەمرم، پێم بڵێ تۆ دڵنیای کە نایەی لەگەڵم؟ هیچ هیوایەک نییە بۆ ئەوەی بێی؟ وەڵامم بەرەوە؟

. نەخێر ئازیزەکەم! هیچ هیوایەک نییە، نەخێر، ئەگەر لە ماڵی هاوسەرەکەم دەربچم ئەوە بۆ لای کلێر کیلتی دەڕۆم، مەبەستم...
لۆلیتا کەمێک تێک چوو و وا هەستم دەکرد کە دەڵێت ئەو دڵی وێران کردم و تۆیش ژیانم، بەردەوام بوو لە قسەکردن:
. تۆ مرۆڤێکی میهرەبانی کە ئەو بڕەپارەیەمان پێ دەدەی، دەتوانین هەموو قەرزەکانمان بدەینەوە و لە حەفتەی داهاتووشدا بڕۆین بۆ ئالاسکا، تۆش دەتوانی لە دۆخەکەمان تێبگەی. تکایە مەگری، من داوای لێبوردن دەکەم کە تۆم هەڵخەڵەتاند، بەڵام ئەوەی ڕووی دا تازە ڕۆیشت.
شوێنەواری فرمێسکەکانم لە ڕووخسارم سڕی، ئەویش زەرفەکەی کردەوە، بە بزەیەکەوە سپاسی کردم، ویستی بانگی دیک بکات، گوتم نەخێر، کەمێکی تر دەڕۆم، هەرگیز نامەوێت بیبینم.
لۆلیتا هەوڵی دا بابەتی قسەکان بگۆڕێت، بەڵام وەکوو بڵێی تەمێک نیگاکانمی پۆشی و هێشتاش ئەم کچە هارە دووگیانە وەکوو منداڵێکی هەرزەکاری دوانزە ساڵ دێتە بەرچاوم، هەمان ئەو منداڵەی کە لەگەڵ خۆمدا بۆ گەشتێکی ئەفسووناوی بردم.
گەڕامەوە بۆ بابەتی پارەکە و گوتم ئەوە کرێی خانووەکەی دایکتە. سەرسووڕمانی خۆی دەربڕی، وایدەزانی خانووەکەی دایکی فرۆشراوە و زیاتر بەوە تووشی سەرسووڕمان بوو کە پێم گوت پارێزەرەکە لیستێک لە میراتگەرییەکانی بۆ دەنێرێت و کۆمەڵێک بەڵگەی دایکی بۆ ماوەتەوە کە لە ئێستادا نرخیان بەرز بووەتەوە.
لۆلیتا داوای لێ کردم کە بمێنمەوە، بەڵام گوتم ناتوانم دەبێت بڕۆم. بەڵێ، پێویستە بڕۆم بیدۆزمەوە بۆ ئەوەی ڕۆحی لەناوبەرم.

به نیگا ماڵئاواییی لێ کردم، چونکە بەرگەی ماچی ئەوم نەدەگرت، بە سکە خڕەکەیەوە کە هەنگاوی بەرەو ڕووم دەنا، من هەنگاوێک بەرەو دواوەوە دەڕۆیشتم. تاکوو بەر دەرکە هات و وەستا، کە ئۆتۆمبێلەکەی بینی بە بەراورد لەگەڵ بیرەوەرییەکانیدا نیگایەکی بێباکی بۆ ئۆتۆمبێلەکە هەبوو، بیرەوەریی هەرزەکارێک کە لە ڕێی ئەم ئۆتۆمبێلەوە چووە ژیانی سێکسییەوە.

بۆ دواجار بە پاڕانەوە پرسیارم لێ کرد:

- دواقسەت، دڵنیای ناگەڕێیتەوە بۆ لام، مەبەستم سبەی نییە، یاخود دووسبەی، بەڵکوو ڕۆژێک لە ڕۆژان، هەرگیز ڕۆژێک نایەی؟ ناگەڕێیتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵم بژی؟ خواوەندێکی نوێ بۆ خۆم دروست دەکەم و بە هاوارکردنەوە سپاسگوزاری دەکەم، ئەگەر ئەو ئومێدەم پێ بدەی.

بە بزەیەکی وەڵامی دایەوە:

- نەخێر... نەخێر.

- لۆ ئەگەر ئەو ئومێدەم پێ ببەخشی، ڕێچکەی ژیانم دەگۆڕێت.

ئەو قسەیەم کرد و دەمانچەکەم بۆی دەرنەهێنا، خوێنەریش باش دەزانێت کە هەرگیز کاری وا ناکەم، خۆشەویستە ئەبەدییەکەم کە مرد ماڵئاواییی لێ کردم، دەڵێم خۆشەویستە مردووەکەم، مەبەستم ئەوەیە کە هەمیشەیییە و هەرگیز نامرێت.

بە پێی ڕێکەوتنی ڕەسمی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی دادوەریدا، تۆمەتبار بووم بەوەی کە کوشتوومە و تەرمەکەیم شاردووەتەوە، بەو تۆمەتە ڕازی بووم.

کاتێک بە ئۆتۆمبێلەکە دوور دەکەوتمەوە، گوێم لێ بوو هاواری بۆ دیک دەکرد بۆ ئەوەی سەگەکە لابەرێت، چونکە دوای ئۆتۆمبێلەکەم

کەوتبوو، بەڵام بە هۆی ئەوەی سەگێکی پیر بوو، وەستایەوە، منیش بەردەوام بووم لە ڕێکردن لەژێر ڕێژنەی باراندا و ڕێژنەی فرمێسکیش بەرانبەری گرتبوو، هەرگیز نەمتوانی ئەو فرمێسکانە ڕابگرم.

## ٣٠

چوومەوە بۆ شاری ڕامسداڵ، بۆ ئەوەی چارەنووسی ڕفێنەرەکەی **لۆلیتا**- ئەو نووسەرە فێڵبازە یەکلایی بکەمەوە. لە ڕێیەکەمدا لە یەکێک لە گوندەکان بۆ پشوودان وەستام، دووبارە مەسەلەکەم هێنایەوە بەرچاوی خۆم، زۆر بە سادەیی هەموو ڕووداوەکانی نێوان خۆم و خۆشەویستەکەمم بینی.

بیرم کەوتەوە، کە دوو ساڵ بەر لە ئێستا، لە ڕێی قەشەیەکی کاسۆلیکی ژیرەوە ئیمانە مولیحدەکەم بۆ مەزهەبی پرۆستانت گۆڕی، ئەوەش جۆرە چارەسەرێکی کۆن بوو، چونکە دانپێدانان بە تاوان و چارەسەری تاوانی تێدا بوو، لەو ڕێیەوە گرێی دەروونیی هەستکردن بە تاوان دەکرێتەوە، ئەو قەشەیە کەسێکی زۆر نەرمونیان بوو، هەوڵێکی زۆری لەگەڵم دا و من سپاسی دەکەم، بەڵام بەداخەوە نەمتوانی لە مرۆڤی ئاسایی تێپەڕم، چونکە هیچ شتێک نەیتوانی **لۆلیتام** لە بیر بباتەوە و ئارزووە لادەرییەکانم چارەسەر بکات، ئەوەی لەو دانپێداناندا بە دەستم هێنا تەنیا پشوودانی ویژدان و سەبووریی ڕۆحم بوو.

ئەوەی بۆم سەلمێندرا ئەوە بوو کە گرینگ نییە کچە هەرزەکارێکی ئەمەریکی لە پاکیی منداڵێتی بێبەش بێت لەژێر دەستی کەسێکی

لادەردا، بەڵێ ئەوەی بۆ نەسەلمێندرا (ژیانی ڕاستەقینە گاڵتەجاڕییە ئەگەر بتوانی بیسەلمێنی)، من هیچ ئامرازێکم نەدۆزییەوە بۆ ئەوەی لەم تەنگوچەڵەمەیە ڕزگارم بکات، جگە لەوەی لۆمەی قەدەر بکەم، بە شێوازێکی پۆزشهێنانەوە، کە شێوازێک لە هونەری کۆنمان تێدا دەنووسێتەوە لە هونەری ڕەهابوون لە گوناحەکان.

## ٣١

ئەوە دیسان گەڕامەوە بۆ شاری رامسداڵ، ئەمجارەیان بە لای زەریاچەکەدا گەڕامەوە، کاتی نیوەڕۆ بوو، هەرچی لە گەردووندا هەبوو بریقەی دەهات، بە لای گۆڕستانەکەدا تێپەڕیم و سڵاوێکم لە گۆڕی شارلۆت کرد، دواتر بە ماڵە کۆنەکەدا تێپەڕیم، تابلۆیەکی لەسەر بوو، نووسرابوو ئەم خانووە بۆ فرۆشتنە، دەرکەکانی داخرابوون، بێدەنگی باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشابوو.
دوای ئەوە بۆ ماوەیەک وەستام، بە ئۆتۆمبێلەکەم بە خێرایی بەرەو ئەو هۆتێلە ڕۆیشتم کە پێنج ساڵ بەر لە ئێستا بۆ یەکەم جار تێیدا نووستم، هەستم کرد کاتەکانم بە خەیاڵکردن بە فیڕۆ دەدەم. لە هۆتێلەکەدا بڕێک هاوڕێی کۆنی شارلۆتم بینی ماڵئاواییان لە یەکدی دەکرد و لە کۆڕێکی کۆمەڵایەتییەوە دەردەچوون، دایکی فیلیپس منی ناسییەوە کە کچەکەی هاوڕێی **لۆلیتا** بوو، بە هاوارێکی شۆکئامیز و بزەیەکی ساختەوە لێم نێزیک بووەوە، جۆرە چاوداگرتن و پرسیارێک لە ڕەفتاریدا بوو، وەکوو بڵێت (چیت لە **لۆلیتا** کرد، ئایا وەکوو فرانکی فیتەرت کرد کە تەمەنی پەنجا ساڵ بوو و لەگەڵ ساڵی هۆرنەری

١١ساڵدا کردی.) ئەو ڕووداوەی کە ئابڕوچوونی وەرزکە بوو لە ساڵی ١٩٤٦دا کاتێک کە هاتم بۆ رامسداڵ.

ئەوەم بۆی شی کردەوە کە لە کالیفۆرنیا دەژیم و **لۆلیتاش** زەواجی لەگەڵ ئەندازیارێکی گەنجدا کردووە، وەڵامەکەی ئەوە بوو کە ڕێ بە کچەکەی نادات لە تەمەنی ١٨ساڵیدا زەواج بکات. قسەکانیم بڕی و پێم گوت:

. بەڵێ بێگومان، بەڕاست (فیلیپس) هاوڕێیەکەی **لۆلیتا** لە خێوەتگەی کچەکان، بۆی باسی کردی کە شارلی کوڕی بەڕێوەبەرەکە چۆن ئەو کچانەی کە دایکیان بەخێویانی دەکرد و ئەو خراپیانی دەکرد؟

ڕووخساری کرژ بووەوە و بە تووڕەیییەوە گوتی:

. چ ئابڕوچوونێکە، ئەو کوڕە لە کۆریا کوژرا.

ئەو پیرەژنەم بەجێ هێشت و چووم بۆ ماڵی دوکتۆر (مولنار خال)، ئەو ئەژدیهای خۆشەویستەکەمی هەڵخەڵەتاند، بۆ ئەوەی بکەم بەڕاستیی ئەو فرتوفێڵانەی، کە هەرگیز نەمتوانی لێی تێبگەم، توانیم نیازەکانم بشارمەوە لە دوکتۆرەکە و پرسیاری کێلتیم لێی کرد، ئەویش پێی گوتم کە لە کەناری (گریم وۆرد) دەیدۆزمەوە.

بە پەلە ڕووم کردە ئۆتۆمبێلەکەم و هەشت گوللەی ئارەزوومەندی کوشتنم کردە دەمانچەکەوە.

## ٣٢

لە ڕێیەکەدا کارمەندی وێستگەیەکی بەنزین ڕێی پیشان دام- بۆ (گریم وۆد)، هەر بۆ ئەوەی دڵنیا بم لەوەی لە ماڵەوەیە، تەلەفۆنم بۆی کرد، بەڵام وەڵامی تەلەفۆنەکە ئەوە بوو کە بە هۆی قەرزەوە ئەو تەلەفۆنە ڕاگیراوە.

گومانی ئەوەم لا دروست بوو، کە لە ماڵ نەبێت.
بە نیگەرانییەکی زۆرەوە ئۆتۆمبێلەکەمم لێدەخوڕی، ترسی ئەوەم هەبوو ماڵەکەی بەجێ هێشتبێت، گەیشتمە کەناری بارکینگتون، تاریکییش باڵی بەسەر ئاسماندا داپۆشی، بڕیارم دا ئەو شەوە لەوێ بمێنم و چاوێک بە پلانەکەمدا بخشێنمەوە بۆ ئەوەی ئاسانکاریی بۆ بکەم.
لە کورتترین ڕێوە ڕووم کردە (گریم وۆرد)، دووبارە تاریکی باڵی بەسەر گەردووندا پۆشی، گەیشتمە بەرانبەر ماڵەکەی، کە سەیریکی ئەو کۆشکەم کرد، وێنەی ئەو ئاهەنگانە هاتە بەرچاوم کە لەگەڵ هەرزەکارەکاندا دەیکەن و خراپەکارییان لەگەڵدا دەکەن، خوێنم دەستی بە هەڵقولان کرد، کە وێنای **لۆلیتام** کرد تێیدا، بەڵام توانیم کۆنترۆڵی خۆم بکەم، گرینگ ئەوەیە ئێستا ماڵەکەیم دۆزییەوە.

# ٣٢

بەیانی کاتژمێر هەشتونیو لە هۆتێلەکە دەرچووم. دوای ئەوەی شەوێکی سەختم بە بیرکردنەوەی چۆنیەتیی لەسێدارەدانی کێلتی بەڕێ خست. ئەوەم دەهاتە بەر چاو کە دەمانچەکەم تەڕ بووە و تەقە ناکات، بۆیە دەمانچەکەم چەور کرد و وەکوو منداڵێکی بچووک لە پارچەپەڕۆیەکەوەم ئاڵاند.
دووبارە چوومەوە بۆ (گریم وۆرد)، زریان و باران و برووسکەم لەگەڵدا بوون. کاتێک نێزیک بوومەوە خۆر هەڵهاتبوو و چۆلەکەکان دەستیان بە جریوە کردبوو. ئەو ماڵە وەکوو ڕووناکییەک دەهاتە بەرچاوم، هێندەی پێ نەچوو پێم خستە سەر زەوییەکە، هەستم کرد

زەوییەکەش زۆر نیگەرانە، زۆرم خواردبووەوە، بۆ ئەوەی خۆم گورج بکەمەوە.
لە زەنگی ماڵەکەمدا، بێدەنگییەکی سەخت وەڵامی دامەوە، هەستم کرد گاڵتەم پێ دەکات، بەڵام بێئومێد نەبووم کاتێک کەس وەڵامی نەدامەوە، چونکە ئۆتۆمبێلەکەیم بینی لە ژوورەوە، دووبارە بە شێوەیەکی بەهێزتر لە دەرکەکەم دا، دیسانەوە کەس وەڵامی نەبوو و گوێم لە دەنگی پێی کەس نەبوو بەرەو دەرکەکە بێت، پاڵم نا بە دەرکەکانەوە، وەکوو چیرۆکە خورافییەکان هەردوو لایەکەی کرایەوە.
دەرکەم لە دوای خۆمەوە بە نەرمی داخست و بەناو ڕێڕەوەکەدا ڕۆیشتم، چوومە ژووری دانیشتنەکەوە، هێندێک پەرداخم بینی کە دیار بوو پاشماوەی شەوێکی بێدار بوو، بۆم دەرکەوت خاوەنماڵەکە هێشتا لە ژوورەکەی خۆیدا نووستووە، ڕووم کردە نهۆمی دووەم و دەستی ڕاستم لەسەر دەمانچەکە ئامادەباش کرد، سێ ژووری نووستنم پشکنی، دیار بوو شەوی رابردوو کەسی لەسەر نەنووستبوو، ژوورەکانی دیکەشم یەک یەک پشکنی، ژووری زۆری لێ بوو، تەواو گێژ بووم، بۆیە وەستام و بیرم لەوە کردەوە، کارێکی ژیرانە نییە، ڕێ بە نێچیرەکەم بدەم هەلی بۆ بڕەخسێت و بچێتە ژوورێکەوە و دەرکەکە دابخات، کە ئەو بیرۆکەیەم بۆ هات، تووشی شۆک بووم و بۆ ماوەی چەند خولەکێک وەستام، دواتر وەکوو هێرش بە دوای کلیلی ژوورەکاندا گەڕام، بۆ ئەوەی ڕێگری لەو ڕووداوە بکەم.
کاتێک ڕووم کردە گەرماوی سێیەم، خاوەنماڵەکەی لێوە دەرچوو، کلکێکی باریکی لە کەوتنی ئاوی قژەکەی لە دوای خۆی دروست کرد، هەوڵم دا لە یەکێک لە گۆشەکانی ڕێڕەوەکەدا خۆم حەشار بدەم،

بەلام ئەو گۆشەیە نەیتوانی بمپارێزێت و حەشارم بدات، لە تەنیشتمەوە تێپەڕی، بەبێ ئەوەی ئاوڕم لێ بداتەوە، پێ دەچێت بە هۆی ئەوەوە بووبێت، یان منی نەبینی، یاخود بە فریشتەیەکی زانیم لەو فریشتانەی کە بە هۆی مادەهۆشبەرەکانەوە دێتە بەرچاوی، بەهەرحال بەردەوام بوو لە رێکردنەکەی خۆی و وەکوو بڵێی بەدەم خەوەوە بەرەو نهۆمی یەکەم دەڕوات، لەو کاتانەدا کلیلێکی ترم خستە گیرفانمەوە و بەرەو هۆڵی پێشەوە دوای کەوتم، دەمی کردەوە و دەرکەی ماڵەکەی بە نیمچەکراوە کرد بۆ ئەوەی سەیری خۆرەتاو بکات، بە کەسێک دەچوو کە هەرگیز کەس بانگی نەکردبێت، دەرکەکەی داخست، بەبێ ئەوەی گرینگی بەو فریشتەیە بدات کە لەسەر پەیژەکاندا بینی و بە دڵنیاییەوە ڕووی کردە ژووری نووستنەکەی، منیش ڕێم پێ دا بچێتەوە ژووری نووستنەکەی و چوومە مەتبەخەکەوە و بە پەڕۆیەک چەوریی دەمانچەکەم سڕی و وەکوو هەنگاوی پڵنگ بەرەو ژووری نووستنەکەی ڕۆیشتم، دڵیشم زۆر بە خۆشی لێی دەدا، هاوشێوەی دڵخۆشیی ئەو پڵنگە بوو کە هێرش دەکاتە سەر نێچیرەکەی و لە ناوی دەبات.

لە ڕێی گەڕانەوەدا خاوەنماڵەکەم لەنێو هۆڵەکەدا بینی کە کەرەستەی ڕۆژهەلاتی تێدا بوو، لەوێدا هەستی پێ کردم و بۆ ماوەیەکی باش سەیری کردم، بۆ ئەوەی بمناسێتەوە، نیگاکانی ئاراستەی سەرم کردبوو، بە دەنگێکی گڕەوە گوتی:

- تۆ کێی؟ تۆ برۆستەری؟

بۆم دەرکەوت کە زۆر بێئاگایە لە من و لەژێر ڕەحمەتی مندایە، پێم وابوو کە هێندێک یاریی لەگەڵدا بکەم و دەروونم ئارام بکەمەوە و گوتم:

- بەڵێ من برۆستەرم، با هێندێک گفتوگۆ بکەین بەرلەوەی دەست بە کارکردن بکەین.
سمێڵەکەی دەستی بە لەرزین کرد، پێ نەدەچوو بابەتەکە بێزاری کردبێت، پاڵتۆکەم داکەند و چاکەت و قەمیسە ڕەشەکەم دەرکەوت، لەسەر دوو کورسی دانیشتین.
چەنە پڕەکەی خوراند و بە بزیەکی خراپەوە گوتی:
- تۆ وەکوو جاک پرۆستەر دێیتە پێش چاوم، واتا لێکچوونەکانتان تێبینیکراو و دیار نییە، بەڵام جارێکیان یەکێک لە هاوڕێیەکانم پێ گوتم جاک برایەکی هەیە و لە فەرمانگەی تەلەفۆنات کار دەکات.
هەستم بە تووڕەبییەکی ئاسمانی کرد، بە شێوەیەک کە وەسف ناکرێت، یەکێک لەو نیعمەتە مەزنانە ئەوە بوو بە نیگایەکی تووڕەیی و پرسیارەوە لە وردەکاریی ئەم مەخلووقە بڕوانم، کە ئاوازەکانی ئازار و نیگەرانی و دڵڕاوکێی لە بوونی مندا ئەو تووشی بووە، دەشزانم ئەم ئەژدیها سڕبووە بە مادەهۆشبەرەکان، لۆلیتای هەڵخەڵەتاند و خراپەی لەگەڵدا کردووە، بەڵێ ئەمە نیعمەتێکە بەرگری لێ ناکرێت.
پێم گوت:
- بەڵێ، من برای جاک نیم.
بە شێوەیەکی دڵخۆشکەران و سەرسووڕمانەوە سەری لەقاند، دووبارە پێم گوتەوە:
- هەوڵ بدە بمناسیتەوە.
گوتی:
- هاتووی لەسەر ئەو تەلەفۆنە دەرەکییە بێزارم بکەی.
- تۆ ئەو تەلەفۆنانەت کردووە؟

. نەخێر من ئەم کردووە، ئەو هاوڕێیانەمن، دێنە ئەم ماڵە و داگیری دەکەن و بەبێ وەرگرتنی مۆڵەت مەتبەخ و حەمام و تەلەفۆنەکەم بەکار دەهێنن، بۆیە من ئامادە نیم کرێکەی بدەم.
. مافی خۆتە، بەڵام کچێکت بیر دێت ناوی دۆلۆریس هیز بوو، مەبەستم **لۆلیتایە**؟
. بێگومان، لەوانەشە هەر ئەویش بێت ئەو پێوەندییانەی کردبێت، چونکە لە واشنتۆنەوە تاکوو دۆزەخ بە تەلەفۆن داوای شوێنی دەکرد، بەڵام ئەوە چ گرینگییەکی بۆ تۆ هەیە؟
. کیلتی گرینگی بۆم هەیە، من باوکی **لۆلیتام**.
. ڕاست نییە تۆ باوکی نیت، ڕاست نییە پێ دەچێت تۆ بریکاری یەکێک لەو کۆمپانیا فەرەنسییانە بی کە کار لە بڵاوکردنەوە دەکەن و ڕۆمانی (غرووری جەستە)یان بۆ وەرگێڕام.
. کیلتی ئەو کچی من بوو، من باوکیم.
کیلتی لە حاڵەتێکی دەروونیی جددیدا بوو، هیچ شتێک نەیدەتوانی ببێتە مایەی شۆکبوونی، بەڵام زۆر گرینگیی نەدەدا، بریقەی دڵەڕاوکێش لە چاوەکانیدا کز بوو، دووبارە ساردی گەڕایەوە چاوەکانی و گوتی:
. هەمیشە منداڵم زۆر خۆش ویستووە، باوکی ئەو منداڵانەش ئازیزترین هاوڕێی منن.
ئاوڕی دایەوە و بە دوای شتێکدا دەگەڕا و دەستی بۆ گیرفانەکانی برد و ویستی لەسەر کورسییەکەی هەڵبسێت، بە سەریدا گوڕاندم:
. دانیشە.
. پێویست بەوە ناکات هاوارم بەسەردا بکەی.
ئەو قسەیەی بە زمانێکی ناخۆشەوە گوت، دواتر گوتی:

- دەمەویت جگەرەیەک بکێشم، ئەگینا دەمرم.
- بەهەرحاڵ تۆ هەر دەمری.
- ئۆهـ بەسە گاڵتەکردن، خەریکە بێتاقەتم دەکەی، چیت دەوێ؟ تۆ فەرەنسیت؟ دەتەویت شتێک بخۆیتەوە، با بچین بۆ بارەکە پێکێک بخۆینەوە.
کێلتی، کە دەمانچە ڕەشەکەی بینی لە دەستمدا، قسەکەی بڕی، وەکوو زمانی کەسە خراپەکانی نێو فیلمە سینەماییەکان گوتی:
- دەمانچەیەکی جوانە، بە چەند دەیفرۆشی؟
دەستی بەرز کردەوە و بە دەستم لە دەستیم دا، بەڵام ئەو توانی مێزەکە بەسەرمدا قلْپ بکاتەوە و لە قتوویەکی جوانەوە کۆمەڵێک جگەرە پەرش و بڵاو بوونەوە، بە دڵخۆشییەوە گوتی:
- ئەوەتا ئەوە جگەرەیە، ئێستا تەنیا پێویستم بە شقارتەیە.
- کێلتی گوێ بگرە، دەمەویت تێبگەی، کەمێکی تر دەمری، پێش ئەوەش ئەو کاتەی کە بۆ تۆ ماوەتەوە حاڵەتێکی شێتییە، چونکە دواجگەرەی خۆتت دوێنێ کێشاوە، تێبگە لێم و تێبگە لەوەی کە چی ڕوو دەدات.
بەدەم مژینی جگەرەیەکی هەڵنەکراوەوە گوتی:
- من ئامادەم بۆ ئەوەی تێبگەم، پێ دەچێت تۆ جوولەکەیەکی ئوستورالی یاخود ئەڵمانی بی و لە ئەمەریکا پەنابەری، بەڕاست پێویستە قسەم لەگەڵ بکەی؟ وەکوو دەزانی ئەمە ماڵێکی مەسیحییە بۆیە باشتر وایە بڕۆی، بەسە چیتر بەو دەمانچەیەش یاری مەکە، دەمانچەیەک لەو گەورەترم هەیە لە ژووری موسیقاکەم.
دەمانچەکەم ئاراستەی لاقی کرد و دەستم بە بەلەپیتکەی دەمانچەکەدا نا و سەیری دەمانچەکەم کرد و دواتر سەیری قاچیم کرد، گوللەی

لێوە دەرنەچوو، دووبارە هەوڵم دا، گوللەیەکی لێوە دەرچوو و فەرشە ئەستوورەکەی کون کرد، هەستێکی شێتانەم بۆ هات بەوەی کە گوللەکە لە جێی خۆیدا جێگیر نەبوو، بەڵکوو بە ئاسماندا بەرز بووەوە.

کیلتی بەبێ ئەوەی زۆر هەڵچی، گوتی:

- تێگەیشتی مەبەستم چییە، پێویستە زۆر بەئاگاتر بی، ئەو یارییەی دەستتم بەری. بۆ خاتری مەسیح.

خۆی داهێنا بۆ ئەوەی دەمانچەکە بەرێت، بە تووڕەیی و هەڵچوونێکی زۆرەوە پاڵم پێوە نا و لەسەر کورسییەکەی دامنایەوە، هەستم کرد کە کاتی هاتووە دوژمنەکەم لەناو بەرم، بەڵام دەمویست بزانێت کە لەسەر دەستی من ژیانی لە دەست داوە.

بەو شێوەیە پێم گوت:

- دەی بچۆرەوە سەر باسی **لۆلیتا** هێز، ئەوەی رفاندت.

بە دەم هاوارەوە گوتی:

- من نەمرفاند، تۆ هەڵەی، بەڵکوو لە دەست کەسێکی خراپەکار رزگارم کرد، بێنە پێناسە پۆلیسییەکەتم پیشان بدە بەر لەوەی تەقە لە قاچم بکەی، ئەی مەیموون، کوا ئاماژە پۆلیسییەکەت؟ من بەرپرس نیم لەو کچانەی کەسانی تر لاقەی کردوون، کارێکی ناڕەوایە من **لۆلیتا** لاقە بکەم، **لۆلیتا** لە گەشتێکدا لەگەڵم بوو، زۆر قورس و بێ مانا بوو، دواتر تۆ **لۆلیتات** بە دەست هێنایەوە، وا نییە؟ با بچین لە بارەکەدا شتێک بخۆینەوە.

لێرەدا بە ساردییەکەوە پێم گوت:

- دەتەوێت بە پێوە لە سێدارەت بدەم یان بە دانیشتنەوە؟

گوتی:

- راوەستە با بیر بکەمەوە، ئەمە پرسیارێکی ئاسان نییە، بەڕاست من هەڵەم کرد کە **لۆلیتام** بانگهێشت کرد بۆ ئەوەی بێت لەگەڵم، بڕوا بکە خۆشحاڵ نەبووم لەگەڵ کچەکەت، چونکە من پیاوێکی بە سۆزم، لەگەڵ ئەوەشدا پشوویەکی خۆشی لەگەڵم بەسەر برد و کەسانی لێهاتوو و باشیشی بینی.

لە ناکاو هێرشی کردە سەرم و دەمانچەکە کەوتە ژێر یەکێک لە کەرەستەکانی ماڵەکە، نارەحەتییەکی زۆرم نەبینی بۆ ئەوەی بیگەڕێنمەوە سەر کورسییەکەی و بەدەم هەناسەیەکی قورسەوە پرسیاری لێ کردم:

- ئەی ئێستا؟ چی بکەین؟

خۆم دانەواند، ئەو هیچ نەجووڵایەوە، زیاتر خۆم دانەواند بۆ ئەوەی دەمانچەکە هەڵبگرمەوە، گوتی:

- واز بێنە، یاری بە ژیان و مردن مەکە، من نووسەرێکی شانۆییم، چەندین دەقی تراژیدی و دراماتیکی و کۆمیدیم نووسیوە و دیالۆگی باش دەنووسمەوە و زۆربەی فیلمەکانی شانۆ دەزانم، با کێشەکە بە شێوەیەکی تر چارەسەر بکەین و بە چارەسەری دارایی رێک بکەوین.

من راکشابووم و هەوڵم دەدا لەبەر چاوم ون نەبێت، بینیم هەستایەوە و منیش هەستم کرد کە دەمانچەکە لەو لایەنە نییە کە من بۆی دەگەڕێم و دووبارە هێرشی کردەوە سەرم، وەکوو دوو منداڵ تێکهەڵکێشی یەک بووین و یەکدیمان دەخولاندەوە، ئەو لەژێر رۆبەکەوە هیچی لەبەر نەبوو، هەرجارێک کە دەکەوتە سەرم هەستم بە خنکان دەکرد، چونکە جەستەیەکی قەڵەوی هەبوو، بەڵام بەردەوام بووین لە خولاندنەوەی یەکدی وەکوو زۆرانبازەکانی نێو فیلمە ئەمەریکییەکان بووین.

له کۆتاییدا هێزی خۆمم کۆ کردەوە و توانیم کۆنترۆلی بکەمەوە و قوربانییەکەم لەسەر کورسییەکەی دانیشاندەوە و دەمانچەکەشم بەدەست هێنایەوە، بڕیارم دا پشکنینێکی دەمانچەکەم بکەم، نەبا شتێکی لێکەوتبێت، ویستم تەواو دڵنیابم بەر لەوەی بچمە قۆناغەکەی ترەوە، کاتێک دڵنیا بووم لە ئامادەییم، پێشنیارم کرد سزای لەسێدارەدانەکەی کە سەپاندوومە بەسەریدا خۆی بیخوێنێتەوە، وەرەقەیەکم پێی دا کە بە ئامێری چاپ، چاپکرابوو و تێیدا بەگوزارشتی شیعری سزاکەم نووسیبووەوە، چونکە دەمویست دادپەروەرییەکەم شیعرییانە بێت و تێیدا هاتبوو:

بە هۆی ئەوەی لاوازیی هەڵەکەرێت بۆ خۆت قۆزتەوە و کەڵکت لەوە وەرگرت کە پێگەی من هەستیارە و هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو، لە کاتێکدا بە نەرمترین زمان تکام دەکرد و باڵەکانم بڕدرابوون، خەونم بەوەوە دەبینی لە شارێکی شاخاویدا زەواج لەگەڵ لۆلیتای خۆشەویستمدا بکەم، هەر بە هۆی ئەوەوە پاکیی ئەویشت قۆستەوە و منیش و ئەویشت هەڵخەڵەتاند و ڕێگریت لەوە کرد کە ڕۆحم بلکێت بە ڕۆحییەوە، بە هۆی ئەوەی لە تەمەنێکی کەمدا بوو و تۆیش بەرەو خۆت کشاندت و لە سەرپەرشتیارەکەیت دزی و لە توندترین حاڵەتەکانی بێهوودەیی و نیگەرانیدا بەجێت هێشتم، بە هۆی ئەوەی ئەو بووکەشووشەیەت برد و یاریت پێلاکرد و لەسەر ڕێیەکدا فڕێت دا و بە هۆی ئەوەی ئازار و سەختییەکت بە مرۆڤێک بەخشی کە هیچ کەسێک ناتوانێت بەرگەی بگرێت، بە هۆی ئەوەوە کە دەستەکانت ئەو کارانەیان کرد، دەبێت تۆ بمریت.

ئەو حیکمەتە شاعیرانەیەی خوێندەوە و جاروبار دەیگوت شێوازێکی جوانە لە نووسیندا و وەرقەکەی پێ دامەوە و گوتی:

- بەڕاستی قەسیدەیەکی زۆر باش بوو، جوانترین قەسیدەیە کە خوێندوومەتەوە.

لێردا دووبارە بە جددی پرسیارم کردەوە، هیچ شتێکت هەیە بیڵێی بەرلەوەی بمری. لەو کاتانەدا دەمانچەکەمم ئامادە کردبوو بەوەی یەکڕاست گوللەیەکی لێوە دەربچێت، بۆیە سەیرێکی کرد و ئاهێکی بەرزی هەڵکێشا و گوتی:

- تا ئێرە بەسە، تۆ سەرخۆشی و منیش نەخۆشم، با ئەم مەسەلەیە دوا بخەین، چونکە پێویستم بە پشوو و ئارامییە پێش ئەوەی هاوڕێیەکانم بە دوامدا بێن و بۆ ڕاو بڕۆین. لە ڕاستیدا گاڵتاجاڕیی ئاراستەکردنی دەمانچەکەت بەرەو ڕووم خەریکە ناخۆش دەبێت، هەردووکمان پسپۆڕین لە جیهاندا، لە سێکس و پەخشانەشیعر، لە ئافراندنی ئەدەبی و کۆمەڵایەتیدا. ئەگەر لە سینگتدا قورساییەکت هەیە دژی من، ئەوە من ئامادەم پارەیەکی باشت پێ بدەم تاکوو قورساییەکەت لەسەر لابەم، بەڵکوو ئامادەم بە پێی دابونەریتی ئەسپەوانیی کۆن ڕکابەریت بکەم و سەرپشکت بکەم لەو چەکەی کە دەتەوێت ڕکابەرییەکەم لەگەڵدا بکەی، هەرچەندە ئەمڕۆ هزر و ڕەوانبێژیم لە جێی خۆیدا نییە، بەڵام هەمبەرتی ئازیزم! بە بیرم دێت تۆ سەرپەرشتیارێکی باش نەبووی بۆ **لۆلیتا**، لەلایەکی تریشەوە من زۆرم لە **لۆلیتا** نەکرد کە دوام بکەوێت، بەڵکوو خۆی وای لێ کردم بەرەوماڵێکی بەختەوەر و خۆشتری ببەم، مەبەستم ئەم ماڵەش نییە چونکە ئەم ماڵە کۆنە و وەکوو خانووی بێستانەکە نییە کە **لۆلیتا** و هاوڕێ ئازیزەکانمی تێدا بوو، ئەم خانووەش گەورەیە، پێشنیار دەکەم کە بێیتە ئێرە و بۆ خۆت لێرە بمێنیتەوە، چونکە بە نیازم ماوەیەکی دووروودرێژ لە بەریتانیا و فلۆرەنسە بمێنمەوە، دەتوانی بەبێ بەرانبەر

لەم ماڵەدا بی، بە مەرجێک چیتر ئەو دەمانچە ناشیرینەم ئاراستە نەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانم خانووەکە و سەگێکیشت پێ بدەم کە سێ توتکی هەیە، لێرەوە با بە شێوەیەکی لۆژیکی بیر بکەینەوە، ئەگەر گوللەیەکت لە دەست دەربچێت ئەوە بە شێوەیەکی مەترسیدار بریندارم دەکەیت و دەبێت بچمە نەخۆشخانە و بۆ ماوەیەک لەژێر چارەسەردا بم و تۆش لە گرتووخانەیەکدا کەڕوو لێت دەدات. من دڵنیات دەکەمەوە کە لەم ماڵەدا خۆشبەخت دەبیت، لەگەڵ ئەوەشدا داهاتی مافی بڵاوکردنەوە و نواندنی شانۆگەرییە نوێیەکەیشمت پێ دەدەم، وەکوو دەزانی بالانسێکی زۆریشم لە بانکدا هەیە، بەڵام من حەزم لە قەرزە، بۆیە هەر قەرز دەکەم و قەرز دەکەم... جگە لەوەش مانەوەت لەم ماڵەدا سوودی دیکەشی دەبێت، (مسز فیبریسا) ناوێکی سەیرە وا نییە؟ لە حەفتەیەکدا دووجار دێت، خاوەن کچ و کچەزایە، بیرم چوو پێت بڵێم، لە بەڕێوەبەری پۆلیسەوە زانیاریم لەسەریان دەست کەوتووە، لە رێیەوە دەتوانم بیانکەمە کۆیلەی خۆم، من نووسەری شانۆییم و نازناوی (مترلنگ ئەمەریکا)م هەیە... بەسە چیدی ئەو دەمانچەیە لابە، زەلیلت کردم، نازانم کارێکی باشم کردووە کە ئەو پێشنیارانەم بۆت کردووە یان نا؟ ئێستاش کەسێکی باش بە و ئەو دەمانچەیە لابە، راسپاردەی ئەوەشت دەکەم کە ویسکی و ڕووم تێکەڵ بکەی، هاوسەرە کۆچکردووەکەت بە ڕووکەشی دەناسم، ئەم ماڵەت پێ خۆش دەبێت، دەتوانی جلوبەرگەکەشم بەکار بێنی، ژمارەیەک کتێبی باشیشم هەیە و وێنەی سێکسیی وروووژێنەریشم هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کتێبی (میلانی دایس)م هەیە کە هەشسەد وێنەی قوزی تێدایە، ئەو نووسەرە کوچەرە وێنەی گرتوون، لەگەڵ ئەوەشدا وێنەی سێکسیی پرشنگدارم هەیە، دەی ئەو دەمانچەیە لابە،

ئەگەریش حەزت لەوەیە پرۆسەی لەسێدارەدان ببینی، ئەوە دەتوانم بۆت دابین بکەم، هەموو مرۆڤێک ئەوە نازانێت کە کورسیی کارەبایی بە زەرد بۆیە کراوە.

کە گەیشتە ئەو ئاستە لە گالتەجاڕی دەستم نا بە دەمانچەکەدا، دەنگی یەکەم گوللە هات، بەلام ئەمجارەیان، بەر شتێکی ڕەق کەوت، کورسییە بزۆکەکە بوو، دەستی بە ڕاکەڕاک کرد، گوللەیەکی ترم پێوە نا، بەر دەستی کەوت، دەستی کرد بە ڕاوەشاندنی دەستی و نالەی کرد، لە ناکاو وەکوو برووسکە بەرەو ژووری موسیقاکە ڕۆیشت، پێشتر بیرم نەبوو کلیلەکەی لەسەر لابەرم، هێرشم کردە سەری و کلیلەکەم لێی سەند، ناچار بوو، نەیدەزانی چی بکات، لەسەر پیانۆکە بە دەستی خوێناوییەوە دەستی کردە ژەنینی ئاوازێکی هیستیری، دەنگی هەناسەشی ژوورەکەی پڕ کردبوو، تاوێک وەستام، بە خۆشحالییەوە هەولم دا ئەو ئاوازە بەجۆشە لەبەر بکەم، لە ناکاو بینیم هەول دەدات باوەلێک بە قاچی بکاتەوە، بەم شێوەیە گوللەکەی دیکەم بەر لایەکی جەستەی کەوت، وەکوو پلنگی نێو سێرک خۆی هەلدا، بە مۆتەکەکانم دەچوو، وا خۆی بەرز کردەوە وەک بلێی دەیویست بە هەواوە خۆی بگرێت، دواتر لەسەر قاچەکانی وەستایەوە و وەکوو پیاوێکی ئاسایی ڕووی کردە هۆلەکە.

من لەم قەفەسی زیندانییەوە خۆم بینی، بە هەنگاوی فراوانەوە بۆ هۆلەکە دوای کەوتم. زۆر بەهێز و گورج بووم، وەکوو سەماکەری بالێ خۆمم هەلدەدا، نەک لەبەر ئەوەی فریای بکەوم، بەلکوو بۆ ئەوەی پێشی بکەوم، چونکە دەرکەی ئەو هۆلە دانەخرابوو، کە بینی پێشی کەوتم بە هەنگاوی لەرزۆکەوە بە پەیژەکەدا سەرکەوت، دوای نەکەوتم و ڕەوشەکەم گۆڕی. سێ یاخود چوار گوللەی دیکەم پێوە

نا، هەر گوللەیەک برینێکی بۆی دروست دەکرد و خوێنی بەر دەبوو، لە هەر جارێکدا کە گوللەیەکم پێوە دەنا، ڕووخساری بە شێوەیەکی پێکەنیناوی گرژ دەبووەوە، وەکوو لەیبوک لە دەربڕینی ئازارەکەی زیادڕەویی دەکرد، چاوی وێک دێنایەوە و ئاهێکی کزی دەردەبڕی، وەکوو بڵێی ختووکە درابێت.

لە هەر جارێک کە گوللەیەکی کوێرانە بەری دەکەوت، بە زمانێکی ڕێکوپێک و بە زاراوەیەکی بەریتانی دەیگوت:

- ئاهـ بەڕێزم زۆر ئازاری هەیە، بەسە تۆ ئازاری زۆرم دەدەی، تکات لێدەکەم ئەو کارە بێڕەحمانەیە رابگرە، ئاهـ ئازارەکە زۆر سەختە سەخت بەڕێزم، ئاهـ زۆر ئازاربەخشە توخوا بەسە گوللەی دیکەم پێوە مەنێ.

هێدی هێدی دەنگی لاواز دەبووەوە و گەیشتە لوتکەی پەیژەکە، جەستەی خوێناویی بوو، بەردەوام بوو لە ڕێکردن، گوللەکانی من وەکوو ئەوە وابوو کە دەرزیی وزە بن، لە ئێکسیری ژیان دەچوو، پێستی ئەو لە سەرەمەرگدا بووبووە هۆی قێزلێبوونەوە و بەزەییم.

دووبارە بە دوو دەستی ڕەش و خوێناوییەوە دەمانچەکەم پڕ کردەوە لە گوللە، هەستم کرد دەنگی شتێک لە دەنگیدا زیادی کرد، دوای کەوتم بۆ سەرەوە و کلیلەکان لە گیرفانمدا وەکوو پارەی ئاسن زرنگەیان دەهات، ئەویش لە ژوورێکەوە بۆ ژوورێکی تر دەڕۆیشت و دیمەنی خوێن، نێو ژوورەکانی ترسناکتر کردبوو، کەچی ئەو بەدوای پەنجەرەیەکی کراوەدا دەگەڕا بۆ ئەوەی هەڵبێت، کاتێک منی بینی، بە شێوەی تکا و پاڕانەوە سەری راوەشاند و دەیویست کە نەیکوژم، دەمانچەکەم ئاراستەی سەری کرد، بەرەو ژووری نووستنەکەی هەڵهات و خوێن لای گوێچکەی چەپییەوە فیچقەی کرد.

که بۆی چوومە ژوورەوە، بە کۆخینەوە هاواری کرد و گوتی:
- برۆ دەرەوە، برۆ دەرەوە لێرە.
ئەوەی بینیم دیمەنی مۆتەکە بوو، هەرچەندە خوێنی زۆری لێ دەڕۆیشت و برینی زۆری تێکەوتبوو، ئەو هەویرە خوێناوییەم بینی، بەرەو جێی نووستنەکەی خاو دەبووەوە، وەکوو کەسێک لە باشترین حاڵەتی تەندروستیدا بێت، لەسەر جێخەوەکەی ڕاکشا، کاتێک چەرچەفەکانی بە خۆیەوە ئاڵاند دووبارە دەمانچەکەم ئاراستەی کردەوە و گوللەبارانم کرد، دوای ئەوەی خۆی گرژ کردەوە، جەستەی بە ڕێکی ڕاکشا، کەفی ڕەنگاوڕەنگی خوێنین لە لێوییەوە دەرچوو و بۆ دواجار هەناسەیەکی دەرکرد و لە دەمییەوە گلۆپی خوێن دروست بوو، دواتر گلۆپەکانیش تەقینەوە و نەمان.
پێ دەچێت لەو کاتانەدا پێوەندیم بە واقیعەوە نەمابێت، بەڵام بۆ چرکەیەک یاخود دوو چرکە، لەوانەیە تووشی شێتی بووبێتم، من ئەمە بۆ ئەوە ناڵێم کە بەرگری لە خۆم بکەم، بەڵکوو دەمەوێت جەخت لە بەرپرسیارێتیی خۆم بکەمەوە لە هەموو دڵۆپەخوێنێک کە لە دەمییەوە دەرچوو.
لە چرکەساتی شێتیدا بە شێوەیەکی کاتی خەیاڵم ڕۆیشت، خۆمم بینی لەسەر جێی هاوسەرێتی و ئەویشم وەکوو شارلۆت بینی؛ نەخۆش لەسەر جێیەکەی، لە بری ئەوەی دەمانچەکەی ئاراستە بکەم تاکێکی نەعلەکەم بۆی هاوێشت، چونکە لەسەر دەمانچەکە دانیشتبووم، دواتر لەسەر کورسییەکە بە شێوەیەکی باشتر دانیشتم، ماوەی کاتیی شێتییەکەم بە تەماشاکردنی سەعاتەکەی دەستم بەڕێ کرد، بینیم شووشەکەی نەمابوو، بەڵام میلی سەعاتەکە بەردەوام بوو لە ڕێکردن، لە چرکەساتی ونبووندا بەخەبەر هاتم و بینیم پرۆسەی

لەسێدارەدانەکە سەعاتێک زیاتری خایاندووە، گرینگیم پێی نەدا، چونکە لە جووڵە کەوتبوو، نەمتوانی دەستی لێ بدەم تاکوو دڵنیا بم لەوەی کە مردووە یان نا، بەهەرحاڵ، پێ دەچوو مردبێت. یەک لەسەر چواری دەموچاوی تێک چووبوو، گۆشتی نێو ئێسقانەکانیشی پەرشوبڵاو بووبووەوە، دوو مێشیش لەسەر ئەو ئێسقانە وەستابوون، بڕوایان نەدەکرد، کە بەختەوەری ئەو ژەمەخواردنە خۆشەی بۆیان دابین کردووە. سەیری دەستی خۆمم کرد، بینیم لە حاڵی دەستە سوورەکانی ئەو باشتر نەبوو، لە گەرماوی تەنیشت ژوورەکەدا دەستەکانم شووشت و خۆم بە شێوەیەک ئامادە کرد کە بگونجێت بۆ چوونە دەرەوە. کاتێک بە پەیژەکەدا دەهاتمەوە خوارەوە، تووشی شۆک بووم، بۆم دەرکەوت ئەو گیزەگیزەی کە دەهاتە گوێم، دەنگی ڕادیۆی هۆڵەکە بوو، لەگەڵ دەنگی قسەکردنی چەند کەسێکدا تێکەڵ بووبوو.

چەند کەسێک لە هۆڵەکەدا بوون، وا دیار بوو تازە هاتبوون و شەرابیان تێ دەکرد. بینیم پیاوێکی قەڵەو و دوو کچی جوانی لینیە بە قژی ڕەش و ڕووخساری ماتەوە. کچەکان گومانی تێدا نەبوو خوشک بوون، لەسەر قەنەفەکە بە تەنیشت یەکەوە دانیشتبوون، دواتر پیاوێکی ڕووخسارگەشم بینی دوو پێک شەرابی لە بارەکەوە دەهێنا. لە دەروازەی هۆڵەکەدا وەستام و بە هەموویانم گوت:

- **کلێر کیلتی**م کوشت.

ڕووخسارگەشەکە گوتی:

- کارێکی باشت کرد.

بەردەوام بوو لەوەی پێکەکان بگەیەنێت و پێکی یەکەمی بە کچە گەورەکە دا و گوتی:

ـ دەبوایە ماوەیەکی زۆر پێش ئێستا کەسێک بیکوشتایە.

گوێم لە دەنگێک بوو لە پشت بارەکەوە، سەیرم کرد، کچێکی قژزەرد بوو... گوتی:

ـ ئەم بەڕێزە چی دەڵێت؟

ـ دەڵێت کێڵتیی کوشتووە.

لە تەنیشت قەوانەکەوە وەستابوو، وەکوو توانجێک بۆ قسەی پیاوەکە گوتی:

ـ کەواتە باشە، پێم وا بوو دەبێت ڕۆژێک ئێمە بیکوژین، بەهەرحال بڕوا ناکەم کوژرابێت، ئامادەش نیم لەوە زیاتر چاوەڕێی بکەم، ئەگەر دێت بۆ ڕاو پێویستە ئێستا دابەزێت.

پیاوە رووگەشەکە لەسەر کورسییەکەی گوتی:

ـ کەسێکتان پێکێک بەم پیاوە بدەن.

لە ناکاو دەنگی موسیقاکە وەستا و گوێم لە دەنگێک بوو لە سەرەوەی پەیژەکەوە، هەمووومان سەیری سەرەوەمان کرد، سەرچاوەی دەنگەکە کێڵتی بوو، توانیبووی لەسەر جێیەکەی بە خشکەخشک خۆی بگەیەنێتە سەر پەیژەکە، بە بەرچاومانەوە بە لارەلار هات و دواهەناسەی کێشا و گیانی لە دەست دا.

پیاوە ڕووگەشەکەش لە تەنیشتمەوە بوو، گوتی:

ـ کێڵتی پەلە بکە، پێم وایە هێشتا...

گوێم لە وشەکانی تری نەبوو، چونکە دەنگی موسیقاکە بەرز بووەوە، بەڵام بە خۆمم گوت:

ـ ئەمە کۆتاییی ئەو شانۆییەیە کە بۆ ژیانی کێڵتی دامنابوو

بەم شێوەیە لە ماڵەکەوە دەرچووم و بە دڵێکی قورسەوە بەرەو ئۆتۆمبێلەکەم بەڕێ کەوتم. بینیم ئۆتۆمبێلێک لە پێشی وەستاوە و ئۆتۆمبێلێکیش لە پشتەوەی. نارەحەتیم کێشا لە دەرکردنی، تاکوو بە ڕێیەکی بەریندا پێی بڕۆم.

## ٣٣

ئەوەی لە چیرۆکەکە ماوەتەوە، جگە لە سێبەرێکی کز هیچی تری تێدا نییە. لە ماڵەکەوە دەرچووم و بەرەو **بارکینگتۆن** خلۆر بوومەوە. لەوێ چاکەتەکەم لە ژوورەکەم بەجێ هێشت و دەمانچەکەیشم لە گەرماوەکە.

ماڵی **کێلتی** ئەو ماڵە نەبوو کە ئارەزووی ژیانی تێدا بکەم. بەم شێوەیە قسەم بۆ خۆم کرد و ئارەزووی ئەوەم کرد کە لە بیری بکەم، چونکە زانیم ڕکابەرەکەم مرد. هەستکردن بە پشووی ویژدان بووبووە هۆی ئەوەی بارێکی قورسم لەسەر مێشک لا بچێت، چونکە ئەگەر نەمردبایە دەبوایە بۆ ماوەی چەند مانگێک من بیرم لە قۆناغەکانی چاکبوونەوەی بکردبایە و دواتر چاک بوایە و سەردانی گرتووخانەکەی دەکردم و هەستێکی وای پێ دەبەخشیم کە وەکوو فریشتەیەک بێتە بەر چاوم.

ڕێیەکی چۆڵ و فراوانم گرتە بەر، بیرم لەوە کردەوە کە لە هەموو یاساوڕێساکانی مرۆڤایەتی دوور بکەومەوە، بە پێچەوانەی ڕێیەکەوە و دژەساید دەڕۆیشتم. ئەزموونی ئەو هەستەم کرد، بۆم دەرکەوت کە هەستێکی زۆر بەچێژە.

دواتر لەسەرخۆ و بە نەرمی ڕێم دەکرد و بە هەمان شێوە بە پێچەوانەی یاساوە دەڕۆیشتم. ئۆتۆمبێلەکان دەنگی هۆڕنیان بەرز دەکردەوە و ئەوانەی لە بەردەمم بوون، جنێویان دەدا، هەستم کرد بە شوێنێکی ئاوەدان گەیشتم، بەردەوام بووم لە سەرپێچی، لەگەڵ گڵۆپی سووریشدا من هەر ڕێم کرد، هەرجارە و قوومێکم لە شەرابەکەم دەدا، ئەو شەرابەی کە لە سەردەمی منداڵیمدا لێم قەدەغە کرابوو.
بەڵام بەردەوامیم لە سەرپێچی دۆخەکەی ئاڵۆز کرد، دوو ئۆتۆمبێلم بینی بە تەنیشت یەکەوە ڕێگرییان لێ کردم، ناچار بووم بوەستم، بەڵام توانیم خۆم قورتار بکەم و دواتر گەڕامەوە سەر ڕێی دەشتانی، دوای دوو یاخود سێ تەکان ناچار بووم بوەستم، چونکە خۆمم بە کۆمەڵێک مانگادا کێشا، هەستم بە چەند دەستێک کرد ڕایاندەکێشام، حەزم دەکرد خۆم ڕادەست بکەم، بەبێ هیچ بەرگریکردنێک و بەبێ هاوکاریی هیچ دەستێک.
کاتێک دەیانگواستمەوە بەرەو ئەمبولانسەکە، جومگەکانم خاو کردەوە، لەو کاتانەدا هەستم بە دەنگێک کرد، ئەو دەنگە هزرمی گەڕاندەوە بۆ ئەو سەردەمانەی کە ئۆتۆمبێلم لێ دەخوڕی و بە دوای **لۆلیتادا** دەگەڕام و.هەستم بە تەنگی دەکرد، زۆر جار لای ڕێیەکەم دەگرت بۆ ئەوەی هەوایەکی پاک هەڵبمژم، کەچی دەمبینی لە لێواری شوێنێکی زۆر قووڵ و سەختدا وەستاوم، هەستی ئەوەم بۆ دەهات بە ئۆتۆمبێلەکەمەوە خۆم فڕێ بدەمە باوەشی ئەو شێوەوە.
ئەو دەنگەی گوێم لێی بوو تەنیا دەنگی چەند منداڵێکی هەرزەکار بوو؛ یارییان دەکرد. جگە لەوە هیچی دیکە نەبوو.

ئەمە تەواوی چیرۆکەکەم بوو، دووبارە کە خوێندمەوە، هەستم بە تالی کرد، بۆنی خوێنم تێدا کرد و دوو مێشی سەوزیشم بینی- لەسەر مێشکی کێلتیدا.

لە گێڕانەوەی چیرۆکەکەم، هەوڵی زۆرم دا ئەو شتانە بشارمەوە کە ئازاری خەڵک دەدەن، چەندین ناوی خوازراوم تاقی کردەوە، بەرلەوەی کە ناوی **هەمبەرت هەمبەرت** تاقی بکەمەوە. کاتێک بەر لە پەنجاوشەش ڕۆژ دەستم بە نووسینەوەی **لۆلیتا** کرد، لە چوارچێوەی ترپەی ویژدان و کەشی گۆشەگری تەنیایی بیرم لە بەکارهێنانی ئەم چیرۆکە کرد لە کاتی دادگەییکردنەکەمدا، بەڵام بۆ ئەوەم نەبوو کە سەری خۆم ڕزگار بکەم، بەڵکوو بێگومان بۆ ئەوەی ڕۆحم ڕزگار بکەم.

هەرچەندە لە نیوەی چیرۆکەکەدا هەستم کرد کە نەمتوانیوە وێنەیەک لە بارەی ژیانی **لۆلیتا**وە پێشکەش بکەم.

ئەوەش لەبەر چەند هۆکارێک لەوانەیە زیاتر ڕوون بن لە واقیعدا. سزای لەسێدارەدانم بە شێوەیەکی بیرمەندانە ڕەت دەکەمەوە، گومانی تێدا نییە ئەو دادوەری دۆسێیەکەم یەکلایی دەکاتەوە و بەشداریم دەکات، ئەگەر خۆمم دادگەیی بکردایە، هەمبەرت هەمبەرتم بە ٣٥ ساڵ زیندانی سزا دەدا، بە تاوانی لاقەکردن و بێبەرپرسیارێتییشم لەسەر تۆمەتەکانی ترم لا دەبرد.

ئەگەر **لۆلیتا** وا خولقێندرابوو، کە لە من زیاتر بژیت، تەنانەت ئەگەر لە سێدارەش نەدرێم، ئەوا ڕێوشوێنە دادوەرییەکانم گرتە بەر، بۆ ئەوەی ئەم بیرەوەرییانە- تا ئەوکاتەی **لۆلیتا** لە ژیاندایە- بڵاو نەکرێنەوە. بەم شێوەیە، خوێنەر کاتێک ئەم چیرۆکە دەخوێنێتەوە، ئەوا هەردووکمان "**لۆلیتا** و من" لە جیهانی مردوواندایین.